کوردستان ..................٢٧٠٧

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە: (١١٠)

## ناسنامەی کتێب

---

ناوی کتێب: فەرهەنگی شارا

بابەت: فەرهەنگ

نوسینی: عەبدوڵڵا جەبار

بڵاوگە: سلێمانی ـ خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

رازێنەر: سنە ـ ناسێح رەحمانی ٠٩١٨٣٧٣٨٠٢٨

رووبەرگ: ناسێح رەحمانی

ئەژمار: ٢٠٠٠ دانە

ساڵ و جاری چاپ: ٢٧٠٧ - یەکەم

●●●

## زیندان ... خەڵوەت

لەگەڵ دانانی ئەم فەرهەنگەدا, گەلێ سەیروسەمەرە بەسەرمداهاتن. یەکێك لەچیرۆك و بەسەرهاتانەش ئەوەبوو کەمن زۆری هەرمزۆری تەمەنم لەوکاتەوە کەدەستم بەئامادەکردنی فەرهەنگەکە کرد, تاکو کۆتایم بەکارمکەم هێنا, لەماڵەوە بەسەردەبرد, بەدەگمەن نەبێ نەدەچومە دەرەوە. تەنانەت زیادەڕەوی ناکەم ئەگەر بلێم جاری واهەبووە بەدرێژایی وەرزێکی تەواو نەهاتومەتە دەرەوە, بەتایبەت نەمدەتوانی بچمە بازاڕ..ئەم بارودۆخە بەسەرهات و نوکتەی خۆشی لەژیانمدا دروستکرد. یەکێك لەوبەسەرهاتانەی کەزۆر جار دووبارە دەبویەوە, ئەوەبوو هەرجارێ ئەهاتمە بازاڕ,برادەرانی ئاسایشی سیدصادق, زۆر بەسەرسامیەوە, داوای ناسنامەیان دەکرد, ئەیان پرسی ئەگەر دانیشتوی ئێرەی بۆچی لەبازاڕنات بینین؟

گۆشەگیری لە پێناوی ئامادەکردنی ئەم فەرهەنگەدا, گەشتە ڕادەیەك کاریگەری لەسەر پێوەندیە کۆمەلایەتیەکانیشم دروستکرد, لەماوەی ئەم چەندساڵەی ڕابردودا زۆر بەدەگمەن توانیومە ئەرکەکۆمەلایەتیەکانم لەگەڵ نزیکترین وئازیزترین هاوڕێ وخزم وکەس وکاردا ڕاپەڕێنم...بۆیە لێرەوە هەق ئەدەم بەوبرادەرانەی پۆلیس وئاسایشی (سیدصادق) کەهەرکات ئەچومەبازاڕ, دەست بەجێ داوای ناسنامەیان ئەکردو گومانی خۆیان دەرئەبڕی لەوەی خەڵکی شارمکەیان بم,ناهەقیان ناگرم چونکە ساڵەکانی سەرەتای نوسینی ئەم فەرهەنگە (سیدصادق) شارۆچکەیەکی بچوکتربوو لەئێستا وخەڵکەکەی بەزۆری یەکتریان دەناسی,بۆیە پەیدابوونی چروچاوی منیان لەبازاڕدا پێ نامۆبوو؟ چروچاوێ کەهەر لەڕوخساری زیندانیەکان دەچوو...لەڕاستیدا هەربەیەکەم سەیرکردن، بەرانبەرەکانم هەستیان دەکرد زیندانی بم! ئەوان ئەوحاڵەتەیان پێ سەیربوو, لای خۆیشم خەڵوەتێك بوو بۆدروستکردنی بوارێك بۆگەیاندنی دوو زمان و دووکەلتوری جیاواز. خەڵوەتێك مەگەر هەرئەوانە تاموچێژەکەی بزانن کەتیایدا ژیاون...ڕەنگە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانم لەماوەی ئامادەکردن وڕێکخستنی ئەم فەرهەنگەدا زۆرتری بوێت وەك لەوەی تەنها لەپێشەکیەکی بەرتەسکی ئاوهادا بتوانم باسیان بکەم.بەلام ڕوداوێك کەڕۆژانە دووبارە دەبویەوە وزۆرجاریش خەریك بوو دەبویە ناکۆکی لەنێوانی من و هاوسەرەکەمدا, ئەوەبوو هەموو ڕۆژێ سەرلەبەیانی کەدەچومە

ژورەتاییەتیەکەم، درگاکەم کلۆم ئەدا، پێم خۆش نەبوو کەسێك بێت وکاتم بگرێت، یان بەقسەوباسی لابەلایی بەرنامەی ڕۆژانەم پێ بگۆڕێت..هاوسەرەکەیشم هەرچەندە زۆر هاوکاری دەکردم کەچی هەندێ جاریش بێتاقەت ئەبوو، گەلێ جار ئەیگوت: تۆلەهەمان کاتدا لەماڵەوەیت ولەماڵەوەش نیت،ئێمە مەگەر شەوانە یان لەژەمەکاندا بت بینین!!.
هەقی خۆی بوو ئەو گلەییە بکات، تەنانەت جارێکیان لەسەر درگای ژوورەکەی نوسیبوو (الدخول ممنوع) بەوەدا تێگەیشتم کەبەتەواوی ژیانی من بەوشێوەیە ئەوی هەراسان کردووە وگەشتۆتە تینی.
ئاخەر ئەم فەرهەنگە بوارێکی بۆ ژیانی هاوسەرایەتی من وئەو نەهێشتبویەوە!.ئێستاش کەخەریکی نوسینی ئەم چەند دێڕەم بۆپێشەکی ئەم فەرهەنگە، لەوگرفتە قوتار نەبووم وهەست دەکەم زیاتر حەزم لەتەنهایی وگۆشەگیریە. ئێستاش هەرناچارم بۆنوسینی لێکۆڵینەوە وبابەتە ڕۆژنامەوانیەکان درگاکەم دابخەم(نازانم تاکو کەی ماڵەوەمان ئەم حاڵەتەی من بەئاسایی وەردەگرن ودەتوانن لەگەڵیدا بژین؟ چ وەختێ نزای منداڵە بچوکەکەمان گیرا دەبێت کەداوای دەکرد بەڵکو جارێك شت نەنوسم و یاری منداڵانە لەگەڵ ئەودا بکەم!!. لێرەوە داوای لێبوردن لەوان وهەموونەوکەسانەش دەکەم کەنەمتوانی وەك پێویست مامەڵەی خزمایەتی و دۆستایەتیان لەگەڵدا بکەم...

●●●

## شێلەیی ترلەجاران...

لەکۆتاییەکانی ساڵی (٢٠٠٢)دا، پەتەکە لەسەر ڕژێمی سەدام توند کرایەوە، فشارەکان تادەهات بەرەو قورستر دەچون.ئاماژەکان سەرجەمیان پەیامبەخشی ئەوە بوون کەئەمریکیەکان عەزمیان جەزمکردوە بۆ لەناوبردنی سەدام حسێن وڕژێمە خوێناویەکەی...بەندەش بەحوکمی ئەوەی لەبواری ڕۆژنامەنوسیدا ئەوەندەی توانام بەسەریدا شکابێت خۆم سەرقاڵی شیکردنەوە ولێکۆڵینەوەی کاروبارەسیاسیەکان کردووە، پێم باش بوو لەگەڵ ڕوداوە گەرم وگوڕەکاندابم وبیرۆکەی ئەوەم لاگەڵاڵە بوو کەلەکۆی ڕوداوەکان شتێك دروست بکەم، زیاتر مەبەستم ئەوەبوو وەك دیکۆمێنت ڕوداوەکان لەلای خۆم بپارێزم، بۆئەوەی ئەگەر بتوانم لەداهاتودا کەڵکیان لێ وەربگرم، دواجار ڕام هاتە سەر ئەوەی کەئەوەندەی دەستم پێ دەگات وتوانام بەسەریدا دەشکێ لەڕێی

# چیرۆکی ئەم فەرهەنگە

## چۆن دەستم پێکرد؛

ئەوکات هێشتا بەم بەربڵاویەی ئێستا بڵاوکراوە و چاپخانەکان لەبەردەستدا نەبوون, وڵات لەژێرباری قورسی دوو گەمارۆی ئابوریدا دەیناڵاندو لەتاو خەمی پەیداکردنی ژەمێ خواردن, کەسانێکی زۆر کەم توانیبویان قوربانی بەقووت وبژێوی رۆژانەیان بدەن وخۆیان سەرقاڵ بکەن بەبواری رۆشنبیری ونوسینەوە. ئاخەر قەدەری ئەهلی قەڵەم لەوڵاتی ئێمەدا, تاڵە ژیاندان پەژمودەیی وهەژاری ونەداریە, بەڵام کەدەمرن وسەرزەمین بۆ بیکارەکانی دونیای مەعریفە بەجێ دێڵن, ئەوجا هەریەکەو لەشاری خۆیدا پەیکەرێکی بۆدەتاشن ولەبەر قرچەی گەرمای هاوین وکرێوەی سەرماوسۆڵەی زستاندا رەق وتەق ڕایان دەوەستێنن, بەکورتی دەبێت هەرکەس لەم وڵاتەدا خۆی تەرخانکرد بۆ کارکردن لەبواری رۆشنبیریدا. زۆر باش ئەوچارەنوسەی لەبەرچاوبێت, چارەنوسی ژیانی بێ نان و مردنیکیش کەتاکو پەیکەرەکەی وردوخاش دەبێت , لەبەرقرچەی گەرماو کرێوەی سەرمادا رەق وتەق وچەق ڕابوەستێت...لەم وڵاتەدا ئەگەرچی بابای رۆشنبیر خۆی وەکو تەڕاح وقورمساخێ تەماشا دەکرێ, کاڵافیکریەکەیشی هیچی لەخۆی زیاترنیە. ئەو هەرچەند شەونخونی و بگرەوبەردە بۆنوسینی بەرهەمێك دەکات, کەچی ئەگەرچی بتوانێ چواردەهەزار بەیتی شانامەیەکیش بنوسێت, کەسێك ڕاناچەنێت، بەیتی ئەك بەلیرەیەك, بەڵکو هەموو پەڕاوەکەیشی بەپولێکی سور لێ بکرێت...لێرەشدا بەناچاری پەنادەباتە بەر قەرزو قۆڵەو فرۆشتنی کەلوپەلەکانی ناوماڵ بۆ ئەوەی بتوانێ دەست نوسەکەی لەمەرگی حەتمی رزگاربکات...مەدهۆشی شاعیر لەداشۆرینی قانعی شاعیردا دەڵێت؛

گڕی تێ بەردەی بۆسۆی لێ نایە

زۆر پەیشمانم خۆزگە نەمدیایە

ئەدی بەویژدانتان! ئەگەر کەسێك هێندە ڕوت و ڕەجاڵ بێت ئاوری پێوە بنێیت لەبری بۆسۆی سوتانی جلەکانی, بۆنی چزوهوڕی گۆشتی برژاوی لەشی بکەیت, قەت چاوەڕوان دەکەین بتوانێ, بەرهەمەکەی خۆی چاپ وبڵاو بکاتەوە؟...

بەهەرحاڵ ئەوە کورتەیەك بوو لەوەسفی ئەو بارودۆخەی کەنوسەرو ڕۆشنبیری کورد تێی دەکەوێت وتیایدا دەژی کاتێ بڕیار ئەدات لەبواری مەعریفەو ڕۆشنبیریدا کاربکات... کەچی هێشتر کەسانێك هەبوون گۆڕەپانەکەیان چۆڵ نەکردوو هەرکەس بەگوێرەی تواناو تاقەتی خۆی خزمەتی ڕۆشنبیری کوردی کردووە...

بەندەش, یەکێك بووم لەوکەسانەی کەهەمیشە پێم وابووە, خزمەتێ کەتەمەن درێژبێت وزۆرترین کەسیش سودی لێ وەربگرێت بواری نوسین و خزمەتە بەفەرهەنگی نەتەوەیی.بۆیە ئەوەندەی لەتوانای کەسێکی کزۆڵەی وەکو مندا هەبووە, درێغیم نەکردووە وبەتەمای ئەوەش نیم بۆ لەمەودوا درێغی بکەم..بەڵام لەو خۆماندوکردنەدا بەچ ئاستێ گەشتوم وئایا توانیومە کارەکانم بگەیەنمە ئاستی ئەوەی ناویان بنرێت (خزمەت بەکەلتوری کوردی)؟ نازانم, دەکرێ کەسانی دیکە بەبەڵێ یان بەنەخێر وەڵامی ئەو جۆرە دڵەڕاوکێ و پرسیارانە بدەنەوە. ئەوەندە هەیە من کاتێ کارم کردووە ئەو پەندەکوردیەم لەبەرچاو گرتوە کەدەڵێ (مشکێ لەگوێ درەوانیکیشدابێت هەرباشە).یانی ئەگەر شارای ڕۆشنبیری کوردی ڕۆژبەڕۆژ مەلۆی زیاتری بخرێتە سەرو پیاوان وژنانی خاوەن بیرو بەزمینی مەزن مەزن کار بۆگەورەترکردنی شاراکە بکەن ودواتر بیکەنە جوانترین خەرمان, ئەوا من ئەوەم پێ قبوڵە کەلەو بگرەوبەردەیەدا بەمشکێکی بچکۆلانە لەقەڵەم بدرێم, بەڵام ئەو مشکەی کەلەگوێ درەوانەکەوە دەڕوات وجاربەجارێ گوڵە گەنمێ کێش دەکات بۆسەرشاراکە!!.

●●●

## چاپەمەنی برایان...

لەناوەڕاستی ساڵی (١٩٩٩) دا,سەرقاڵی هەندێ پرۆژەی نوسین و وەرگێڕان بووم, لەڕۆژنامەو گۆڤارەکانیشدا پەیتا پەیتا نوسین ولێکۆڵینەوەم بڵاودەکردەوە. لەلایەکی دیکەشەوە هەندێ کتێبی بەنرخم لەبەردەستدا بوو تاکو بیکەمە کوردی ولەلایەن ئەو برابەڕێزانەوە چاپ بکرێت کەبۆخۆیان شێوە دەزگایەکی چاپکردنیان دروستکردبوو بەناوی (برایان)...ئێوارەیەك هاتن بۆلام وهەندێ قسەوباسمان کرد, لەویاس وخواسەوە بیرۆکەی ئامادەکردنی فەرهەنگێکی (عەرەبی-کوردی) مان گەڵاڵە کرد. پەوان, شانیەێن دایەبەر دەستەبەرکردنی سەرچاوە پێویستەکانی دانانی فەرهەنگێکی تۆکمەو تەواو.

بەندەش زوو بەزوو دەستم کردە جێبەجێ کردنی پرۆژەکە...ڕۆژان دەهاتن وتێ دەپەڕین..من هەرسەرقاڵی نوسینی فەرهەنگەکەم بووم.

کەچەشتنی تامی سەرکەوتن لەم کارمدا تادێ نیزیکتر دەبێتەوە, مژدەی ئەوەی ئەدا کەلەودیوی ملەکەوە, زەنویرێکی دڵرفێن هەیە, دەکرێ لەنێو مێر گوزاری ئەوێدا پشتێنێ لێ بکەمەوە وهەناسەی ئۆخەی هەڵمژم...

هەندێ جار لەناوقەدی بەرەوژورکەکاندا هەناسەم لەبەر دەبڕا, بەلام کەتەماشای خواری ڕێگەکەم دەکرد تێ دەگەشتم بەشێکی زۆری کەژەکەم بڕیوە, بۆیە بڕیارم ئەدا هەرئەبێ بگەمە لوتکەی چیاکەو لەوێوە شۆڕبمەوە بەرەو ئەو زەویە کەسك وتەڕو پاراوەی کە پێی دەڵێن دڵنیابوون لەڕاستی و دروستی کار...بەشی یەکەمی کارمکەم تەواو کرد, وام پێ چاك بوو بەرلەوەی چاپ بکرێت وبڵاو بکرێتەوە, چەند بەڕێزێکی شارەزاوکارامە, بەوردی تەماشای بکەن و هەڵی بسەنگێنن.

لەوبارەیەوە لەگەڵ هاوڕێی ڕۆژنامەنوس (بەڕێزکاك سلام عبدالکریم) گفتوگۆم کرد, هەردوکمان پێمان باش بوو, داوا لەبەڕێز کاك (د.شێخ صباح بەرزنجی) مامۆستای زانکۆی سلێمانی بکەین, تاکو بەچاوی ڕەخنەگرانەوە سەیرێکی فەرهەنگەکە بکات. دیارە لەبریتی من کاك سلام عبدالکریم چوبویە خزمەتی (کاك د.صباح) وئەویش زۆر بەسوپاسەوە داواکەی ڕەت نەکردینەوە وتەماشای فەرهەنگەکەی کردبوو.

ماوەیەك تێ پەڕی ئەوجا (کاك سلام عبدالکریم) فەرهەنگەکەی هێنایەوە و, ئەنجامی هەڵسەنگاندنەکەیشی تێدابوو, بینیم ئیمزای مامۆستایەکی بەڕێزی بەسەرەوەیە بەناوی (مامۆستا بێستون) کەپرۆفیسۆری یاریدەرەلە زانکۆی سلێمانی...لێرەوە زۆر سوپاسی هەردوو مامۆستایانی بەڕێز (د.صباح بەرزنجی ومامۆستا بێستون پرۆفیسۆری یاریدەر لەزانکۆی سلێمانی )دەکەم, کە زۆر بەلێبڕاویەوە داواکەیان جێ بەجێکردم وهیمەتی ئەو بەڕێزانە وهەڵسەنگاندنی باشیان بۆ پرۆژەکەم وگەواهی دانیان لەسەر سەرکەوتویی کارەکە, متمانەیەکی زۆر مەزنی پێ بەخشیم.

بەڕێز (د.صباح بەرزنجی) وەك خۆی لە(بنکەی گۆڤاری ڕوناکبیر) بۆی باسکردم, کاتێ فەرهەنگەکەی دیبوو, لەلای خۆیەوە بڕیاریدابوو بیخاتە بەرچاوی بەڕێز (مامۆستا بێستون) یش...لەگەڵ ئەوەشدا کەتائێستا بەخزمەتی (بەڕێزمامۆستا بێستون )نەگەشتوم, بەلام ئەوپەڕی بەختەوەرم وبەشانازیەوە دەقی گەواهی دانەکەی لەپاشکۆی ئەم پێشەکیەدا بەدەست خەتی خۆی دادەنێمەوە.وەك پاڵپشتی یەکی زانستی گرنگ بۆ ئەم فەرهەنگە.

●●●

## بۆهەڵە بڕی چیم کردووه؟...

هەڵەی چاپ، یەکێکە لەو ژمەرە کوشندانەی کەدەچێتە نێو جەستەی پەرتوکەکەوە وهەموو بەهاکانی تێدا دەکوژێت، لەکتێبەکوردیەکاندا هەڵەی چاپ نەخۆشیەکی زۆر بەر فراوانەو بەدەگمەن پەڕاوێ دەبینرێ هەڵەی چاپی تێدا نەبێت.بۆیە لەیەکەم ساتەکانی تایپ کردنەوە هەوڵم داوە، رێگەبگرم لەوەی هەڵەی چاپی تیایدا روبدات، چونکە ئەگەر لەهەر کتێبێکی تردا هەڵەی چاپ زۆر کوشندە نەبێت، ئەوا لەفەرهەنگدا وانیە، لەبەر ئەوەی فەرهەنگ پەڕاوێکی ( فێرکاریە ) ئەوا هەرهەڵەیەکی چاپ دەبێتە هۆی ئەوەی کەسی بەکار هێنەر دووچاری هەڵەیەکی گەورە لەفێربوندا ببێت.

بەدەرك کردن بەم ڕاستیە، کۆمەڵێ رێ وشوێنم گرتەبەر بۆ ئەوەی هەڵەی چاپ رونەدا بەجۆرێ دەتوانم بڵێم فەرهەنگەکە بەچەند خول وناستێکی جیاجیای هەڵەبڕیدا گوزەری کردووە و زیاترلە( ٦ کەس )ی خوێندەوار بەشداری بە پەرۆشانەیان کردووە لەهەڵەبڕیدا.

هیوادارم بەهەمووومان توانیبێتمان بەکەمترین هەڵەی چاپەوە فەرهەنگەکەمان بەچاپ گەیاندبێ ..لێرەوە بە پێویستی دەزانم بەخوێنەری بەرێز بڵێم: هەر هەڵەیەکی چاپت بەرچاوکەوت، تاوانی لەئەستۆی مندایە، چونکە ئەو هاوکارە بەرێزانەم لەگەڵ ئەوەشدا کەزۆر ماندوو دەبوون، بەڵام دواجار خۆم بەسەر هەموو ئەو لاپەڕانەدا دەچومەوە کەئەوان هەڵەبڕییان کردبوو، بەحوکمی ئەوەی هەڵەکانی رونوسی کۆمپیوتەر لەلایەن خۆمەوە ڕاست کراونەتەوە...دەمەوێت بڵێم: هەوڵماندوە توانا و سەلیقەی ( ٦کەس ) بۆ هەڵەگیری بەکار بێنین.بۆیە ئەگەر هەڵەتان بینی داوای لێبوردن دەکەین...بائەوەش بزانین کەئەمە چاپی یەکەمە و بە پشتیوانی خودا فەرهەنگەکەتان لەچاپی ئایندەداتۆکمەتر وبێ کەمو کوڕی تردەبێت.

●●●

## شێوازی سود وەرگرتن لەم فەرهەنگە

لەبەرئەوەی ئەم فەرهەنگە لەسەر بنەمای ( ئەبجەدی ) پیتەکان دارێژراوە، پێویست ناکات لەوەرگرتنی مانای وشەیەکدا بگەرێیتەوە بۆسەر چاوگ و رەگی وشەکە،وەك لە فەرهەنگەکانی تردا دەبینرێت. بەڵکو ئەم شێوە دارشتنە (ئەبجەدیی) ەی کەئێمە پێرەومان کردوە یەکێك لەکەڵکە هەرەئاشکراکانی ئەوەیە کەهەموو کەسێکی فێرخواز

کەناڵەجیهانیەکانەوە ڕوداوەکان وەرگرم ولەسەر کاسێتی ( vhs ) تۆماریان بکەم ولەلای خۆشمەوە پرۆژەکەم بە ( کتێبخانەی وێنەیی ) ناوزەد کرد.

ئەوە بوو لەمانگی (٢٠٠٢/٩)ەوە، کەوەك چاودێرێکی سیاسی ئەو بڕوایەم بۆ دروست بوو کەبەڕاستی ئەمریکیەکان دەیانەوێت لەعێراق بدەن ، ژمارەیەك کاسێتی ڤیدیۆیم پەیداکرد ویەکەم وتاری سەرۆك بۆشم تۆمار کرد کەلەمانگی(٢٠٠٢/٩)دا لەبەردەم کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتوەکاندا پێشکەشی کرد، ئەو وتارە بەهەموو پێوەرەکان سەرەتای فەرمی جەنگی ئەمریکا بوو دژبە ڕژێمەکەی سەدام.. ئیتر لەو بەروارەوە، هەر ڕوداوێك بەلامەوە بایەخدار بوو، لای خۆم بەزنجیرەو بەگوێرەی ڕۆژەکان تۆمارم دەکرد، لەو ڕۆژانەی جەنگەکانی عێراقەوە، تاکو لەکۆتاییدا دیمەنە دوو خولەکیەکەی لەسێدارەدانی دیکتاتۆریشم خستە سەریان، بەوەش کۆتاییم بەپرۆژەی (کتێبخانە وێنەییە)کەم هێنا.

لەدوای ڕوخانی سەدامیش، بەهۆی ئەوەی وەك فەرمانبەر لەکتێبخانەی گشتی هەڵەبجەی شەهید دامەزرام، ڕۆژانە دەبوا لەسیدصادقەوە بچمە هەڵەبجە. ئەو هەموو ڕۆشتن وهاتنەوەیە کاتیان زۆر بەفیڕۆداوم، تەنانەت خەڵوەتە مەعریفیەکەشیان لێ تێکدام. ئەوەندەی پێ نەچو لە( ٢٠٠٤/٨/٣١ ) لەسیدصادقیش دوو ژووری بچوك بەناوی کتێبخانەی گشتیەوە کرایەوە.

خۆشی بەحاڵم! دەست بەجێ ڕاژەم گواستەوە وهاتوچوەکەشم کەم بویەوە وگەڕامەوە ئامێزە جوانەکەی خەڵوەت. ئەم خۆشحاڵیەم درێژەی نەکێشا، چونکە لەبەڕێوەبەرێتی کتێبخانەی گشتی سلێمانیەوە ئەرکی بەڕێوەبردنی کتێبخانەی گشتی سیدصادقم پێ سپێردرا، دووبارە سەرقاڵ بومەوە وئیش وکارە ئیداریەکان ڕێگر بوون لەوەی بتوانم وەك جاران لەخەڵوەتدا بمێنمەوە...

هەموو ئەو هۆکارانە وایان کرد کەمێك شێنەیی تر لەجاران کارلەسەر ئەم فەرهەنگە بکەم، بەڵام نەبوونە هۆی ئەوەی بەتەواوەتی دابڕێن لەخەڵوەتی ئامادەکردنی ئەم فەرهەنگە.

●●●

## سەرێشەی تایپ وچاپخانە....

لەگەڵ چاپ وتایپدا دەردەدڵی زۆرم لەلایە، لەو سۆنگەیەوە کەهەرکات پیتێکم تەواو دەکرد، ئەمناردەوە بۆ برادەرانی چاپخانە بۆ ئەوەی بەزوویی تایپ بکرێت و، قۆناغی

یەکەم دەستنوسەکان لەفەوتان دەربازبکەم. وەلێ ئەوەی من لێی دەترسام لای تایپیستەکان یەخەی گرتم...

ئەوان (١٠) پیتی دەست خەت و چاپکراویان ون کرد!! بەکورتی ئەوی من ڕستم کردیانەوە بەخوری. من چاوەڕوانی خەنەبەندانی چاپکردن وبڵاوکردنەوەی فەرهەنگەکەم بووم، کەچی هەواڵی مەرگی ناوەختی فەرهەنگەکەم پێدرا. هەواڵێك کەوەك ئەرد هەژێن تەواوی قەوارەی ڕۆح وجەستەمی داگیر کردو دوچاری شۆکی کردم.ئەبێ جگەلەخۆم کێ باجی ئەو هەواڵە بدات؟کێ قەرەبوی پیتە بزربوەکان بکاتەوە؟...

هەرلەو ماوەیەدا برادەرانی چاپخانە لێك جیابونەوە وفەرهەنگەکەش بویە ناوکۆیی هەر دوولایان, یانی ئەو فەرهەنگەی کەمن بە پرۆژەی تەمەنم دەزانی.خەریك بوو بەدیار چاوی خۆمەوە دەفەوتا, کەسیش متەقی لێوە نەدەهات, ئاخەر دەبوو برادەرانی چاپخانە، لایەکیان فەرهەنگەکەیان بکڕیایەتەوە ئەوجا دەیتوانی چاپی بکات...

●●●

## دووبارە گەڕانەوە بۆخەڵومت...

دوای ئەوەی (کاك فواد)و برادەرانی چاپخانەی گەنج, توانیان بەشی چاپخانەی (چوارچرا) بکڕنەوە, ئیتر زیاتر دڵنیابومەوە لەوەی کەئەگەر هیمەتێ بکەم بۆ زیندوکردنەوەی فەرهەنگەکە, دەتوانرێت چاپ بکرێت.بۆیە لەگەڵ کاك (فواد) ڕێکەوتم لەسەر ئەوەی شان بدەمەوە بەر ئەرکی سەرلەنوێ زیندو کردنەوەی پرۆژەکە, بەمەرجێ کاك فوادیش کەمتەرخەمی نەکات لەچاپکردنیدا...ساڵێکی تەواو بەرلەنوسینی ئەم پێشەکیە, بەئەخشەیەکی تەواوەوە دەستم بەکارکردو لەماوەی (١١) مانگدا توانیم ناتەواویەکانی پڕبکەمەوە. هەرلا پەڕەیەکیشم تەواو دەکرد، ڕاستەوخۆ هاوسەرەکەم هەرلەخەڵوەتگاکەمدا بۆمی تایپ دەکرد. واتە لەقۆناغی دووەمی ئامادەکردنی ئەم فەرهەنگەدا قورسایی تایپ لەسەر خێزانم بوو, ئەویشم وەك خۆم دووچاری گۆشەگیری وخەمی تایپ کردنی فەرهەنگ کرد. بۆیە جێی خۆیەتی دەرهەق بەماندوبونی زۆری لەگەڵمدا سوپاسی بکەم.

●●●

## لای مامۆستا بەڕێزەکانی زانکۆ...

لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەموت و کۆسپەکانی ڕێ زۆر وزەوەند بوون ونوچیان بەمرۆڤ نەدا .بەلام تروسکەی ئومێدێ زۆرجار لەئاسۆوە سەرەتاتکێی دەکرد وبەزمانی حاڵ تێی دەگەیاندین

تەنها واتای وشەبنەڕەتیەکەمان نوسیوە, نەك مانای ئەو وشەیەش کەلەگەڵیدا بەکارهێنراوە: بۆ نمونە لە(هاعَ ١/ الشيءُ) دا تەنها مانای (هاعَ) مان نوسیوە, لەبری ئەوەی بنوسین (شتەکە ڕاخرابە سەرزەویدا) بەومندە کومسایمان داوە کەبنوسین (ڕاخرا بەسەر زەویدا) یان (هاعَ ٢/ الرصاصُ) نوسیومانە (توایەوە) ئەمەش مانای وشەبنەڕەتیەکەیە کە (هاعَ) یە, نەك وشەی (رصاص) یش مانابکەین, کەوشەی یاریدەدەرە بۆ گۆڕانی مانای (هاعَ) چونکە لەشوێنی خۆیدا مانای وشەی (رصاص) یشمان نوسیوە...
هیوادارم لەمیانەی ئەم چەند نمونەیەوە شێوازی سود وەرگرتن لەم فەرهەنگەم ڕونکردبێتەوە، کە هەمان شێوازی سود وەرگرتنە لە فەرهەنگی (المنجد).
یەکێکی ترلەسودەکانی پێڕەو کردنی ئەم شێوازی کارە، ئەوەیە فەرهەنگەکە شکلی بناغەیەك وەردەگرێت بۆ کارێکی گەورەتر، بەجۆرێ ئەگەر من توانیبێتم لە کۆی پێنج مانا بۆ یەك وشە، سێ واتا بنوسم، ئەوا با کەسێکی تر بێتە پێشەوە و مانای چوارەم و پێنجەمیشی بۆ دابنێت، با ئەم کارەی من بناغەیەك بێت و پەیتا پەیتا پێکەوە تەواوی بکەین، ئەگەر کەسێك بڵێت: فڵان وشە مانایەکی تریشی هەیە، ئەوا سروشتی ژمارەیی دانانی مانای وشەکان لەم فەرهەنگەدا ئەو بوارە دەڕەخسێنێت کەلە داهاتوودا ئەو واتایانەشی بۆزیاد بکرێت، من لەم قۆناغەدا ئەوەندەم پێکرا واتای ژمارە(١،٢،٣)بۆ وشەیەکی دیاریکراو بنوسم، هەربەڕێزێکی تر لەخۆی ڕادەبینێت با واتاکانی(٤،٥،٦،....هتد)ی بۆ دابنێت و بەهەمومان کارەکە تەواو بکەین، چونکە پرۆژە ڕۆشنبیریەکان موڵکی کەلتوری کوردن و هەقە بەهەمومان لەخەمی دەوڵەمەندتر کردنی ئەو پرۆژانەدا بین.

●●●

## سوپاس و پێزانین

زۆر سوپاسی ئەم بەڕێزانە دەکەم کەهاوکارییان کردم لە بەرهەم هێنانی ئەم پرۆژەیەدا:
●بەڕێزان (کاك سەلام عەبدولکەریم)کە زۆر هاوکاری کردم، هەروەها(مامۆستا دکتۆر سەباح بەرزنجی، مامۆستا بێستون عەلی کەریم پرۆفیسۆری یاریدەدەر لەزمانی عەرەبی)لەزانکۆی سلێمانی کە ماندوو بوون لە پێداچونەوەی کارەکەم لەڕوی زمانناسیەوە، نمونەیان زۆرتر بێت.

• بەرێزان (کاك هەژارکەوڵۆسی، ژوان ئاوارەی شاعیر، ئەیمەن شێخ محەمەد، جەمال لەتیف، عەلی عەبدول، بەهادین حەسەن شارەزووری) کە زۆر هیلاك بوون لە هەڵەبڕیدا.
• سوپاسی زۆرم بۆ هاوسەری بەڕێزم( ژیان خان) کە لەگەڵ تایپکردنی ئەم کارەی مندا تەمەنێکی زۆری لە خەڵوەتدا بەسەر برد، تەنانەت هیممەتی ئەو فەرهەنگەکەی لە نێو قوڕگی لەناوچوون دەرهێنایەوە و لەمردنی حەتمی دەربازی کرد.

●●●

دواوتە

ئەوە ماجەرای دانان و هێنانە بەرهەمی ئەو فەرهەنگە بوو کە هەنوکە لەبەرچاوی ئێوەی بەڕێزدایە، ئەگەر نیشیکی چاکم کردووە، هیوادارم وەك دیاریەکی شیاو بە کتێبخانەی کوردی لێم وەربگرن، ئەگەر واش نەبێت جگە لە من، لۆمەی کەسی تر مەکەن!!.
لەکۆتایی ئەم پێشەکیەدا ئەو گوتە بەنرخەی مامۆستا( دکتۆر عەلی وەردی) دەڵێمەوە کە لە پێشەکی یەکێك لە پەڕاوە قەشەنگەکانیدا دەڵێت:( ئەگەر کتێبەکەم زۆر خراپیش بێت، قەیدی نیە، خوێنەر پارەی بلیتێکی سینەمای پێ ئەدات) !!.
دیارە ئەو لۆژیکەی مامۆستا وەردی پێی دەدوێت لەبارەی قەرزاری خۆی بەرانبەر ئەو کەسانەی کتێبەکەی دەکڕن، لۆژیکی هەموو ئەو نوسەرانەیە کەلەقوڵاییەکانی ناخیانەوە هەست دەکەن ئەوەندە خۆیان هیلاك کردووە کە دواجار ویژدانیان ئاسودەبێت لەبەرانبەر ئەو بەڕێزانەدا کە بەئومێدی وەرگرتنی زانیاری زیاترەوە کتێبەکە دەکڕن. هیوادارم ئەم فەرهەنگەی ئێمەش لەڕیزی ئەو کتێبانەدا بێت کە دواجار خوێنەران لەکڕینیان پەژیوان نابن.

عەبدوڵلا جەبار شەمسەدین
مەشخەڵ کەوڵۆسی
سەیدسادق ٢٠-٢١/٣/٢٠٠٧
شەوی نەورۆزی ساڵی٢٧٠٧ی کوردی

بەتایبەت ئەوانەی کە تەواو قالْ نەبوون لەزمانی عەرەبیدا، دەتوانن بەئاسانی سودی لێ وەربگرن، بە پێڕەوکردنی ئەم هەنگاوانە:

- ئەو وشەیەی کەماناکەی نازانیت دەستنیشان بکەو ڕێنوسەکەی وەك خۆی وەرگرە (بێ ئەوەی پێویست بکات ڕەگی وشەکە بدۆزیتەوە).
- بەگوێرەی پیتی یەکەمی وشەکە یەکێك لەپیتەکانی ئەم فەرهەنگە بکەرەوە.بۆنمونە: واتای وشەی (ینادی) نازانیت، بۆ ئەوەی بتوانیت لەم فەرهەنگەدا بەئاسانی ماناکەی بدۆزیتەوە، لەبەر ئەوەی وشەکەبە(ی) دەست پێ دەکات وەرە پیتی (ی) لەفەرهەنگەکەدا بکەرەوە. ئەمە لەکاتێکدا لەهەندێ فەرهەنگی تردا پێویستە بچیتەوە سەر ڕەگی ئەو وشەیە.
- هەنگاوی سێ یەم ئەوەیە ڕێنوسی (ینادی) (ی+ن+أ+د+ی) وەردەگریت ویەوجۆرە ڕاستەو خۆ بەشی کۆتایی پیتی (ی) هەڵدەدەیتەوە وماناکە دەدۆزیتەوە.
- ئاسانکاریەکی دیکەی ئەم فەرهەنگە بریتیە لەدانانی (سەرو ژێر) بۆ وشەعەرەبیەکان، ئەمەش یارمەتی فێرخوازانی سەرەتایی ئەدات تاکو بەشێوەیەکی ڕێکوپێك وشەکان بخوێنێتەوە.

بەلاّم زۆرجار کۆمپیوتەر (سەرو ژێر) ەکانی لەگەڵ پیتەکاندا تێکەڵ کردوە بەتایبەت ئەو پیتانەی کەخاڵیان هەیە بۆ نمونە (ق) واتە ئەگەر بتەوێت نیشانەی (زەممە) بخەیتە سەر ئەو پیتە نیشانەکە تێکەڵ بەخاڵەکانی سەر(ق)ە کەدەبێت.ئەمەش ناتەواویەکی سیستەمی بەعەرەبی کردنە لەکۆمپیتەردا. هەرچەندە هیچ کاریگەریەکی لەسەر ئیشەکەی ئێمە دروست نەکردوە، بەلاّم لەناخی دڵەوە هیوادارم ئەو ئاستەنگە تەکنیکیەی کۆمپیوتەر چارەسەربکرێت.بەتایبەت ئەم حاڵەتە لەگەڵ (خەتەکانی عەلی) دا دروست ئەبێت.

●ئاشکرایە لەزمانی عەرەبیدا بەشی زۆری وشەکان (بەتایبەت فیعلەکان) زیاد لەواتایەکیان هەیە، ئێمەش لەم کارەماندا ئەو ڕاستیەمان فەرامۆش نەکردووە، بەڵکو هاتوین مامەڵەیەکی تایبەتمان لەگەڵدا کردون بەم جۆرەی لای خوارەوە:

١) لەسەرەتاوە ئەم نیشانە (●) یەمان لە پێشی وشەکەوە داناوە.

٢) لەهەنگاوی دووەمدا ماناکانمان وەرگرتوە بەپێی ژمارە, بۆ نمونە:ئەگەر وشەیەك بەگوێرەی ئیزافە کردنی بۆ لای (پێنج) پاشگر, ماناکەی بەپێنج شێوە بگۆڕێت, ئەوا ئێمە لانی کەم سێ پاشگرمان بۆ داناوە وئەوگۆڕانەش کەبەسەر واتای وشەبنەڕەتیەکەدا هاتوە بەهۆی ئیزافە کردنیەوە بۆ لای ئەو سێ پاشکرە دامان ناوەتەوە, وەك ئەم چەندنمونەیەی خوارەوە:

●**شـابَ** ١/ پیربوو, موەکانی سپی بوو.٢/**الشيء**: تێکەڵاوی کرد.٣/ **الرجل**: ناپاکی لەبەرانبەر کرد.

●**کادَ** ١/خەریك بوو ڕوبدات, نزیك بوو ئیشێك بکات بەڵام نەیکرد دەگوترێت: (**کاد یضربه**-خەریك بوو لێی بدا).٢/**له** فێڵی لێکرد, چاوبەستی لێکرد, فێری فرو فێڵی کرد, جەنگی لەگەڵدا کرد.٣/**الشيء**: چارەسەری کرد, چارەی بۆ دۆزیەوە.٤/**الزند**: ئاگری دەرکرد.٥/**الرجل**: ڕشایەوە.

●**جاءَ** ١/هات.٢/**به**: هێنای, هاوردی.

●**هاعَ** ١/**الشيء**: ڕاخرا بەسەر زەویدا.٢/**الرصاص**: توایەوە. ٣/**هيوعا وهيعانا**: ترساو سڵەمایەوە. ٤/**الرجل**: برسیی بوو.

**سەرنج بدەلەچۆنێتی گۆڕانی واتای ئەو وشانەی لەو نمونەی سەرەوەدا هاتوون, واتە ئەگەر وشەی (جاء) بەتەنها مانای (هات) بگەیەنێت, ئەوا ئەگەر هەمان وشە لەگەڵ وشەی (به) بەکار هێنرا ئەوا مانای (جاءَ) دەگۆڕێت ودەبێتە (هێنای)...یاخود ئەگەر (کادَ) بەتەنها مانای (خەریك بوو ڕویدات) بدات بەدەستەوە, ئەوا گەر هەمان وشە لەگەڵ وشەی (الشيءَ) بەکار بهێنرێت ئەوا واتای (کادَ) دەگۆڕێت ومانای (چارەسەری کرد) دەدات بەدەستەوە.**

**ئەگەر (هاعَ) لەگەڵ وشەی (الشيءُ) دا مانای (ڕاخرا بەسەر زەویدا) بگەیەنێت, ئەوا ئەگەر گوترا (هاعَ الرصاصُ) مانای (هاعَ) دەگۆڕێت و دەبێتە (توایەوە) یان بەوجۆرەش مانای هەردوو وشەکە پێکەوە دەبێتە (قوڕقوشمەکە توایەوە) ...ئەگەر گوترا (هاعَ الرجُلُ) مانای (هاعَ) دەگۆڕێت ولەم بارەیاندا واتای (برسی بوو) دەگەیەنێت...هتد.**

**تێبینی یەکی گرنگ: وەك لەو چەند نمونەیەوە دەبینری,ئێمە لەسەرجەم ئەو گۆڕانکاریانەدا کەبەگوێرەی بەکارهێنانە جیاجیاکانی وشەبنەڕەتیەکان دروست بوون،**

**آب** مانگی هەشتەمی ساڵی زاینی.

●**آبَ** ١/الى الله: تۆبەی کرد، گەڕایەوە بۆ لای خوا، پەشیمان بویەوە.

**آبِق** بەندەی هەڵاتوو، بەندەی ڕاکردوو.

**آتی** بەخشی.

**آتي** ئاینده، پاشان، لەمەودووا.

●**آثَرَ** ١/ه: هەڵی بژارد، بەچاکی دانا.

**آثِم** گوناهبار، تاوانبار.

**آجَرَ** بەکرێی دا.

**آجَرَ** پاداشتی دایەوە.

**آجُر** خشتی سورەوە کراوەی قوڕ.

**آجِل** دێر، دژی (عاجل)، ماوەیەکی دیاری کراوی درێژ خایەن.

**آحـــاد** یەکانـــە، یـــەك لایـــی و یـــەك جەمسەری.

**آخَذَ** لۆمەی کرد.

**آخِر** کۆتا، کۆتایی.

**آخَر** تر، وەك: کەسێکی تر.

**أُخرى** دووبارە.

**آخِرة** پاشە ڕۆژ، قیامەت.

**آداب** داب و نەریت، ڕەوشت، ئاکار.

**آدَم** باوکی مرۆڤـان، بـابی مرۆڤـانی سـەر زەوی.

**آدَمِيّ** مرۆڤ ئادەمیزاد.

**آدَى** ئامادەبوو.

**آذَنَ** بە ئاگا بوون.

**آذَى** ئازار گەیاندن.

**آرَبَ** فێڵی کرد، سەرکەوت لە قسە زانیدا.

**آرَخَ** مێژووی نوسی.

**آرِق** شەوبێدار، خەون زڕاو.

**آسِيَ** خەفەتی خوارد، ناڕەحەت بوو.

**آسِف** پەژموردە.

**آفَة** بەڵا و ناڕەحەتی.

**آكَـــف** کورتـــانی بەســـت (لـــە گـــوێ درێژەکە).

**آكَلَ** خواردی.

**آكِل** بخۆر.

**آكِلَة** نەخۆشی خۆرە، خوران، ئاڵۆش.

**إِلّ** پەیمان، دوژمنایەتی و قین.

**أَلْتة** سوێندی درۆ.

**آلة** ئامێر.

**آلَفَ** هاوڕێ ودۆستی گرت، دۆستایەتی کرد.

**آلَمَ** ئازاری بەخشی.

**أَلَة** ئامێر، ئامراز، دەستگا.

**أَلى** سوێندی خوارد.

**آمَنَ** بڕوای هێنا.

**آمِن** دڵنیا، بێ دڵە ڕاوکێ.

**آمین** وشەیەکە لە دوای نزا کردنەوە دەگوترێت مەبەست پێی بە هانا هاتنی نزاکەیە.
**آنَ** کاتی هات.
**آناء** ساتەکان، ساتەکانی شەو.
**آنَسَ** میهرەبانی نیشاندا.
**آنِسَة** کچی ئازەب، گەورە کیژی شوو نەکردوو.
**آنِفاً** ڕابردوویەکی نزیك، سەرەتای هەر شتێك.
**آنَقَ** سەری سوڕما.
**آوَی** پەنایدا، جێ ی کردەوە.
**آه** ئەفسوس، حەسرەت.
**آهِل** پیاوێك ژن ومندالی هەبێت، پیاوێك خێزاندار بێت.
**آیِس** نائومێد.
**آیَة** نیشانە، پەند.
**أیِنَ** ئاین.
**ائتَلَغَ** تێکەلاو بوو ( دەگوترێت: **ائتلغ الامرُ**).
● **ائتَشَبَ** ١/تێکەلاو. ٢/**القوم**: تێکەڵ بوون.
**ائتَکَل** داخورا، هەندێکی هەندێکی دیکەیی خوارد.
**ائتلاف** پەیوەست بوون.
**ائتَمَّ** پەیڕەوی کرد.
**ائتَمَرَ** ڕاوێژی کرد.
**ائتَمَنَ** بویە ئەمانەت دار.
**أب** باوك، هۆی دروست بوون.
**ابا** بویە باوك.
**أباحَ** ئاشکرای کرد.
**ابادَة** لە نێو بردن، فڕکردن.
**ابار** لە کەدارکردن، نابوت کردن.
**أبّار** دەرزی ساز، سوزن دروست کەر.
**اباسَة** نارەحمتی و تەنگ و چەڵەمە.
**أباشَة** خەلکی تێکەڵ و پێکەڵ.
**ابالَة** کۆمەڵ، چاك هەستان بە بەڕێوەبردنی ماڵ و سیاسەت.
**ابّالَة** دەستەیەك گیا، دەستەیەك تەختە و دار.
**اَبانَ** ڕون و ئاشکرا بوو.
**ابّان** سات، کات.
● **ابانَ** ١/**الشيءَ**: ڕون بویەوە، ئاشکرا بوو.
● **أبا** ١/**ه**: پەروەردەی کرد، گرنگی پێدا وەك چۆن باوك گرنگی دەدات بە کوڕی خۆی.
**أباءُ** قامیش.
**أُباب** ئاوێکی زۆر.

**آبابــة** حالــەتێکی دەروونیــە توشــی کەسێکی دورکەوتە دەبێت، بریتیـیە لـە بێتاقەتی زۆر بۆ نیشتمانەکەی.

**آبِتَ** گەرمیەکەی زۆر بوو.

**آبِتْ** ڕۆژی زۆر گەرم.

**ابْتاعَ** کڕین.

**ابتدَأَ** دەستی پێکرد.

**ابتدائي** سەرەتایی.

**ابتداع** داهێنان، ئافراندن.

**ابتَـدَرَ** خێـرا کـردن، پەلـە کـردن، پـێش پێشێن.

**إبتدعَ** داهێنانی کرد، شتی نوێی داهێنا.

**ابتدال** بێ ئەرزش، بێ نرخ.

**ابتَرَ** کەنار گیری کرد.

**أبتَر** وەجاخ کوێر، بڕاو.

● **ابتزلَ ٨/الجَسَدَ** خوێنی لێ تکا.

**ابتَسَرَ** بە دەستی هێنا.

**ابتَسَمَ** زەردەخەنەی کرد.

● **ابتَعدَ ٨/عَنهُ** لێی دورکەوتەوە.

**ابتغاء** داوا کردن.

**ابْتَغی** داوای کرد، خواستی.

**ابتكار** داهێنان، ئافراندن.

● **ابتَلا ٨/هُ** تاقی کردەوە.

**ابتلاء** تاقی کردنەوە، توش بون بە بـەلا بۆ تاقی بونەوە.

**ابْتَلَعَ** قوتیدا.

**ابتَلَی** توشی بەلا هات بۆتاقی بونەوە.

**ابتَنی** خانوی دروست کرد.

**ابتَهجَ** شادومان بوو، خۆشحاڵ بوو.

**ابتَهَر** زیادە ڕەوی کرد.

**ابتَهَلَ** پاڕایەوە، نەفرەتی کرد.

**ا بجَد** پیتە ئەبجەدیەکان.

**ابَحَّ** دەنگ گرمن، دەنگ ڕەق.

**ا بحَرَ** کەشتی دەریای کرد.

**ا بخَـر** دەم بۆگـەن، کەسـێك بـۆنی دەمـی ناخۆش بێت.

**ا بخَلَ** ڕژدی نواند.

**ابَدَ** مایەوە، نیشتەجێ بوو.

**ابِدَ** تورەبوو.

**ابَّــدَ** دورکەوتــەوە لەخــەڵکی، دوور لەخەڵك ژیا، ژیانی جاویدانی هەڵبژارد.

**ابَدْ** هەرگیز، هەمیشە، بەدرێژی ڕۆژگار.

**ابَــدَأَ** دەســتی پێکــرد، شــتی ســەیرو سەمەرەی هێنا، منداڵ دەستی بەڕۆشتن کرد.

**ابْدال** گۆڕینەوە.

**ابداء** دەربڕین، ئاشکرا کردن.

**ابــدَعَ** داهێنــانی کــرد، بــە ڕێکـوپێکی کارەکانی ئەنجامدا.

**ابَدَي** هەمیشەیی و بێ کۆتایی، هەتا هەتایی.

**ابْدَی** دەری بڕی، ئاشکرای کرد.

**ابَدِیّة** هەمیشەیی.

**ابَرَ** دەرزی خوارد کردن، دەرزی کردنە نێو ئالّقی ئاژەڵەوە بۆ وەی ئاژەڵەکە بمرێت.

**ابَرَ** کەشتی وشکانی کرد.

**ابراز** دەرکەوتن، ئاشکرا کردن.

**ابَرِدَ** چوە نێو سەرماوە.

**ابْرَزَ** ئاشکرا، دیار، دەرخستن.

**ابْرَص** بەڵەك.

● **ابَرَّ ١/علیه،** بە سەریدا زاڵ بوو، سەرکەوت بە سەریدا.

**ابَرَقَ** هەڕەشەی کرد.

**ابْرَقَ** زەویەکی سەخت کە بەرد لەگەڵ خاکەکەیدا تێکەڵاو بێت، زەویەکی ڕەقەڵان.

**ابْرَكَ** هەڵپەی کرد بەرەو دوژمنەکەی، وشتری پەخدا.

**ابْرَمَ** توندو تۆڵ بەستی، ڕێکوپێکی کرد.

**إبرة** دەرزی.

**إبريز** زێڕی پاڵفتە.

**ابريسم** ئاوریشم.

**ابريق** دەفرێکە سەرو دەسك ولولەی هەیە، وەك قۆری.

**ابزام، ابزيم** حەڵقەی کەمەر بەند.

● **ابسَلَ ١/**قەدەغەی کرد. **٢/فلاناً،** گرەوی لەگەڵدا کرد. **٣/** خۆی دا بە دەست مردنەوە.

**ابشَرَ** مژدەیدا.

**ابهَرَ** بینی.

**إبط** بن باڵ.

**ابطأَ** خاوەخاوی کرد.

**ابطال** پوچەڵ کردنەوە.

**ابطأ** درەنگی کرد، دوای خست.

**ابطَرَ** سەرسامی کرد، سەری لێ سوڕماند.

**ابطَلَ** شتی پڕو پوچی گوت، درۆی کرد.

**ابطَنَ** شاردیەوە.

**إبعاد** دورکەوتنەوە، جیابونەوە.

**ابعَدَ** دورکەوتەوە.

**ابعَد** دورتر، دورترین.

**ابغَضَ** ڕقە بەرایەتی کرد، دوشمنایەتی کرد.

**إبقاء** مانەوە.

**ابقَلَ** دەرکەوت.

**ابقى** بەزەیی هاتەوە.

**ابْقَى** بەردەوام مایەوە، هەر شتێك زیاتر بمێنێتـەوە خـوا دەفـەرمێت: **(والآخـرة خير و ابقى)**.

**ابْكَار** سەرەتای بەرە بەیان تاكو گزنگ.

**ابكَرَ** پەلەی كرد، شەوی بە دەمەوە گرت لە پەلە پەلەیدا، ڕۆژی كردەوە.

**ابكَم** لاڵ، كەڕو لاڵ.

**ابكَى** ئامادەی گریان بوو، گریاندی.

**ابِل** وشتر.

**آبَلَ** زۆر ڕاست، زۆر بە كەڵك و گونجاو دەگوترێت: **(لاشئ ابلُ للجسم من كذا)**.

**ابلاغ** پەیام گەیاندن.

**ابلَج** ڕون و ئاشكرا.

**ابلَد** بێ هۆش، كەم فام.

**ابلَسَ** كەم خێر بوو.

**ابلَس** نائومێد.

**ابلَطَ** ئیفلاس بوو، ئیفلاسی پێ كرد، ڕوتێنرایەوە.

**ابلـط** هـەژار كـەوتوو، بـە كەسـێك دەگوترێـت لــە خۆیــدا هەژارونــەدار نەبوبێت بەڵكو بە هۆی دزی لێكران یان هەر كارێكی ترەوە هەژار كەوتبێت.

**اَبْلَغْ** شتێك زیادەڕەوی تێدا كرابێت.

**ابْلَغَ** گەیاندی، بڵاوی كردەوە.

**ابلَقَ** شتی ڕەش و سپی.

**ابَلَه** كەم هۆش، نافامیدە.

**ابلـه** بـە كـەم هۆشـی زانـی و بـێ عـەقڵ هاتە پێش چاوی.

**ابلَ** خراپەكار.

**اُبَلّة** هۆز، تایفە، خێڵ.

**ابلـى** كـۆنی كـرد (بـۆ پۆشـاك)، تـاقی كردەوە **(ابلى اللهُ عبادهُ)**.

**اَبَنَ** گریە و زاری كـرد، شـین و واوەیـلای كرد.

● **اِبـــن** ١/كـــوڕ، فـــرزەن. ٢/**الحـــرب**: جەنگاوەر. ٣/**السبيل**: ڕێبوار.

● **ابنـــاء** ١/ كـوڕان، ڕۆڵـەكان. ٢/ **الامـة**: تاكـــەكانی میللـــەت. ٣/**الـــدنيا**: دنیـــا پەرستان. ٤/**العلـم**: شـاگردانی زانـست، قوتابی.

● **ابـى** ١/**عليـه**: دوركەوتـەوەو تـوخنی نەكەوت. ٢/لێی یاخی بوو.

**اُبنَـة** گـرێ لـە لقـە داردا، ناتـەواوی و لەكە.

**ابنَـة** كـچ (بـۆ بـاوك و دایـك)، ڕۆڵـەی مێینە.

**ابنى** كوڕەكەم، كوڕەكەی من، كوڕی من.

● **ابُوا** ١/**الاستقلال**: بنیادنـەری سـەر بە خۆیی. ٢/**جابر**: نان.

**ابَوان** دایك و باوك.

**ابُوّة** باوكايەت.

**ابهام** پەنجە گەورەی دەست.

**ابهَجَ** خۆشحاڵ بوو، خۆشحاڵی کر.

**ابهَرَ** شتی سەرنج ڕاکێشی هێنا.

**ابهَر** پشت.

**ابهَـمَ** ئاشکرا نەبوو شاردرایەوەبە جۆرێك سەر بشێوێنێت لە یەکێك بیەوێت بیناسێتەوە.

**ابهَـم** بێ گیان، جەستەیەك هیچ جوڵەیەکی تێدا نەبێت.

**ابَى** قەدەغەی کرد.

**ابِى** قەدەغەکرد.

**ابْيَضّ** سپی بویەوە.

**ابيلـىّ** ڕاهیبی مەسیحی، قەشەی دیانەکان.

**اتـاحَ** پێدان، ئامادەکردن، ڕەخساندن (بوار پێدان، بوار بۆ ڕەخساندن).

**اتـاوة** بەرتیل، سەرانە، باج.

●**اتـاهَ ١/هُ** گومڕای کرد، لە خشتەی برد.

**إتبَعَ** پەیڕەوی کرد.

**اتَّبَعَ** پەیڕەوی لێکرد، شوێنی کەوت.

**اتبَلَ** یەکی خست، هۆشی برد.

●**اتّجـاه ١/**ڕووگە، ڕەوت، ئاراستە. **٢/الواحد:** یەك ڕەوتی، یەك ئاراستەیی، هەماهەنگی.

**اتَّجَرَ** بازرگانی کرد.

●**اتّجَهَ ١/اليه:** ڕوی تێکرد.

**إتحـاد** ڕێکەوتن، یەکگرتن، کۆبونەوە، یەکرابوون، یەکێتی.

●**اتَّحَدَ ١/الهيئان:** دوشت یەکیان گرت.

**اَتحَفَ** هەدیەی کرد، کردیە دیاری.

**اتَّخَذَ ١/**وەری گرت. **٢/هُ صَديقا:** کردیە هاوڕێ، بەهاوڕێی خۆی وەری گرت.

**اثَّرَ** دووری خستەوە، دوری خست، بڕی، قرتاندی.

**اُتـرُج** دارێکە بەرز دەبێتەوە، پەل و گەڵاکانی نەرمن، بەرەکەی وەك لیمۆیەکی گەورە وایە، ڕەنگەکەی زەردێکی ئاڵتونیە، و تامی ترشە، فارس پێی دەڵێن باڵنك.

**اترسَ** دایخست.

**اترعَ** پڕی کرد.

**اتْـرَفَ** پێداگری کرد لەسەر لەسنور دەرچوون، پێداگری کرد لەسەر ملهۆڕی.

**اتـرَف** کەسێکە کەلیەك لەناوڕاستی لچی سەرەوەیدا هەبێت.

**اتَّزَرَ** پەشتەماڵی دا بە خۆیدا، شەرواڵی لە پێ کرد.

**اتَّـزَنَ** بـەویقار بـوو، هـەڵس و کـەوتی پیاوانە و میانەڕەوانەی وەرگرت.

**اتَّسَعَ** فراوان بوو.

**اتَّسَقَ** ڕێك و پێك بوو.

**اتَّسَمَ** ناوی بە خۆیەوەنا، ناوی بۆ خۆی بڕیاردا، نازناوێکی بە خۆیدا تاکو پێی بناسرێتەوە.

**اتَّشَقَ** بڕی و پارەپارەی کرد.

**إتَّصَفَ** توانی وەسفی بکات.

**إتَّصَلَ** پەیوەست بوو، پەیوەندی کرد.

**أتَّضَحَ** ڕون بویەوە، ئاشکرا بوو.

**أتَّضَعَ** خشوعی برد.

**أتعَبَ** هیلاك بوو، شەکەت بوو.

**إتَّعَـدَ** ئەمەکـدار بـوو، بەرانبـەر بـە پەیمان، متمانەی پێ بوو.

**إتَّعَظَ** پەندی وەرگرت.

**إتفاق** ڕێکەوتن.

**إتفاقيّة** ڕێکەوتننامە، پرۆتۆکۆل.

**إتَّفَقَ** ڕێکەوت.

**إتقان** وردبینی وڕێکوپێك کاری.

**إتَّقاهُ** پارێزگاری لێکرد.

**إتَّقَدَ** دایگیرساند، ڕۆشنی کردەوە.

**إتَّقَنَ** ڕێکوپێکی کرد.

**إتَّقى** پارێزگاری کرد.

**أتقا** پارێزکارتر، پارێزکارترین.

**اتَّكَأَ** پاڵی دایەوە، بەڕێکوپێکی دانیشت.

**إتكاء** پشت پێ بەستن.

**اتَّكَلَ** پشتی پێ بەست.

**آتلَجَ** چوەناویەوە، کردیەناویەوە.

**أتْلَعَ** ملی درێژ کردەوە.

**اتلَفَ** خراپی کرد.

**أتَمَّ** تەواوی کرد، کامڵی کرد.

**اتمام** تەواوکردن.

**اتهام** تۆمەتبار کردن.

**اتَهَمَ** تۆمەتباری کرد، گوناهباری کرد.

**آتىَ** هات، ئامادە بوو.

**آتىَ** بێگانە، نامۆ.

**أتَى، أتْياً** هات وئامادەبوو.

● **أتـىَ ١/بـهِ** هێنـای، هـاوردی، ئامـادەی کرد.

**آثَّ** (گیـا یـان مـوو) زیـادی کردوبەیەکـدا هەڵچون.

**أثـابَ** پاداشتی دایەوە، حەوزی پڕ کرد.

**آثـاث** کەل وپەل.

**أثـارَ** تۆڵەی کردەوە.

**اثـارة** ڕێزمەندی دەست بە دەست هاتوو، کـردەوەی چـاکە پـشتاو پـشت مابێتـەوە، پاشماوەی هەر شتێك.

**أثْبَاتٌ** سەقامگیرکرد.

**أَثْبَتَ** سەقامگیری کرد، نوسی (**أثبت اسمه في الديوان**).

**أَثَّثَ** کەل و پەلی تێکرد (بۆ ماڵ)، نەرم وئامادەی کرد.

●**أَثْخَنَ** ٨ زیادەڕەوی کرد. ٢/ه لاوازی کردو بە سەریدا زاڵ بوو.

**أُثْر** ئاسەواری زام، جێگەی برین.

**أَثْــر** بریکەی شمشێر، هاتن بە دوای یەکدا بە بێ ئەوەی ماوەیەکی بە نێو دابێت.

**أَثَر** خود پەسەند.

**أَثَــر** ئاسەوار، سوننەت (سوننەتی پێغەمبەری مەزن).

**أَثْرَدَ** ئامادەی کرد، تریتی ئامادەکرد.

**أَثْرَد** کەسێك هەردوو لچی کە لایی تێدا بێت.

●**أَثَرَ** ٨/علیه، کاری لێکرد، کاریگەری لە سەر دانا. ٢/ه ڕێزی لێگرت.

**أَثْرَمَ** کەسێك ددانی لە بنەوە شکابێت، کەلەفیچ.

**أُثْرَة** پاشماوەی زانست.

**أَثَرِيٌّ** شوێنەوار ناس.

**أَثْرَى** دەوڵەمەند بوو.

**أَثْغَــر** ددانە شیریەکانی کەوتن (بۆ منداڵ) دەگوترێت (**أثغرَ الصبيُّ**).

**أَثْقَلَ** کۆرپەی نێوسکی قورس بوو (بۆ ژنی سك پڕ)، باری قورس بوو، قورسی کرد.

**أَثْل** داری گزیچار.

**أَثْلَجَ** هاتە نێو بەفرەوە.

**أَثْلَة** ڕیشەو ڕەچەڵەك.

**أَثِمَ** گوناهی کرد.

**أَثِم** گوناه، کاری خراپ.

**أَثْمَرَ** بەری گرت.

●**أَثْمَــلَ** ٨/ه سەرخۆشی کرد، مەستی کرد.

**أَثْمَن** بە نرخ تر.

**اثنا عَشَر** دوازدە.

**اثنان** دووان.

**أَثْناء** لە کاتێکدا، لەمیانەی.

●**أَثْنَى** ٨/علیه، پیایدا هەڵدا.

**اثْنَين** دووشەممە.

**أَثِيل** پلە بەرز.

**أَثِيم** گوناهبار، تاوانکار.

**أَجَّ** هەڵگیرسا، تاوی سەند، شوعلەوەر بوو.

●**اجــاءَ** ٨/ه ئەوی هێنا، ناچاری کرد بێت.

●**اجـــابَ** ١/وەڵامـــی دایـــەوە. ٢/ه **الی حاجتـــــه**: خۆشـــــحاڵ بـــــوو بەدەســـتەبەرکردنی پێداویـــستیەکانی، بـــەدەم پێویـــستیەکەوە چـــوو، وەڵامـــی پێویـــستیەکانی دایـــەوە، پێویـــستیەکانی ئەوی دەستە بەر کرد.

**أجاج** هەرچی شتێك دەم بسوڵێنێتەوە بە هۆی تاڵیەوە یان سوێریەوە.

**اجَـــاج** هەڵگیرســا(بـــۆ ئـــاگر)، تـــاڵ یـــان سوێر(بۆ ئاو یان خواردەمەنی).

**أجـــادَ** چـــاکی کـــرد، شـــتی باشـــی هێنـــا، کوشـــتی دەگوترێـــت (**اجـــاد الرجـــل**) پیاوەکەی کوشت.

●**أجـــارَ** ١/ه: بەلایـــدا بـــرد، ســـەری لێ شێواند، لاری کردەوە.

**إجارَة** کرێی کار، پاداشت.

**أجازَ** رێگەی دا، مۆڵەتیدا.

**اجازة** مۆڵەت، برینی ماوە رێیەك.

**اجاص** هەڵوژە.

**أجـــاعَ** برســـی کـــرد، ناچـــاری کـــرد بـــە برسێتی بمێنێتەوە.

**أجـــال** لاری کـــردەوە، دەگوترێـــت (**اجـال السیف**) یانی بەمەلاو لادا خواری کردەوە و رایوەشاند.

**اجَانَة** تەشت، دەفری جلك شۆردن.

**اجباریّ** زۆرە ملێ.

**أجْبَرَ** ناچاری کرد.

**أجْبَلَ** نائومێد بوو، شکستی هێنا.

●**أجبَنَ** ١/**الرجل**: ترسی دایە پاڵی، بە ترساو هاتە پێش چاوی.

**اجتابَ** گەشتی کرد، سەفەری کرد.

**اجتـــاحَ** لـــە بـــنج و بنـــەوان دەری هێنـــا، لەناوی برد.

**اجتاز** گوزەری کرد.

**اجتـاسَ** بە پێداگریـەوە داوای کـرد، بـە لێبڕاویەوە داوای کرد.

**اجتافَ** بۆگەنی کـرد(بـۆ لـەش)، چوەوە نێو لانەکەی (بۆ درندەو گیاندار).

**اجتبی** هەڵی بژارد.

**إجتَـــثّ** لـــە بنجـــەوە هـــەڵی کەنـــد، ریشەکێشی کرد.

**اجتَحَرَ** پەناگەیەکی بـۆ خـۆی هەڵبـژارد، بویە پەناهێندە.

**أجْحَمَ** کڵپەی سەند دەگوترێت (**احجمت النار**).

**اجتَحَـفَ** دای دڕی دەگوترێـت (**اجتحف السیل الوادی**). لـە بنجـەوە هـەڵی کەنـد دەگوترێت (**اجتحفه**).

●**اجْتَرَّ ١/البعيرُ** ئەوەی لە گەدەی دابوو هێنایەوە دەمی و دووبارە جویەوە، کاوێژی کرد.

**اِجتراف** لە بێخ دەرهێنان.

●**اجتَرَش ١**/دزیی، دەگوترێت **(اجترش الشئ)** یانی فلان شتی دزی. ٢/ بە دەستی هێناو پەیدای کرد دەگوترێت **(اجترش لعياله)** فلان شتی بەدەست هێنا بۆ منداڵەکانی.

**اجتَرَمَ** گوناهی کرد، تاوانی ئەنجامدا.

**اجتَرءَ** بوێری نواند.

**اجتَزَرَ** سەری بڕی (بۆ ئاژەڵ) دەگوترێت **(اجتزرَ الشاة)**. ئامادەی کرد بۆ سەربڕین.

**اجتَسَّ** دەستی لێدا بۆ وەی بیناسێتەوە.

**اجْتَلَّ** زۆربەیی برد دەگوترێت **(اجتلَّ الشيء)** یانی زۆربەی فلان شتی برد بۆخۆی (کوردە واتەنی نێرەکەر بەشی کرد).

**اجتَلَبَ** بە دەستی هێنا، هێنای.

**اجتماع** کۆبونەوە.

**اجتَنَّ** شاردیەوە، حەشاریدا.

**اِجْتَنَحَ** بەلایەکیدا لاربوو، بەلایەکی دا کەوت، بەلایەکیدا راکشا.

**اجتَنَبَ** خۆی لێ پاراست، خۆی لێ دور خستەوە.

**اِجتهاد** کۆشش کردن.

●**اِجتَهَرَ ١/القوم،** کە لێی نواڕین ژمارەیانی بەزۆرهاتە پێش چاو. **٢/الرجل،** بەئاشکرا بۆی ڕوانی بەگەورە نیشانیدا، گەورەی کرد.

**أَجَّجَ** هەڵی گیرساند ( بۆئاگر ) تاڵی کرد یان سوێری کرد (بۆئاو).

**اجحاف** بێ دادی، بێ ویژدانی، لایەنگری کردن.

**أجحَفَ** توند بوو لەزیان پێ گەیاندنی.

**اجحَم** پیاوی چاوسور.

●**أجَدَّ ١/في الأمر:** لێبراوکۆششی کرد. **٢/الشيء:** نوێی کردەوە.

**أجداف** سوپاس نەکردنی نیعمەت، بەسوك سەیرکردنی نیعمەت.

**أجَدَان** شەو ورۆژ.

**اجدَب** وشکەوە بوو، وشك هەڵات.

**اجدَرَ** سەری دەرهێنا لەزەوی (بۆ ڕوەك وگیا).

**أجدَعَ** لوت بڕاو، بەکەسێك دەگوترێت لوتی بڕابێت.

**أجدَف** کورتە باڵا.

**اجــدَل** تونـد وتـۆڵ وبەیەكـدا پێـچراو، هەڵۆ.
**أجْدى** بەخشی، بەخشندەیی نواند.
**أجَذّ** شكێنراو.
**أجذَر** لەبێخ هەڵكەندن.
**اجذَفَ** تیژڕەوتی كرد، بەخێرایی ڕۆشت، بە تیژی ڕۆشت.
● **اجــــذَلَ** ١/شـــادوومان بـــوو. ٢/**ه**: شادومانی كرد.
● **اجذَمَ** ١/ بەخێرایی ڕۆشت. ٢/ توشی نەخۆشی گولی بوو. ٣/**بُلخ**: بڕیەوە.
**اجــذَم** پیــاوی گــول، دەســت بــڕاو، دەگوترێـت (**هـو اجـذم الحُجـة**) یـانی ئەومندە بێ دەم و داوانە ناتوانێت بەڵگە بێنێتەوە یاخود وەك ئەوە وایە زمانی نەبێ قسەی پێ بكات.
**أجْر** كرێی كار، پاداشت، مارەیی.
**إجراس** فرەی باڵی مریشك، چریەی پێ.
**أجراس** زەنگ (وشەكە جەمعە).
**إجراف** گیا بەسەوزی وبەوشكی.
**إجراء** جێبەجێ كردن.
**اجــرَب** پیــاوی گــەڕ، پیاوێــك توشــی نەخۆشی گەڕی بوبێت.
**أجرَس** زەنگی كاروان.

● **أجرَفَ** ١/**المكان**: لافاو لێی دا. ٢/**الراعيُ ابلهُ**: گیای دایە دەرخواردی وشترەكەی.
**اجرَمَ** تاوانی كرد.
**أجْــرَة** ١/كــرێ. ٢/**التعلـيم**: مانگانــەی فێركردن، كـرێی فێـر كـردن. ٣/**السفر**: كرێی سەفەر. ٤/**النقل**: كرێـی هـەڵگرتن وگواستنەوە.
● **أجرى** ١/جێبەجێی كرد، ڕەوانـی كـرد. ٢/**عليه الـرزق**: ڕشتی بەسـەریدا، ڕۆزی ڕشــت بەســـەریدا. ٣/**الحســاب**: تۆمــاری كردو ڕێك وپێكی كرد. ٤/**الماء**: ئاوەكـەی ڕۆكـرد، وای كـرد لەئاوەكـە تالـە بـەری بڕوات.
**أجـزَرَ** بـەرخی سـەربڕی، بـەرخی پێـدا سەری بڕێت.
**أجزَلَ** بەخشینی زۆر كـرد، بەخـشندەیی بەرفراوان كرد.
**أجزى** هەر شتێك زیـاتر كومـسایی بـدات (دەگوترێـت: **اللحـم السمين اجـزى مـن المهزول** - گۆشتی قەڵەو زیاتر كومـسایی دەدات وەك لــە گۆشــتی لــەڕ)، كۆمـسایی بەخش تر.
**أجـسَم** كەتـەو لـەش ولار بـەخۆوە بـوو، كەتەتر، قەڵەو تر.

●أجَشَّ الشيءَ: لێداوشكاندی. ٢/المكانُ: ڕوەك وگیاكەی درێژ بوون وبەیەكدا هاتن.

أجَشّ دەنگ ڕەق، كەسێكی دەنگ گرمن.

أجعَب ورگ زل وبێ كار، زلی بێ هونەر.

أجفَلَ بەخێرایی ڕۆشت.

أجفى دوری خستەوە لەخۆی، دوری خستەوە.

أجِلَ دواكەوت، ملی هاتە ئێش گەردنی ئازاری تێدا پەیدابوو.

أجَل كۆتایی تەمەن، كاتی هەر شتێك.

أجَلْ بەڵێ، ئەرێ.

أجَلّ گەورەترین، بزورگ ترین.

اجلَبَ رۆزی بەدەست هێنا.

اجلَح كەسێك لەهەردو لاسەریەوە قژی ڕوتابێتەوە، كەچەڵ.

●أجْلَدَ ١/المكانُ: ئاونگی پێوە نیشت وبەستی.

إجلَخَّ لاواز و سست بوو.

اجلَسَ دانیشت.

إجلس دابنیشە!.

أجلَع بێ ئەدەب، پەرومردە لاواز، ئەدەب سز، كەسێك شەرم وشۆی نەبێت، كەسێك لەدوای قسە كردن لێوەكانی بەچاكی نەكەونەوە سەر یەك وددانی بەدەرەوەبێت.

أجلى دەرچوو لەوڵاتی خۆی، جوان ڕوخسار.

●أجَمَّ ١/الفرسُ: وازی لێ هێناو سواری نەبوو.

أجَمّ كەسێكی بێنێزەو شیر لەجەنگدا، كەسێك لەشەڕدا چەكی پێ نەبێت، بەرانی بێ قۆچ.

إجماع كۆدەنگی.

إجمال پوختە، كورتە.

اجماء ئەسپی ناو چاوان سپی.

أجمَدَ ڕژدبوو، خێر لەوەوە دەرنەكەوت، چاكەی لێ نەوەشایەوە.

●أجمَرَ ١/القومُ علی امرٍ: كۆبونەوە لەسەری. ٢/الأمرَ القومَ: كۆی كردنەوە. ٣/تِ المرأةُ: قژی بەست و لە دواوە شاردیەوە وبەری نەدایەوە.

●أجمَعَ ١/القومُ علی كذا: كۆبونەوە و یەكدەنگ بوون و ڕێكەوتن لە سەری.

أجمَع هەموو، هەمووان، گشت.

●أجمَلَ ١/كۆی كردەوە، بە كورتی باسی كرد. ٢/الشيءَ: جوانی كرد. ٣/الشحمَ: بەزی تواوەی خوارد، بەزی تواندەوە.

أجْمَل جوانترین.

**أجمَـة** سـەر زەمینێـك پـڕی بێـت لـە درەخت، جەنگەڵ، بێشە.

**أجميّة** مەلاریا، لەرزوتا.

**أجَنّ** شێت بوو.

**أجنَب** بێگانە، بیانی، غەوارە، نافرمان.

●**اجنَـب** ١/ه دوری خـستەوە، کردیـە بێگانە.

**أجنَبي** نامۆ، بێگانە، بیانی.

**أجَخ** کەچی کرد، لاری کردەوە.

**أجنحَة** باڵ، دەست، قۆڵ، بازوو، بن باڵ.

**أجنَـف** پـشت چـەماوە، کەسـێك پـشتی چەمابێتەوە، کەسێك لە ئامۆژگاری لایـدا بێت.

**أجُوح** ڕۆشن و درەوشاوە.

**اجْوَدَ** چاکی کرد، باشی کرد.

**أجْـــوَد** چـاکتر، باشـتر، بەخـشندەتر، دڵفراوان تر.

**أجـوَف** سك زل (بـۆ مـرۆڤ)، نـاو فـراوان (بۆ خانوو).

**أجَـة** تونـدو تیـژی گـەرما، تاوسـەندنی گەرما.

**إجهاد** داخوازی کردن لە سەروی تواناوە، ماندووکردن.

**أجهَدَ** کۆششی کرد.

**أجهَرَ** دەنگی هەڵبڕی، ئاشکرای کـرد، ڕای گەیاند.

**أجهَر** کەسێك لە خۆرەتاودا نەبینێت.

**أجهَشَ** ئامـادەبوو بـۆی، خـۆی ئامـادەکرد بۆی (بەتایبەت بۆ گریان).

●**اجهَضَ** ١/ت **المرأة** منـداڵی لەبارچـوو. ٢/ه دوری خستەوە.

**اجیج** کڵپەی ئاگر.

**أجیَـد** مـل بـەرزو جـوان، کەسـێك ملـی بەرزو جوان بێت.

**أجیر** بە کرێ گیراو، خزمەتکار بـە کـرێ، کرێکار.

**أحّ** کۆکی، قۆزەی کرد.

**أحاح** قین، تینوێتی.

**أحاد** یەك یەك.

**أحاسِن** چاکترین، کۆی ووشەی **(احسن)**ە، ئەمیش تەفزیلی وشەی ( **حسَن** )ە.

**أحاطَ** چواردەوریدا.

**أحَبّ** خۆشی ویست، دۆستی گرت.

**أحبَرَ** شادومان بوو.

**أحبَسَ** ڕای وەستاند، بەستیەوە.

**أحبَطَ** پوچەڵی کردەوە.

**أحبَـكَ** تەنـدو تـۆڵی کـرد و بـە ڕێـك و پێکی کردی.

**أحبُل** داوی ڕاوکەر.

● **أحتاجَ** ١/**اليه**: پێویستی پێی بوو.

**احتاطَ** وشیاری بە کاربرد، ئیحتیاتی کرد.

**احتالَ** ساڵی بە سەردا هاتەوە، ساڵێکی تەواو کرد.

● **اِحْتالَ** ١/**بِالدَّين**: قەرزەکەی خستە سەر شانی خۆی.

**احتِباس** میز هێشتنەوە لە ناو میزڵداندا، بۆ ماوەیەك میز نەکردن.

**احتَبَلَ** بەداو نێچیری گرت (لە ڕاودا).

**احتبی** بە چیچکەوە دانیشت، ڕان ولاقەکانی بەهۆی باڵەکانیەوە نابەسکیەوە.

● **إحتجَّ** ١/بەڵگەی هێنایەوە. ٢/**البیتَ**: زیارەتی حەجی کرد.

**احتِجاج** بەڵگە هێنانەوە، نارەزایی دەربڕین.

● **احتَجی** ١/**الشیءَ**: شاردیەوە، پەنهانی کرد.

**احتَجَبَ** خۆی شاردەوە.

**احتَجَزَ** سەردانی حیجازی کرد، هات بۆ وڵاتی حیجاز، کۆبویەوە.

**احقَدَّ** توند بوو، قینی هەستا.

**إحتَدَمَ** گەرم بوو (بۆ ڕۆژ)، زۆر سوور بوو (بۆ خوێن)، زۆر کوڵا (بۆ مەنجەڵ)، گەرم بو و لە ناو تورە بوون (بۆ پیاو).

**إحتَذی** پەیرەوی کرد، پێڵاوی لە پێ کرد.

**إحتِراف** پیشەوەری، هەڵبژاردنی پیشە، دەست ڕەنگینی.

**إحتِرام** ڕێز گرتن.

**إحتَرَثَ** بە دەستی هێنا (بۆ ماڵ و سامان)، هیلاکی کرد (بۆ وڵاخ).

**إحتَرَزَ** سڵەمایەوە، خۆی لێ پەنادا.

● **إحتَرَسَ** ١/پاسەوانی کرد، ڕووبەڕووی مەترسی بویەوە. ٢/**مِنهُ**: پاسەوانی لێکرد.

● **احتَرَشَ** ١/**الرَجُلُ**: فێڵی کرد. ٢/**الشیءَ**: کۆی کردەوە.

**احتَرَقَ** سوتا، ئاگر سوتاندی.

**احتَزَّ** بڕی، پارچەپارچەی کرد.

**احتَزَمَ** پشتێنی بەست، کەمەر بەندی بەست.

**احتَسَّ** دەستی لێدا، گرتی.

● **احتَسَبَ** ١/کومسایی هات، ژماردی. ٢/**ولداً لهُ**: بە گەورەیی منداڵێکی مرد.

**احتَشی** پڕی کرد.

**إحتَصَدَ** درەوی کرد، درویەوە، دروێنەی کرد.

**إحتضار** سەرە مەرگ، حاڵەتی سەرە مەرگی مرۆڤ.

**احتَضَرَ** ئاشکرا بوو، ئامادەی کرد.

**أحتُضِر** چوە حاڵەتی سەرە مەرگەوە.

**احتَضَنَ** لە باوەشی گرت، پەروەردەی کرد.

● **احتَفَّ ١/الشيءَ،** لەتی کرد، دەوریدا.

**إحتفال** ئاهەنگ، کۆبونەوە، ئاپۆرەدان.

**احتَضَر** زەوی هەڵکەند.

● **إحتَفَظَ ١/ئاراستی،** هەڵیگرت، پارێزگاری لێکرد. **٢/لنفسه،** بۆ خۆیی دانا، بۆ خۆیی هەڵگرت.

● **إحتَفَلَ ١/الوادي بالسيلِ،** لێوان لێوی ئاوی پێدا هات. **٢/القومُ،** کۆبونەوە، ئاهەنگیان گێڕا. **٣/المجلسُ بالناسِ،** پڕ بوو. **٤/الطريقُ،** ڕون بویەوە.

**إحتفی** پێی پەتی کرد.

● **احتَقَّ ١/القومُ،** هەر یەکێکیان گوتی: حەق لای منە. **٢/ت الطعنةُ بە،** دەست بە جێ کوشتی. **٣/ه الی كذا،** دوای خست.

● **إحتَقَبَ ١/فلانا علی ناقتە،** لەپاش خۆیەوە سواری کرد. **٢/الإثمَ،** کۆی کردەوە وەك ئەوەی لە پاش خۆیەوە هەڵیگرتبێت.

**إحتقار** بە سوك سەیرکردن، بەچاوی کەم ڕوانین.

**إحتَقَر** بە سوك سەیری کرد، بەچاوی سوکایەتیەوە نواڕی.

● **إحتَكَّ ١/ه رأسَهُ،** وای لێکرد بی خورێنێت، سەری هاتە خوران. **٢/بالشيءِ،** لێی خشا. **٣/بفلانٍ،** پەی برد بەڕاو بۆچونەکانی.

**إحتكار** پاوانکردن.

**إحتكاك** لێکخشان.

● **احتَكَمَ ١/علی فلانٍ،** ئەوەی دەی ویست داوای لێکرد. **٢/في الشيءِ،** بە ئارەزووی خۆی تەسەڕووفی تێدا کرد. **٣/الأمرُ،** توندو تۆڵ کرا.

● **احتَكی ١/ الأمرُ،** توند بوو.

● **احتَلَّ ١/**داگیری کرد. **٢/المكانَ وبالمكانِ،** تیایدا دابەزی، پێینایە ناویەوە.

**احتلال** داگیر کردن.

**احتَلَقَ** سەری چاك کرد، سەری تاشی.

**احتَلَمَ** شەیتانی ببوو، چوە ڕیزی پیاوانەوە.

**احتَمْ** ڕەش.

**إحتمـــال** ئەگـــەر، لەوانەيـــە (ئەگـــەری روداني هەر ڕووداوێك).

**احتَمَسَ** هەڵچوو.

●**إحتَنَكَ** ١/**الدهرُالرجلَ**: ئەزمونـەكانی ژیان كردیانە كەسێكی دانا. ٢/**ه**: دەستی بە سەردا گرت. ٣/**الجرادُ الارضَ**: ئـەوەی تیایدا بوو خواردی.

**احتوی** بە دەستی هێنا، دەستی كەوت.

●**أحتاطَ** ١/**الرجلُ**: كاروبارەكانی خـۆی پـێ كـەلێن كـردو بـە لامـسەرلایی وەری نـــەگرتن. ٢/**علـى الـشيء**: پارێزگـاری لێكرد. ٣/**به**: لـە هـەموو لایەكیـەوە لێـی نواڕی و پارێزی لێ وەرگرت.

**احتیـاطی** هەرچی شـتێك یـەدەگ كـرا بێت.

●**أحجَـــمَ** ١/**عـــن الـــشيء**: دەســـتی لێ هەڵگرت. ٢/**ت المرأةُ للمولود**: گۆشی كرد، یەكەم شیری پێدا. ٣/**الثدیُ**: بناغەی دانا، كاتێـــك ئـــەو دەســـتەواژەیە بـــەكار دەهێنرێت كـە ئـافرەت تـازە مەمكـەكانی بناغــە دادەنــێن و بــەرز دەبنــەوە لــە سنگیەوە.

**أَحْجَنْ** لارو خێچ.

●**أَحَدَّ** ١/**السكینَ**: تیژی كرد. ٢/**ت المرأةُ**: لــە دوای مردنـــی مێردەكـــەی وازی لـــە جوانكاری هێنا. ٣/**الیه النظرَ**: زۆری بـۆ ڕوانی، بـە تیـژی چاوی تێبڕی. ٤/**ه**: بـە یەكتایی ڕایگرت.

**أحَد** یەكەم، بێ هاوتا.

**أحْدَب** پشت چەماو، پشت كۆم.

**أحْدَثَ** هێنایە ئاراوە، دۆزیەوە.

●**أحدَدَ** ١/**ه**: ناردیـە خـوارەوە. ٢/**القراءةَ والنهيَ**: پەلەی تێدا كردن.

**أحْذَر** ئەسپی پڕ گۆشت، بەخۆوە بوو.

●**أحـدَقَ** ١/چواردەوری دا. ٢/**القوم به**: دەوریان دا. ٣/**ت الروضةُ**: بویە باخچە.

**احدوثة** هەر شتێك قسەی پێ بكرێـت، هەرچی قسەی لە سەر بكرێت.

**احْـــدَودَبَ** پـــشتی چـــەمایەوە، پـــشتی كۆمایەوە.

**أحَدیّة** یەكتایی.

**أحَذّ** خێرا.

●**أحذی** ١/**ه**: بەشێك لە دەستكەوتەكەی پێدا. ٢/**ه طعنةً**: تیغی لێدا.

**أحَرّ** گەرمی كرد، گەرم بوو.

**احــراز** تونـدو تـۆڵ كـردن، بـە دەسـت هێنان.

●**أحْرَبَ** ١/**فلاناً**: ڕێگـەی نیشاندا چۆن دەستكەوت لە دوژمن دەگرێت. ٢/**الحربَ**:

دنـــەی دا ( هەڵیگرســـاند). ٣/ الشغـــلَ: سەری دەرهێنا (دەرهات).

●أخْـــــرَجَ ١/هـ: خـــستیە گوناهـــەوە، تەنگـەتاوی کـرد، خـستیە تەنگەڵانـەوە.

٢/عليه الأمرَ: یاساغی کرد لە سەری.

●أخْـــرَدَ ١/هـ: بـە تـەنهای دانـا، تـاکی کردەوە. ٢/في المشي: پەلەی کرد.

اخْـــرَزَ بـــە دەســـتی هێنـــا و ناوبـــانگی دەرکرد.

اخْرَشَ زبر.

●احـــرَضَ ١/هـــانی دا. ٢/ه الحـــزن او المرض: لەشی تێکدا.

اخْرَقَ سوتاندی.

اخْرَمَ پێی نایە مانگە یاساغەکانەوە.

●احـــزَنَ ١/الرجـــلَ: خەفـەتی پێـــدا، خەفـەتی خـوارد یـاخود بـە دڵتەنگیـەوە گەڕا.

●احزَى ١/بالشيء: پێـی زانـی. ٢/الشيئ: بەرزو بڵند بویەوە.

أحَسَّ هەستی کرد.

احساس هەست، سۆز.

أحسَدَ ڕژدی برد.

أحسَمَ پیاوی کار یەکلاکەرەوە.

أحسَنَ چاکەی کرد.

●أحسَنُ ١/چاکتر، باشـتر. ٢/ك: ئافـەرین بۆ تۆ، ئافەرینت کەم.

●أحَشَّ ١/پەلەی کرد. ٢/ت اليدُ: وشکە وە بـوو لـە ئـێش کـەوت. ٣/ت الناقةُ او المرأةُ: کۆرپە لە سکیدا وشکەوەبوو.

●أحـشَدَ ١/القومُ: بـۆ یـەك مەبەسـت کۆبونەوە و ئاپۆڕەیان بەست.

أحشُوش کۆرپەی وشـەکەوە بـوو لـە نێـو سکی دایکدا.

●أحَصَّ ١/هـ: بەشی خۆی پێدا. ٢/المكانَ: تیایدا دابەزی.

أحَـصَّ پیـاوێ مـوی سـەری کـەم بێـت، پیاوێك مـوو لـە سـەر سنگی نـەڕوابێت، ڕۆژێـــك زۆر ســـارد بێـــت و هەوریـــشی نەبێت.

●احـــصاء ٢/ئامـــار. ٢/النفـــوس: ســـەر ژمارکردنی هاوڵاتیان.

●أحصَبَ ١/عنه: پـشتی تێکـردو وازی لێ هێنا.

أحصَدَ ڕومکێك گەیبێت و وشـکە وەبـوو بێت و کاتی دروەی هاتبێت.

●أحصَرَ ١/ه عن السفر: قەدەغـەی کـرد لێی.

احصَنَ قایمی کرد.

أحصى ژماردی، ئاماری کرد.

**أحضَرَ** ئامادەی کرد.

● **احطَبَ ١**/داری کۆکردەوە بۆ سوتاندن. **٢/المكان**: داری سوتاندنی تێدا زۆر بوو.

**احَظَّ** بەهرەمەند بوو، بەخت یار بوو.

**أحظَرَ** چوە پەناوە، پەنای گرت.

**احضى** فەزلێدا بە سەریدا.

**احَفَّ** بە خراپ باسی کرد.

**احفَدَ** خێرای کرد.

**أحفَرَ ١/هُ** یارمەتی دا لە هەڵکەندندا.

**أحَقَّ** ڕاست و دروستی گوت.

● **أحْقَبَ ١/هُ**: لە پاشکۆی خۆیدا سواری کرد. **٢/الأمرُ**: گەندەڵ بوو. **٣/العام**: ساڵ بێ باران بوو.

**أحقَب** کەری وەحشی، گوێ درێژی کێوی.

**أحقَدَ** کردیە مرۆڤێکی قین لە دڵ ورقاوی.

**احقَرَ** سوکی کرد، بەسوك سەری کرد.

**أحقَنَ** شیری کۆکردەوە.

● **أحَكَّ ١**/خوراندی. **٢/الكلام في صدره**: چوە دڵیەوەو کاری لێکرد.

**أحَكَ** بێ ددان، کەسێك ددانی لەدەمدا نەبێت.

● **أحكَمَ ١/ تهُ التجاربُ**: ئەزمون ژیری کرد(کردیە دانا). **٢/الشيءَ**: ڕێك وپێکی کرد. **٣/هُ**: گێرایەوە وبەری پێگرت وقەدەغەی کرد لێی.

● **أحَلَّ ١/الشيءَ**: حەڵاڵی کرد، لە پە یمان وبەڵێن دەرچوو، پێی نایە مانگە حەڵاڵەکانەوە.

● **احلا ١/هُ**: شیرینی کرد.

**أحلَبَ** شیری دۆشی، هاوکاری کرد بۆ دۆشینی شیر.

**أحْلَس** سوری تۆخ، سوری ڕەش باو.

**احلَفَ** سوێندی دا، سوێندی پێ خوارد.

**اُحلُوفَة** سوێند.

**إ حلَولى** شیرین بوو.

**إحليل** ڕێڕەوی هاتنە دەرەوەی شیر لە مەمکدا، ڕێڕەوی میز لە مرۆڤ دا (لە نێرینەی مرۆڤ) دا.

● **أحَمَّ ١/الشيءُ**: نزیك بویەوە. **٢/الشيءَ**: ڕەشی کرد.

**أحَمّ** چاکترین، ڕەش و سپی، تایبەترین و نزیکتر.

**احمارّ** کەم کەم ڕەنگی سوربوو، سور هەڵگەڕا.

**احماض** گۆڕرانی مرۆڤ لە جدیەتەوە بۆ شۆخی کردن، زۆر سوعبەت کردن.

**أحمَدَ** کارێکی سوپاس ئاوەری کرد، کارێکی کرد شایستەی سوپاس بوو.

**أحمَرَّ** رەنگی سور بوو لە شەرمەزاریدا.

**أحمَر** سور.

**احمــران** تــەلاو زەعفــەران، گۆشــت و نارەق.

**احمَرِيّ** زۆر سور.

**احمَسَ** تورەی کرد، هەڵیچاند.

**احمَس** پیاوی ئازاو چاو نـەترس، پیاوی خـوێن گـەرم و بـە غـیرەت لـە دیـن و جەنگدا.

**احمَش** لاق باریك.

**احمَضَ** ترشی کرد، ترشاندی.

● **احمَقَ ١/ه**: بـە بـێ عـەقڵ ناسی. **٢/ت المرأة**: منداڵێکی بێ عەقڵی بوو.

**احمَق** گەمژۆکە، بێ عەقڵ.

● **احمَلَ ١/ه**: یارمـەتی دا لـە هـەڵگرتنی باردا.

**احمُوقَة** کەرۆکەیی، زۆر بێ عەقڵ.

**احمــی** هێنـدەی گـەرم کـرد تـا سـور بویەوە، داخی کرد.

**أحَنَّ** هەڵەی کرد.

● **أحــنَطَ ١/الــزرع**: کـاتی درەو کردنــی هات. **٢/الميت**: مۆمیای کرد.

**احنَف** کەسێك قاچەکانی بەرەو نـاوەوە لاربن.

**أحنَفَ** تورەی کرد.

**أحوَبَ** بە لای گونـاهکردن دا دەشکایەوە، بەرەو گوناهکردن سەری دەخورا.

● **أحوَجَ ١/اليه**: پێویستی پێی بوو. **٢/ه**: نەداری کرد.

**أحوَج** هەژار، نەدار، زۆر بێ دەستەڵات.

**إحوَرَّ** سپی بوو.

**أحوَرِيّ** سپی نـەرم و نۆڵ.

**احوَس** گورگ.

**احوَص** کەسێك قنگی چاوی تەسك بێت وەك ئەوەی دوورابێتەوە.

**أحوَط** کەسێك زۆر ئیحتیات بکات.

● **أحــوَلَ ١/الــصبيُّ** سـاڵی تــەواو کــرد، چاوی لار بوو.

**احــوَلْ** زۆر فێڵبـاز، کەسـێك چاوی خێـل بێت.

**أحــوى** رەش، گـزوگیای رەنـگ سـەوزی رەش باو.

● **أحيـا١/ه**: زینـدووی کـردەوە. **٢/النارَ**: هێنـدەی فـوو پێـدا کـرد تـاکو هەڵگیرسـا. **٣/الليلَ**: تیایـدا هەسـتاو نەخـەوت، شـەو بێدار بوو.

**أحيَــف** زەمینـی بـێ بـاران، جێگەیـەك بارانی لێ نەباریبێت.

**أحيَل** زۆر فێڵ باز.

**انبَهَرَ** هەناسەی لە بەر بڕا بە هۆی هەوڵی زۆرەوە، هەناسەبڕکێی پێ کەوت لە بەر خۆ ماندوکردن.

**انتاج** بەرهەم، بەروبوم.

**انتباه** ئاگادار بوون، ئاگاداری، زیرەکی، هۆشیاری، بەئاگابوون، وردە کاری.

**انتَبَثَ** دەری هێنا، خستیە ڕوو، ئاشکرای کرد.

● **انتَبَذَ ١/المنبه** بویە شەربەت. ٢/**عن القوم** دورکەوتەوە لێیان. ٣/**فلان** گۆشەنشین بوو ولەخەڵك دورکەوتەوە.

**انتَبَشَ** دەری هێنا، دەری کێشا.

● **انتَبَلَ ١**/مرد. ٢/**فلاناً** کوشتی. ٣/**الشيء** بە یەکجار هەڵیگرت. ٤/**للأمر** ئامادە بوو بۆی.

**انتَبَهَ ١**/لەخەو هەستا، لەخەو ڕاچەنی، لە خەو بێدار بویەوە، لە خەو ڕابوو. ٢/ **للأمر** سەرنجیداو لێی بە ئاگابوو.

● **انتَتَرَ ١/الشيء** ڕای کێشا یان بە توندی هاویشتی و توڕیدا.

● **انتَتَفَ ١/الريش** هەڵی کەند، هەڵی کێشا.

**انتَثَلَ** پێشکەوت.

● **أنتَجَ ١**/بەرهەمی هێنا. ٢/**الله** حوج وشتری ئاوسیان هەبوو یان وشتروچوارپێ کانیان زان.

**انتَجَبَ** هەڵی بژارد.

● **انتَجَعَ ١/القوم** ڕۆشتن بۆ بە دەست هێنانی گژوگیا چ بە تەڕی یان بە وشکی.

● **انتَجَلَ ١/الأمر** ڕۆشن بویەوە.

**انتحار** خۆکوشتن، ئەوەیە کەسێك بە دەستی خۆی کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێت و خۆی بکوژێت.

**انتَحَبَ** بە کوڵ گریا، زۆر گریا.

● **انتَحَرَ ١/الرجل** خۆی کوشت. ٢/**القوم** دژایەتی یەکیانکرد. ٣/ **السحابة** بارانێکی زۆری لێباری.

● **انتَحَلَ ١/مذهب كذا او قبيلة كذا** خۆی دایە پاڵ فلان ڕێباز یاخود فلان هۆز. ٢/ **الشعر** هۆنراوەکەی کرد بەمڵکی خۆی لە کاتێکدا یەکێکی ترخاوەنیەتی.

● **انتَحى ١/له** پشتی پێبەست و خۆی خوار کردەوە بە لایدا.

**إنتخاب** هەڵبژاردن.

**انتخابي** هەر شتێك بە هەڵبژاردن بەڕێوە بربێت، هەر مەسەلەیەك بدرێتە پاڵ هەڵبژاردن.

• اِنتَخی ١/علینا: کەشوفشی کرد بە سەرماندا، شانازی کرد بەسەرماندا، لوت بەرزی نواند لەبەرانبەرماندا.
• اِنتَخَبَ ١/الشئ: هەڵی بژارد.
اِنتِداب ئینتیداب، سیاسەتێکی ئیمپریالیستی ڕۆژئاواییەکان بوو بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەداگیرکراوەکانی ژێردەستەڵاتیان.
• اِنتَزَعَ ١/الشئ: بچڕی، هەڵی کەند، لێی دورکەوتەوەو دەستی لێ هەڵگرت.
اِنتَزَیَ هەڵپەی کرد بۆ خراپەو شەڕ، پەلەی کرد بۆ شەڕ.
• اِنتَسَأَ ١/عنه: دواکەوت. ٢/ت الإبل في المرعی: دورکەوتنەوە لە یەکتر.
اِنتِساب نیسبەت دانە پاڵ، پەیوەستەگی وسەرپێبون.
• اِنتَسَبَ ١/الرجل: ڕەچەڵەکی خۆی دەرخست.
• اِنتَسَجَ ١/الثوب: چنی. ٢/الکلام: کورتی کردەوە، هەڵی بەست.
• اِنتَسَخَ ١/الشئ: لای برد، سڕیەوە. ٢/الکتاب: گواستیەوە. ٢/الشئ الشئ: شوێنی گرتەوە.
• اِنتَسَفَ ١/الشئ: لە بێخو بنج و بنەوە هەڵی کەند.

اِنتَشَرَ بڵاو بویەوە، پەرِاکەندە بوو.
• اِنتَشَطَ ١/الشئ: توندو تۆڵی کرد. ٢/ت الحیّة فلاناً: گەستی، پێوەیدا.
إِنتَشَفَ توێژی شیرەکەی خوارد، ئەوچەوراییەی خوارد کە دەکەوێتە سەر شیر.
اِنتَشی سەر خۆش بوو، مەست بوو.
• اِنتَصَّ ١/الشئ: بەرزبویەوە، بڵند بویەوە. ٢/ت العروس: لە سەر کورسی دانیشت.
اِنتِصار سەرکەوتن، سەرکەفتن، بە کام گەیشتن لە دۆزومەبەستا.
اِنتَصَبَ هەستایەوە و ڕاست بویەوە، بە پێوە ڕاوەستا.
اِنتَصَرَ ١/سەرکەفت، سەرکەوت، ڕزگاری بوو لەدەست ستەمکار. ٢/من عدوه: تۆڵەی لێ کردەوە.
• اِنتَصَفَ ١/ڕۆژ گەشتە نیوە، بویە نیوەڕۆ. ٢/الشئ: نیوەیی برد، کردیە دووبەش.
اِنتَضَدَ لەجێگەیەکدا مایەوە وسەقامگیربوو.
اِنتَطَقَ قسەی کرد، دووا.
اِنتَظَرَ چاوەڕوانی کرد.
اِنتَظَمَ ڕێك و پێك بوو.

**اِنْتَعَ** زۆر ئارەقی کردەوە.
**اِنْتَعَشَ** بوژایەوە، چالاك بویەوە لە دوای مت بوون، سەری بەرزکردەوە، ژیایەوە.
**اِنْتَعَلَ** کەوشی لە پێ کرد، نەعلی لە پێ کرد.
●**اِنْتَفَشَ ١/الشئ:** جموجـوڵی کـردو پێکداهات.
●**اِنْتَفَجَ ١/**بەرزبویـەوە، بڵندبویـەوە. **٢/الرجل:** شـانازی بەشـتێکەوە کـرد کەتیایدا نیە.
●**اِنْتَفَخَ ١/**هەڵاوسـا، ئاوسـا، هـەلکفی. **٢/الشئ:** بەرزبویەوە. **٢/الرجل:** شانازی کردو لوت بەرزی نواند.
●**إنْتَفَضَ ١/** راپـەڕی. **٢/الفصيلُ ما في الضرع:** بـە مـژین گوانەکـەی خـاڵی کردەوە.
●**اِنْتَفَحَ ١/الى:** ڕۆشت بەرەو ئەوجێگەیە، بایدایەوە وگەڕایەوە بەرەو ئەوجێگەیە.
**اِنْتَقَدَ** ڕەخنـەی گـرت و ناتەواویـەکانی دەرخست.
●**اِنْتَفَدَ ١/الشئ:** لە نـاوی بـرد، بـەربادی کرد.
**اِنْتَفَعَ** سودی وەرگرت، سودمەندبوو.
**اِنْتَفَقَ** چویە نێو تونێلەوە، بـە ڕێگـەی تونێلدارادا ڕۆشت.

**اِنْتَفَلَ** سوێندی خوارد.
●**اِنْتَفَى ١/عنه:** دورکەوتەوە. **٢/الشعرُ:** هـەڵومری، ڕوتایـەوە. **٣/من ولـده:** بـێ بەری کرد لەوەی کوڕی بێت.
**اِنْتَقَ** ژنێکی منداڵداری مارەکرد، ژنێکـی هێنا کەمنداڵی زۆربوو.
**اِنْتِقَاد** ڕەخنە گرتن.
**اِنْتِقَـال** جـێ گۆڕکـێ، ئـاڵ وگـۆڕکردن لەجێگەیەکەوە بۆجێگەیەکی تر.
**اِنْتِقَالي** ڕەفتەنی، ناجێگیر.
**اِنْتِقَـام** سـزادان، تۆڵـە کردنـەوە، تۆڵەسەندنەوە.
**اِنْتَقَـدَ** ڕەخنـەی گـرت، ناتەواویـەکانی دەرخست.
●**اِنْتَقَـرَ ١/ه:** هـەڵی بـژارد. **٢/الشئ:** نوسی، بە دوایدا گەڕا. **٣/ت السولُ نقراً:** چاڵێکی هەڵکەند ئاوی تێدا وەستایەوە. **٤/القوم:** هەنـدێکیانی بانگهێـشت کـردو هەندێکیانی بانگهێشت نەکرد.
●**اِنْتَقَصَ ١/الشئ:** ناتـەواو بـوو، کـەمی هێنـا. **٢/الرجل:** لـە شـان و شـکۆی کـەم کردەوەو لەکەداری کرد.
●**اِنْتَقَلَ ١/من مكان الى آخر:** جێگۆڕکێی کرد، لەملا ڕۆشتە ئەولا، گواستیەوە. **٢/ فلان الى رحمة الله:** مـرد، کۆچـی دوایـی

کـرد. ٣/الفـرسُ: قاچـی خـسته شـوێن دەستەکانی لە کاتی ڕۆشتنندا.

●انـتَقَمَ ١/منـه: سـزای دا، تۆڵـەی لێ کردەوە.

●انتقی ١/ه: هەڵی بژارد.

●انتَكَتَ ١/فلانا: بە سەردا خستی.

●انـتَكَسَ ١/سـەرنگون بـوو، کـەوت بـە سـەر سـەردا. ٢/المـريضُ: سـەر لـەنوێ نەخۆش کەوتەوە.

●انتَكَشَ ١/البئرَ: هەرچی فورێکی تێدا بـوو هێنایـە دەرێ، بیرەکـەی پـاککردەوە.

●انتَكَفَ ١/اليه: خـوار بویـەوە بەلایـدا. ٢/القوم: لە سەرزەمینێکەوە دەرچون بۆ سەرزەمینێکی تر.

أنتم ئێوە، هێوە (ڕاناوی سەربەخۆیە بۆ دواندنی کۆمەڵێك).

أنتمـــا ئێـــوە هــەردوکتان ( ڕانـــاوی سەربەخۆیە بۆ دواندنی دووکەس).

انتمـــــاء پەیوەســـــتی، دڵبەنــــدی، سەرپێبوون.

●انتَمـــی ١/الی ابیـــه: نیـــسبەتی خـــۆی پەیوەست کرد بەباوکیەوە. ٢/البازي: لە جێگــەی خۆیـــەوە بەرزبویـــەوە بـــۆ جێگەیەکی تر.

أَنتَ تۆ، ڕاناوی سەربەخۆیە بۆ دوانـدنی کەسی دووەمی تاکی نێر.

أَنتِ تۆ، ڕاناوی سەربەخۆیە بۆ دواندنی کەسی دووەمی تاکی مێینە.

انتَوَرَ نورەی لە خـۆی هەڵساوی(نـورەش بریتیـە لـە بـەردی کلـس وهەنـدێك تێکەڵەی تری وەك زێڕ بۆ لابردنـی مـوو باشە).

●انتَـوی ١/القوم بموضع کذا: تیایـدا نیشتەجێ بوون. ٢/القوم: لـە وڵاتێکـەوە گواستیانەوە بۆ وڵاتێکی تر.

انتِهازِیّ هەلپەرست، فۆزمرەوەی هـەل و دەرفەتەکان.

●انتَهَبَ ١/النهبَ: بردی، تاڵانی کرد.

انتَهَجَ ڕێکەی ڕۆشـن وراستی گرتەبـەر، بەرێگەی ڕون ورەواندا ڕۆشت.

●انتَهَـــزَ١/الفرصـــةَ: قۆسـتیەوە. ٢/في الـضحك: زیـــادەڕەوی کـــردو ناشـــرین پێکەنی.

انـــتَهَضَ هەســـتا، هەســـتایە ســـەرپێ، ڕاچەنی.

●انتَهَكَ ١/الحرمةَ: پێشێلی کـرد، ڕێـزی لێنەگرت.

●اِنتَهى ١/كۆتایی هات، تەواوبوو. ٢/مِن الشیء: دەستی هەلگرت، دەستبەرداری بوو.

●اَنَّثَ ١/ه: بە مێینەی لە قەلەمدا، کردیە مێینە.

●اَنْثَرَ ١/چلمی داکرد. ٢/الکلام: کردیە پەخشان.

●انثَلَمَ ١/الحائط: کەلێن وناتەواوی تێکرد، درزی تێدا دروستکرد.

●أنثَى ١/فلانا: لە پاشملە باسی کرد، غەیبەتی کرد.

اُنثَى مێ ومێینە.

اِنجاز بە دەست هێنان، ئەنجامدان، تەواوکردن، ئەمەك کردن بە پەیمان و بەلێنەوە.

اَنجاس نوشتە یان هەر شتێکی تر، چاومزار یان هەرشتێکی تر کەبۆپاراستن هەلبواسرێت، شتەپیسەکان(وشەکە جەمعە).

اِنجاث سوپەر، قەلغان، پەردەی دەرەوەی دل (وشەکە جەمعە).

●اَنجَبَ ١/الرجل: مندالێکی بە شەرم وشکۆی بوو.

اِنجَبَرَ لە دوای شکان چاك بویەوە.

●اَنجَدَ ١/الرجل: نزیك کەوتەوە لەخاوخێزانی خۆی. ٢/ه: یارمەتیدا، هاوکاری کرد، کۆمەکی پێکرد.

اِنجَدَمَ بڕا، پارمپارە بوو.

اِنجَدَّ شکا، پارمپارە بوو.

اِنجَذَبَ پەلەی کرد لە ڕۆشتندا.

اِنجَذَرَ هەلکەنرا، لە بێخەوە دەرکێشرا.

اِنجَرَّ ڕاکێشرا.

اَنجر، اَنجَرة لەنگەری کەشتی.

●اَنْجَرَ ١/فلانا: چێشتی (نَجیرة) ی پێشکەش کرد (نَجیرة)ش چێشتێکەلە شیرو ئارد ورۆن دروست دەکرێت.

●اِنجَرَدَ ١/الثوب: پوارتکاو کۆن بوو، پورتوکا.

●اَنجَزَ ١/الوعد: بەئەمەك بوو بەرانبەر بەلێنەکە، پەیمانی خۆی بردە سەر.

●اِنجَزَمَ ١/العظم: شکا.

●اَنجَسَ ١/ه: پیسی کرد، پلۆخیکرد، چەپەلی کرد، گەماری کرد، چلکنی کرد.

اِنجَعَفَ هەلکێشرا، لە بێخەوە هەلکێشرا.

●اِنجَفَلَ ١/القوم: بە هەلەداوان ڕایان کرد، بە پەلە ڕایان کرد.

اَنجَل، نَجلاء پان وپۆڕ ودرێژ لەهەر شتێك، پیاوی چاوپان، ژنی چاوپان.

**اِنجلی** ئاشكرا بوو، له تاریكیەوه هاته دەرەوه بۆ ڕۆشنایی.

●**أنْجَمَ ١/الرجلُ عن الأمر،** وازی لێ هێنا، دەست بەرداری بوو. **٢/تـ الحربُ،** كۆتایی هات.

**اِنجیل، اَناجیل** پەرتوكی ئاسمانی مەسیح (علیه السلام) كه لەدوای خۆی شێوێندراو كرایه پێنج ئینجیل.

**اَنجازَ** گەڕایه دواوه، كۆچی كرد.

**اِنحَتَّ** هەڵوەری، كەوته خوارەوه، داخورا.

**اِنحَدَرَ** دابەزی و هاتەخوارەوه، لەبەرزاییەوه شۆڕبویەوه.

**اِنحَرَدَ** تاك بویەوه.

**اِنحَرَفَ** كەچ بوو، خوار بویەوه، لایدا.

●**اِنحَسَرَ ١/الشيءُ،** دەركەوت، ئاشكرا بوو.

●**اِنحَصَّ ١/الشعرُ،** هەڵوەری، كەوته خوارەوه، ڕوتایەوه.

**اِنحصار** سنوردارێتی.

**اِنحَصَرَ** هاتەوه یەك و گەمارۆدرا.

●**اِنحَطَّ ١/السعرُ،** هەرزان بوو، هاته خوارێ.

**اِنحطاط** داڕوخان، هەرەس.

**اِنحَطَمَ** تێك شكا.

●**اَنحَفَ ١/ه،** سستی كرد، لاوازی كرد.

**اِنحَلَّ** هەڵوەشایەوه، شی بویەوه.

●**اِنحَلَ ١/فلاناً المالَ،** ئاوی پێدا.

**اِنحَلَمَ** خەوی بینی.

●**اِنحَمَقَ ١/**بێ ئەقڵ بوو، كاری بێ ئەقڵانەی كرد. **٢/الثوبُ،** كۆن بوو. **٣/السوقُ،** بێ ڕەواج بوو.

**اِنحَنَی** كووڕ وخواربویەوه، چەمایەوه.

●**اَنحی ١/علیه،** پشتی پێ بەست.

●**اِنحازَ ١/القومُ،** جێگەكانی خۆیان چۆڵكرد.

●**اِنخَدَعَ ١/**هەڵخەڵەتا، فریوی خوارد. **٢/تـ السوقُ،** بێ ڕەواج بوو.

**اِنخَذَلَ** شكستی خوارد، سەری شۆڕبوو.

**اِنخَرَقَ** دڕا، شیتاڵ شیتاڵ بوو.

●**اِنخَرَمَ ١/الثقبُ،** دڕا، هەڵدڕا.

**اَنخَع** سەر شۆڕتر، سەركوت كراوتر، چەوساوەتر.

●**اِنخَفَضَ ١/**دابەزی، نزم بویەوه. **٢/الصوتُ،** نزم بویەوه، كز بوو.

**اِنخَلَعَ** له جێگەی خۆیدا نەما، لەجێگەی خۆی دوركەوتەوه.

**اِنخلی** گیای تازەی بڕی، گیای تازەی دەستەڕن كرد.

●**اَنخَنَثَ ١/الرجلُ،** نەرم و نیان و مەكرباز بوو، بەشێوه پیاو بوو

لەسروشت و هەڵس و کەوتیدا لە ژنان دەچوو، ژن ڕەفتاربوو.

**اِندَثَرَ** مەحووبویەوە، پوکایەوە.

**اِندَخَلَ** چوە ناوەوە.

**اَندَرَ** کردەوەو گوفتاری نامۆو دەگمەنی لێوە شایەوە.

● **اِندَرَجَ ١/فِي الشيء** چوە ناوئەوشتەوە، خۆی ئاخینە ناویەوە.

**اِنرَسَ** لە خاکدا شاردیەوە.

**اِنــــدَعَى** وەڵامـــی دایـــەوە، بـــەدەم داواکاریەوە چوو.

● **اَندَفَ ١/الكلب** ئاوی پێدا.

● **اِندَفَعَ ١/الفرسُ** غاری کرد.

● **اِنْدَفَقَ ١/الماءُ** ڕژا، بەتەکان لەبەری ڕۆشت.

● **اِندَقَّ ١/ت عنقه** ملی شکا.

● **اِندَكَّ ١/الحائط** ڕوخاندی تاکو لەگەڵ زەوی دا کردنیە یەك.

● **اِنذَلَّ ١/الى الشيء** ڕێی نیشاندا.

● **اَندَمَ ١/ه** پەشیمانی کردەوە، پاشگەزی کردەوە.

**إنـــــدِماج** ناوێتـــەو تێکـــەڵاوبون، پەیوستەگی.

● **إنـــدَمَجَ ١/فِي الـــشيء** چـــوە ناویـــەوە وناوێتەی بوو.

● **اِندَمَلَ ١/الجرحُ** چاك بویەوە.

**اَندَى** تەڕو نمناك بوو.

**اِنذار** ئاگادار کردنەوەی پێش وەخت.

● **اَنذَرَ ١/ه بالأمر** ئاگاداری کـردەوە لـە سەرەنجامەکانی.

**اِنزَرَقَ** کەوت بە سەر پشتدا.

**اَنزَعَ** کەسێك مومکانی لاتەنیشتی سـەری ڕوتابێتەوە.

● **أنــــزَلَ ١/الـــشيء** دای بەزانـــد. ٢/الله الكلام ناردیە خوارەوە.

**انـــزِلاق** داخزانـــی بڕبڕەکـــانی پـــشت، داخزان و هەڵخلیسکان.

**انزَلَقَ** خزا، داخزا، هەڵخلیسکا.

**انزَوى** دورکەوتەوە.

● **اَنـسَ ١/بـه** خـوی پێـوە گـرت و دڵـی سوکنایی پێ هات.

**انس** مرۆ، مرۆڤ، ئادەمیزاد، بنیادەم.

**اَنَسَ** کۆمەڵێکی زۆر.

**إنساعَ** توایەوە، تاوایەوە.

● **إنْساقَ ١/ت الإبل** یەك بـەدوای یەکـدا چوون.

● **إنسان ١/**مـرۆڤ ئـادەمیزاد. ٢/**العَـين** ڕۆشنایی چاو.

**إنسانيّة** مرۆڤايەتی، مرۆیی، هەرچی خەسڵەتێك كە تایبەتە بەمرۆڤەوە، ڕێچكەیەكی فەلسەفیە، هیومانیزم.

**إنستَّرَ** داپۆشرا، شاردرایەوە.

**إنسِجام** ڕۆبوونی ئاو، لەبەر ڕۆشتن ورەوان بوونی ئاو، لای زمانەوانان بەوە لێك دەدرێتەوە كە قسە خاڵی بێت لە گرێ وگۆڵ وجێگەی خۆی لە دڵدا بكاتەوە وكار لەمرۆڤ بكات وپێكهاتەیەكی سادەو ساكاری هەبێت، گونجان.

**إنسِحاب** كەنارگیری، پاشە كشە، گەڕانەدواوە.

**إنسَحَبَ** ڕاكێشرا بەسەر ڕوی زەویدا، گەڕایەوەدواوە، پاشەكشەی كرد.

● **إنسَحَقَ ١/** هاڕدرا، سەركوتكرا. **٢/الشيءُ:** دوركەوتەوە، فراوان بوو.

**إنسَدَّ** داخرا.

● **إنسَرَبَ ١/الماءُ:** ڕژا، لەدەفرەكەوە ڕژا.

● **إنسَرَقَ ١/ت مفاصِلهُ:** جومگەكانی لاوازبوون.

**إنسَطَلَ** مەست بوو، سەرخۆش بوو.

**آنسَغَ** ڕوا وسەوزبوو.

**إنسَفَكَ** ڕژا، داچۆڕا.

**إنسِكاب** ڕژان، لەبەر ڕۆشتنی ئاو.

**إنسَلَی** بێ خەم وپەژارە بوو، خەمی ڕەویەوە.

**أنسُولِين** دەرمانێكە بۆچارەسەركردنی نەخۆشی شەكرە بەكاردەهێنرێت.

● **أنْسَى ١/الرجلَ الشيءَ:** لەبیری بردەوە، وایلێكرد لەبیری بچێتەوە.

**إنشَأَبَ** تێكەڵاوبوو، ئاوێتەبوو.

**أنشاط، إنشاط** بیرێك هێندە قوڵاییەكەی كەم بێت بە یەك تەكان دڵۆچەكەی بەپڕلە ئاوی بێتەدەر.

● **أنشَأَ ١/هُ:** پەروەردەی كرد، پێی گەیاند، دایمەزراند.

**إنشاء** هونەری نوسین وداڕشتن.

● **أنشَبَ ١/هُ:** هەڵی واسی.

● **إنشَخَبَ ١/اللبنُ:** دۆشی، شیری دۆشی. **٢/اللبنُ:** ڕژا، لەگوان هاتەخوارێ.

**أنشَدَ** هۆنراوەی خوێند، هەڵبەستی خوێندەوە، سرودی گوت.

● **أنشَرَ ١/اللهُ الميتَ:** زیندوی كردەوە، گیانی كردەوە بەبەریدا. **٢/الأرضَ:** بەناو زیندوی كردەوە.

**إنشِراح** گوشاد بوون، كرانەوەی دڵ ودەرون وخۆشحاڵی، وشادبوونی سینگ.

**إنشَرَجَ** شكا و بووبە دووكەرتەوە.

● إنشَرَمَ ١/هەڵاهەڵابوو. ٢/الصيدُ: بەزامداری دەربازبوو.

● أنشطَ ١/هُ: چالاکی کرد.

● إنشَعَبَ ١/عنهُ: لێی دورکەوتەوە. ٢/ت اغصانُ الشجرة: لەبنەڕەتی دارەکەوە پەل وپۆی لێ جیابویەوە. ٣/الطريقُ: چەند لق و ڕێیەکی لێبویەوە.

إنشَغَفَ بویە دیلی خۆشەویستی و ئەڤینداری.

● أنشَفَ ١/هُ: بەرکولی چێشتی بەگەرمی پێدا، بەگەرمی لەقابلەمە خواردنی بۆدەرهێنا وپێیدا.

أنشَقَ بۆنی کرد.

إنشَقَّ پەرتەوازە بوو، پارچە پارچە بوو، لەت بوو.

● إنشَلَّ ١/السيلُ: لافاوەکە بەلاوازی دەستی بەهاتن کرد. ٢/اللصُّ: کەوتە ناو ڕانەمەڕەوە.

● إنشَمَرَ ١/بەخێرایی یان بەفیزەوە ڕۆشت. ٢/للأمرِ: خۆی بۆئامادەکرد.

إنشَمَلَ پەلەی کرد، خێرای کرد.

أُنشُودَة ئەو هۆنراوەیەکە کۆمەڵێك لەستایشدا یان لەسەرکۆنەکردندا دەیخوێننەوە.

● إنْصاتَ ١/گوێی گرت، گوێی شنەوت. ٢/الرجلُ: لەدوای چەمانەوە باڵای ڕێك وڕاست وەستایەوە. ٣/بە الزمانُ: ناوبانگی پەیداکرد، ناودار بوو.

إنصاف ویژدان وپیاوەتی ودادگەری.

أنصَب ئاژەڵێك قۆچ (شاخ) ە کانی ڕاست وڕێك بن.

إنصَبَّ ڕژا، لەبەری ڕۆشت، داچۆڕا.

● أنصَتَ ١/هُ: بێدەنگی کرد، دەمی پێ داخست.

● إنصَدَعَ ١/دڕا، لەت و پەت بوو. ٢/ت رحلە: هەڵخزاو جومگەکانی لەجێ‌چوون.

إنصَرَفَ پشتی هەڵکرد، پشتی تێکرد.

إنصَرَمَ بڕا، تێپەڕی، ڕابورد.

● أنصَفَ ١/الشيءَ: گەشتە نیوە، نیواونیوبوو. ٢/الشيءَ: نیوەیی برد، کردیە نیوە، دووکەرتی کرد. ٣/الرجلُ: دادگەر بوو. ٤/الخصمين: بەدادگەرانە چارەسەری ناکۆکی و دوژمنایەتیەکەی بۆکردن. ٥/فلاناً: خزمەتی کرد.

إنصَهَرَ توایەوە، تاوایەوە.

أنْضاد وشتری قڵەو(وشەکە جەمعە ).

● إنضافَ ١/اليهِ: پەیوەست بوو پێیەوە.

**إنـــضِباط** پـــەیڕەوی تـــەواو لەیاســـاو دەســـتور، بـــەگوێرەی دەســـتور ویاســـا هەڵـــسوکەوت کـــردن، هێـــزی تایبـــەتی پاراستنی یاسا.

**أنضَجَ** پێ گەیی، هاتە بەرهەم.

**إنضَمَّ** یەکی گرت، کۆبویەوە.

**أنَطَّ** گەشتی دوور ودرێژ، سەفەری دوور.

**انطَبَقَ** داخراو هاتە وەیەك.

● **أنطَفَ** ١/**هـ**: لەکەداری کرد.

**إنطَفَأَ** کوژایەوە، خامۆش بوو.

● **أنطَـــقَ** ١/**هـ**: هێنایـــە قـــسە، دوانـــدی، هێنایەگۆ.

**إنطَلَقَ** ڕۆشت، ڕۆیی، دەرفرتا.

● **إنطَـــوى** ١/**علیـــه القـــوم**: کۆبونـــەوە، ئاپۆڕەیاندا.

**إنعامة** بەخشیش.

● **أنعَـــجَ** ١/**القـــوم**: وشـــترەکانیان قەڵـــەو بوون، وشترەکانیان گۆشتیان گرت.

**إنعِراج** کووڕبوو، خوار بوو.

● **إنعَزَلَ** ١/**عنهُ**: دورکەوتەوە لێی.

**إنعَطَفَ** پێچرایەوە.

● **إنعَقَّ** ١/لەت بوو، شکا. ٢/**الوادي**: قـوڵ بوو.

● **إنعَقَـــدَ** ١/بەســـترا، گرێـــدرا. ٢/**الزهـــرُ**: بەرەکانی هاتنەوە یەك وبونە (بەر).

**إنعِكـــاس** وێنەدانـــەوە، تیـــشك دانـــەوە، ڕەنگدانەوە.

**أنعَـلَ** نـەعلی لـەپێ کـرد، کەوشـی کـردە پێ.

● **أنعَمَ** ١/**الشيءَ**: ناسك ونەرمی کـردەوە. ٢/**فلاناً**: خستیە خۆشگوزەرانیەوە.

**أنعى** قسەیەکی قۆڕونالەباری کرد.

● **أنغَضَ** ١/**الشيءَ**: جوڵەی کـرد وشـپرز بـــوو. ٢/**رأســـهُ**: ســـەری جوڵانـــدوەك سەرســـوڕماو یـــاخود کەســـێك بۆگاڵتـــە کـــردن بەشـــتێك ســـەربجوڵێنێت. ٣/**الله علیه العیشَ**: ژینـی تـاڵ کـرد، ژینـی لـێ نارەحەت ونالەبارکرد.

● **أنغَلَ** ١/**الجلدَ**: لـەکاتی خۆشـە کردنـدا پێسەکەی خراپ کرد.

**إنغَمَّ** دڵتەنگ بوو، خەفەتبار بوو.

**إنغَوى** خوار بویەوە.

**أنغى** قسەیەکی ئاسان وساکاری کرد.

● **أُنف** ١/لوت، کەپۆ، بێڤڵ، کەپ، دەم. ٢/ باخێـــك کـــەس دەســـتکاری نـــەکردبێت، جەنگـــەڵێك دەســـتی بـــۆ نـــەبرابێت. ٣/**العجل**: ڕوەکێکە بۆجوانی وڕازاندنەوە دەنێـــژرێت لـــەگروپی (**خنازیریـــات**)ە گوڵەکـــەی لەســـەری هەنـــدێك ئـــاژەڵ دەچێت، ڕەنگەکەشی جۆراوجۆرە.

**إنفــاق** مــالْ بەخــشين لەڕێگــەی خێروچاکەدا، تەنگ دەستی، هەژاری.

**إنفَتَحَ** کرایەوە.

**إنفِجار** تەقینەوە، سووتان.

● **إنفَجَــــرَ ١/علــــيهم العــدو:** لەهەمووڵایەکــەوە هاشــاوڵی بــۆ هێنــان. **٢/الماء:** لەبەری ڕۆشت، فوارەی کرد.

● **إنفَخَ ١/ت السقف:** کون بوو، کونی تێ بوو.

● **أنفَـدَ ١/القـوم:** پارەیـان نـەما یـاخود توێـشویان لێبڕا. **٢/ت البئر:** ئاوی تێـدا نەما، وشکی کرد. **٣/الشيء:** لـەناوی بـرد، بەربادی کرد.

**إنفِراد** تـەنهایی، تـاك بونـەوە، تـاکڕەوی، گۆشەنشینی.

● **إنفَـرَجَ ١/الغـم:** ڕەویـەوە. **٢/الرجـل:** ڕزگاری بوو لە ناڕەحەتیەکەی.

**إنفَرَطَ** هەڵوەشایەوە، کرایەوە.

● **أنفَسَ ١/**گرانبەهابوو. **٢/الـشيء فلانـا:** سەرسامی کرد.

**إنفَسَحَ** گوشاد بوو، فراوان بوو.

**إنفِصام** دابڕان، ترازان.

● **إنفَـصَلَ ١/**جیابویـەوە، تـرازا. **٢/عنـه:** لێی جیابویەوە.

**إنفَضَ** پەرتەوازە بوو.

● **انفَطَـرَ ١/** شـکا، پـەراش پـەراش بـوو، لەت بوو. **٢/القضيب:** گەڵاکانی دستیان بە سەوز بون کرد.

**انفَطَمَ** لە شیر بڕایەوە، لـە شـیر خـواردن دابڕێنرا.

**اَنفَـعَ** بازرگـانی گـاڵۆکی کـرد، کـڕین و فرۆشتنی گۆچانی کرد.

**انفِعــــال** هەڵــچون، کەوتنــــە ژێـــر کاریگەریەوە، شەرمەندەیی.

● **انفَعَلَ ١/بكذا:** هەڵچوو.

● **اَنفَـقَ ١/**هـەژار کـەوت، توێـشوی لێـبڕا. **٢/المال:** خەرجی کرد.

● **انفَـكَ ١/**هەڵوەشـایەوە و لێـك بـچڕا. **٢/العبد:** ڕزگارو ئازاد کرا.

**اَنفَلَ** سوێندی خوارد.

**انفلات** بریتیە لەدابەزینی فشاری گاز لە ماوەیــەکی کەمــدا وەك لــە ئــامێرە هەڵمیەکانـدا ڕوودەدات، جڵـەو لەدەسـت دەرچوون، پاشاگەردانی ئەمنی.

**اَنفَةَ** دەرون بەرزی، سەر بەرزی دەرون.

**اَنِقَ** شادومان و خۆشحاڵ بوو.

● **اَنِقَ ١/ه:** سەر سامی کرد.

● **انقادَ ١/لفلان:** گوێ ڕایەڵی بوو، سەری بۆ شۆڕ کرد.

**انقَبَضَ** هاتەوە یەك، تەسك بویەوە.

● **اِنقاضَ ١/البناءُ:** رووخا، ڕما.

● **اِنقَبَضَ ١/في حاجته:** هەڵپەی کرد، پەلەی کرد. **٢/القوم:** پەلە پەلیان کرد.

● **اَنقَحَ ١/الكلام:** قسەی پاك کردەوە لە ڕەخنەو ناتەواوی، قسەی لە بێژنگدا و پاڵفتەی کرد. **٢/** پاکی کردەوە، پاڵفتەی کرد.

● **اَنقَدَ ١/الشجر:** گەڵای کرد.

**اَنْقَدْ** کیسەڵ، ڕەقە.

● **أنقَذَ ١/هُ:** ڕزگاری کرد، دەربازی کرد.

● **انقَرَ ١/عنهُ:** دەستی لێ هەڵگرت، دەست بەرداری بوو، دەستی لێ کۆتا کرد.

**انقرض** ڕیشەکەن بوو، قڕ بوو.

**انْقسام** بەش بەش بوون، دابەش بوون، پارچە پارچە بوون.

**انْقَسَم** پارچە پارچە بوو، دابەش بوو.

● **اَنقَصَ ١/الشئ:** کەمی کردەوە، ناتەواوی کرد.

● **اَنقَضَ ١/اصابعهُ:** پەنجەکانی دابە یەکدا بۆ وەی دەنگیان لێوە بێت، چەقەنەی لێدا.

**انقَطَعَ** بڕا، بچڕا.

● **اَنقَعَ ١/الماءُ:** ڕەنگی زەرد بوو بۆگەنی کرد. **٢/الصارخ بصوته:** هاوارکەر یەك بە دوای یەکدا هاوارو قیژەی کرد.

**٣/الميت:** ئەسپەردەی کرد. **٤/ت الحية السَمَ:** مار ژەهری کۆکردەوە.

● **اَنْقَلَ ١/النعلَ:** چاکی کرد، ڕێك و پێکی کرد.

**انقِلاب** کودەتا، شۆڕش، سەرنگونی حکومەت.

**انْقَلَبَ** هەڵگەڕایەوە، سەرەو ژێر بوو.

**اُنْقُوعَة** ڕێڕەوی ئاو، جۆگە، جۆگەلە.

● **أنقى ١/هُ:** پاکی کردەوەو هەڵی بژارد.

**انكار** ملە جەڕێ، نکولی کردن، بەدرۆ خستنەوە، باوەڕ نەهێنان.

**انكِبى** کەوت بە سەرڕوودا، بە دەمدا کەوت.

● **اَنكَحَ ١/هُ:** مارەی کرد، مارەی بڕی.

● **اَنكَرَ ١/هُ:** ملە جەڕێی لێکرد، نکولی لێکرد، نەزان بوو بەرانبەری.

**أنكَــر** ناخۆشترین، ناحەزترین، قەڵسترین.

**انكِسار** شکانەوە، گۆڕرانی ڕێڕەوی تیشك لە کاتێکدا لە ناوەندێکی ناسك و تەنکەوە بەرەو ناوەندێکی ناسکی تر دەچێت وەك لە ناوەندی هەواییەوە بچێتە ناوەندێکی ئاوی.

● **انكَسَفَ ١/ت الشمسُ:** خۆرگیرا.

**انكَشَفَ ١/**ڕیسواو بەدناو بوو. **٢/الشئ:** دەركەوت، ئاشكرا بوو.

●**اَنكَفَ ١/ه:** پاك ڕایگرت لە نەنگی و لە كەلەو پەڵەوبە پیرۆزی دانا.

●**اَنكَلَّ ١/من المكان:** وازی لێ هێنا، لێی دوركەوتەوە.

●**انكَمَشَ ١/**كورت بویەوە، بەرەو دواوە چوو. **٢/الثوب بعد الغسل:** پۆشاكەكە لە دوای شۆردن كورت بویەوەو چوە ئاو.

**اَنَّما** تەنها، بە تەنها.

**انمارَ** هەڵكەندرا، هەڵكێشرا (بۆ موو).

**اَنمَر** بەهەورێك دەوترێت پەڵەیەكی سپی بێت و پەڵەیەكی تری ڕەش بێت یان هەر ڕەنگێكی تر بێت بەڵام بە زۆری بە هەورێك دەگوترێت كە پەڵەیەكی سپی بێت و پەڵەكەی تری ڕەش. ئەسپێك لە شێوەی پڵنگدا پەڵەی ڕەشی تێدا بێت.

●**اَنمَسَ ١/في الشئ:** چوە ناویەوە.

**اَنمَقَ** خورما بێ ناوك بوو.

**انمَلَقَ** نەرم بوو، ناسك و نۆڵ بوو.

**اَنمُلَة** سەری پەنجە.

**اَنموذَج** نمونە.

**اِنَّ و أنَّ** بە ڕاستی، ئەم دوو وشەیە لە وشەكانی (توكید)ن.

**اَنوَر** ئاشكرا و جوان، تیشكاوەرتر.

●**اَنوَرَ ١/**ڕوناك بویەوە. **٢/الشئ:** ئاشكرا بوو.

**اَنوُف** گرانقەدر، بەرێز، كەسێك زۆر دەرون بەرز بێت.

**اَنْوَك** گەمژە، گێل، نادان.

**اَنوى** گەشتی دورو درێژی كرد.

**انهار** ڕشتنی خوێن و ئاو.

**انهار** وێران بوو، ڕووخا، ڕما.

●**انهاضَ ١/العظم:** ئێسقان لە دوای گرتنەوەیەوە شكایەوە.

●**انهالَ ١/القوم على فلان:** یەك لەدوای یەك هاتنە سەری و بەرۆكیان گرت بە جنێو یاخود لێدان.

●**اَنهَجَ ١/الطريق:** ڕۆشن و ڕوناك بویەوە. **٢/الطريق:** ڕۆشنی كردەوە.

●**اَنهَدَ ١/الصلية:** دیاریەكەی بە گەورەی زانی، دیاریەكە زۆرلای بەرێزو گەورەبوو. **٢/الحوض:** پڕی كرد تاكو لێی ڕژا.

**اِنْهَدَمَ** ڕووخا، وێران بوو، ڕما.

**اِنهَدَنَ** پشت سارد بویەوە لەمەبەستی خۆی.

● **اَنهَـرَ ١/النهـرَ:** فراوانـی كـرد. **٢/الـدمَ:** ڕژا. **٣/الـمـائر:** گەشـتـە ئـاو. **٤/الرجـلُ:** كەوتە ڕۆژەوە، ڕۆژی كردەوە.

● **اَنهَزَ ١/ه:** ڕاپەڕاندو وشیاری كردەوە.

**انهَزَع** شكا.

● **انْهَزَمَ ١/الجيشُ:** شـكا لەجەنگدا. **٢/تو العصا:** شـكاوقرپەی كـرد، شـكاو كرتـەی كرد.

● **اَنهَـــضَ ١/ه:** ڕاپوەشــاند بــۆ بێــدار كردنەوەی و هەڵی ساندەوە.

● **نَهَـــكَ ١/ه:** زيـــادەڕەوی كـــرد لـــە سزادانيدا.

● **اَنهی ١/الشئ:** تەواوی كرد، كۆتايی پـێ هێنا.

**انهيار** داڕوخان، داڕمان، هەرەس هێنان.

● **اَنَـــیَ ١/**نزيــك كەوتــەوەو ئامــادەبوو. **٢/النهات:** كاتی هات، كاتی نزيك بووەوە.

**اَنّی** ئاوەڵفرمانی شوێنە بە مانـای (هـەر كـــۆی، هـــەر جێگەيـــەك، لـــە كـــوێ) دەگوترێـت( **انـی تجلـس اجلـس)** يـاخود **(انی لك هذا ؟).**

**أنيس** باڵندەيەكی ئاوبە دەنگی لە دەنگی مانگا دەچێت، هاودەم، خەمخۆر، هـاوڕێی پێكەوە دانيشتن.

**أنيق** كەشخە، جوان و ڕێك وپێك، جوان پۆش.

**اَنين** ناڵە، هاواری نەخۆشان و بيماران.

**أنی و اَنـی** هەموو ڕۆژ يـان بەشێك لـە ڕۆژ.

**أوْ** يـــا، يـــان، بـــۆ چـــەند مەبەســـتێك لەڕستەدا بەكار دەهێنرێت وەك**(عطفـه لجام، اباحة، تخيير، تقسيم).**

**اَوابِد** سەختی و ناڕەحەتی، تەنگانەكانی دنيا.

**اَواسِ** پايە، ستون دەگوترێت **(ملكٌ ثابت الاواسي).**

**اَوان** كات، وەخت (وشەكەجەمعە).

● **اَوَبَ ١/صدة:** پاشگەز بوەوە لێی.

**أوْب** نياز، مەبەست، خوو، نەريت، ڕێگە.

● **اَوبَدَ ١/ه** تاكی كردەوە، جيای كردەوە.

● **اَوبَقَ ١/ه** لە ناوی برد.

● **اَوتـاد ١/**مێخ، بزمـار. **٢/ الارض:** شاخ، چيا. **٣/البلاد:** پيـاو مـاقوڵ وسـەرۆكانی وڵات. **٤/الفم:** ددانەكان.

● **اَوثَدَ ١/**سەقامگيری كرد، قايم و قوڵی كرد. **٢/**مێخی داكوتا.

● **أوثَجَ ١/ه:** زۆری كرد، زۆری ئەنجامدا.

● **اَوثَـــقَ ١/ه:** بـــە گـــوريس تونـــدو تـــۆڵ بەستی.

**أَوج** بەرزی، بڵندی، بەرزترین خاڵ.

●**أَوجَبَ ١/لفلانٍ حقه**: ڕەچاوی کرد. ٢/**الشئ**: کردیە واجب. ٣/**الرجلُ**: کارێکی کرد پێی بکەوێتە بەهەشت یان دۆزەخەوە.

●**أَوجَدَ ١/فلاناً**: بە هێزی کرد، دەوڵەمەندی کرد. ٢/**الله الشئ**: هێنایە بونەوە، دروستی کرد.

**أَوْجَرْ** کەسێك لە شتێك بترسێت.

●**أَوجَعَ ١/ه**: ئازاری پێگەیاند، ئێشی پێگەیاند.

●**أَوجَفَ ١/الباب**: دایخست، پێوەیدا.

**أَوجَعْ** بە ئازارتر، بە ئێش تر، زۆر بە ئازار.

**أَوحَدَ** بە تەنهایی وازی لێ هێنا، تاکی کردەوە.

●**أَوحَرَ ١/ه**: تورەی کرد، شتێکی پێ گوت کە پێی تورە ببێت، قسەیەکی دا بە گوێیدا کەنەو ڕقی لێی بێت.

●**أَوحَشَ ١/المكان**: خەڵکی چۆڵیان کرد. ٢/**الرجلُ**: برسی بوو، توێشوی لێبڕا.

**أَوحَفَ** پەلەی کرد، پەلەپەل کرد.

●**أوحى ١/**ئاماژەیدا، بە جۆرێك قسەی کرد تەنها بەرانبەرەکەی تێبگات و کەسی تر لێی حاڵی نەبێت، بە ئیشارەت قسەیکرد. ٢/**العملَ**: پەلەی تێدا کرد. ٣/**الرجلُ**: لە دوای هەژاری دەوڵەمەند بوو.

●**أَورَثَ ١/ه**: میراتی بۆ دانا، کردیە میرات گر.

●**أَورَدَ ١/الشئ**: یادی کردەوە.

●**أَورَقَ ١/الشجر**: گەڵای کرد.

**أَورَه** نادان، گەمژە، گێل، گەلحۆ.

**اوِزّ** قاز، باڵدارێکی سپی زەلامە گۆشتی دەخورێ.

●**أوزَرَ ١/الشئ**: شاردیەوە، حەشاری دا.

●**أَوزَى ١/الى فلانٍ**: پەنای بردە بەری.

●**أَوسَطَ ١/القوم**: چوە ناوە ڕاستیانەوە، چوە نێوانیانەوە.

●**أَوسى ١/الشئ**: بڕی، لەتی کرد.

**أَوشَكَ** پەلەی لە ڕۆشتندا کردو نزیك بویەوە.

●**أَوشى ١/الرجلُ**: ئاژەڵەکانی زۆر بون و زاوزێ یان کرد. ٢/**الشئ**: دەری هێنا.

●**أَوصَدَ ١/الباب**: دایخست، قایمی کرد. ٢/**على فلانٍ**: بە هیلاکیدا برد.

**أَوصَر** بەڵێن نامە، چەکی کڕین و فرۆشتن.

●**أَوصَفَ ١/الغلامُ**: گەشتە تەمەنی خزمەتکردن.

**اَوصَلَ** گەیاندی.

**أوصى** ئامۆژگاری کرد، فەرمانی کرد.

● **أوْضَحَ** ١/**الأمرُ**: ڕۆشن بویەوە. ٢/**الأمرَ**: رونی کردەوە.

● **أوضَخَ** ١/**ت البئرُ**: ئاوی کەم بوەوە.

● **أوضَمَ** ١/**الشجرَ**: درەختی بڕی و لە سەر یەکتر هەڵیچنین.

● **أوطَنَ** ١/**بالمكانِ**: تیایدا مایەوە، کردیە زێد ونیشتمانی خۆی.

● **أوعَبَ** ١/**الشيءَ**: کۆی کردەوە. ٢/**الأمرَ**: دەستی لێی خاڵی بوو.

● **أوعَثَ** ١/**المتكلمُ**: لەقسە دەستەوەستان بوو. ٢/**الرجلُ**: تێکەڵوپێکەڵی کرد. ٣/**الأمرَ**: خراپی کرد. ٥/**في مالهِ**: ئیسرافی کرد، هەڵەخەرجی کرد.

● **أوعَدَ** ١/**ه**: پەیمانی پێدا، بەڵێنی پێدا. ٢/ هەڕەشەی لێکرد، ترساندی.

● **أوعَسَ** ١/**ت الإبلُ**: لەڕۆشتندا ملی بەرز کردەوە وهەنگاوی گەورەی نا.

● **أوغَرَ** ١/**ه**: تورەی کرد.

● **أوغَفَ** ١/**الرجلُ**: چاوی کز بوو. ٢/**الكلبُ**: هەناسەبڕکێی پێ کەوت.

● **أوفَدَ** ١/بەرزبویەوە. ٢/ نوماینەدو نێردراوی نارد. ٣/**عليهِ**: چاودێری وسەرپەرشتی کرد.

**أوفى** ئەمەگداربوو بەرانبەر بە پەیمان وبەڵێن.

**أوقاب** کەل وپەلی ناو ماڵ، شمەکی ناوماڵ.

**أوقَدَ** ئاگری هەڵگیرساند.

**أوقَصْ** کەسێك بەزگماکی ملی کورت بێت.

● **أوقَفَ** ١/**ه**: وەستاندی، ڕای وەستاند. ٢/**ه عن الأمرِ**: ئەوی لەوکارە پاشگەز کردەوە ودەستی پێ لێ هەڵگرت.

● **أوكَبَ** ١/**ه**: تورەی کرد. ٢/**الطائرُ**: خۆی ئامادەکرد بۆفڕین.

**أوكَدَ** پەیمان وبەڵێنی توندوتۆڵ کردەوە.

● **أوكَرَ** ١/**الإناءَ**: پڕی کرد.

● **أوكَفَ** ١/**ه**: خستیە ناو گوناهەوە، گوناهی پێکرد.

● **أوكَلَ** ١/**بالله**: خۆی دایەدەست خودا، پشتی بەخوابەست وکارەکانی بەوسپارد.

● **أوَّلَ** ١/**الرؤيا**: خەوپەرژێنی کرد، خەونی ڕاڤە کرد، خەونی لێك دایەوە.

**أوّل** یەکەم، یەکەمین، سەرەتای هەرشتێك.

● **أولَجَ** ١/**ه**: خستیە ناوەوە.

● **أوْلَعَ** ١/**الصّبيُّ**: درێژوگەورە بوو.

●أولاهُ ٨/الثقة: متمانــەی خــۆی پــێ بەخشی، پشتی پێ بەست.

أولو خاوەنان.

أولوية لەبەرتری، بەرتری.

أولَقَ شێت بوو، توشی شێتی بوو.

أولَمَ دەعوەتی سازکرد، سفرەی سازکرد.

أوقأ ئاماژەی دا، نیشارەتی کرد.

●أومَقَ ٨/ت المرأة: بەد رەوشتیەکانی بەئاشکرا ئەنجامدا.

●أومَضَ ٨/الرجلُ: ئاماژەیەکی سوکی دا.

أوهَفَ نزیك کەوتەوە.

●أوهَنَ ٨/هُ: لاوازی کرد.

●أهــــابَ ٨/الراعــــيُ: هـــاواری لەپــەزەکانیکرد تــاکو بوەســتن یــاخود بگەڕێنەوە.

●أهانَ ٨/هُ: بەسوك سەیری کرد، گاڵتەی پێکرد، سوکایەتی پێکرد.

إهانــة بەسوك سەیرکردن، سوکایەتی پێکردن، گاڵتە پێکردن.

●أهَبَّ ٨/السيفَ: ڕای وەشاند.

أهبة ئامادەگی.

●إهتَبَرَ ٨/البعيرُ: لاواز بوو، گۆشتی پێوە نەما.

●إهتَبَــــلَ ٨/فــلانٌ: درۆی زۆرکـــرد وفروفێڵی بەکارهێنا.

●إهتَجَ ٨/في الامر: بەگوێی خۆی کرد بە کارەکەدا و گوێی بۆ ڕاوێژی کەسی تر نەگرت.

●أهتَجِمَ ٨/الرجلُ: لاواز بوو، سست بوو.

●إهتَدى ٨/الرجلُ: داوای ڕێنمایی کرد.

إهتَدَّ بەخێرایی بڕی.

●إهتَزَّ ٨/لەرزا، جولا، بزوا. ٢/النباتُ: جولایەوەودرێژ بوو.

إهتزاز لەرزین، جولان.

إهتَزَعَ پەلەی کرد، پەلەپەلی کرد.

●إهــتَشَّ ٨/لكذا: پێی خۆشحاڵ بوو. ٢/فلانٌ بي: بەمن شادومان بوو.

إهتَشَلَ سـواری ئەسـپێك بـوو بـەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە خاوەنەکەی.

إهتَضَمَ ستەمی کرد.

●إهتَلَّ ٨/الوَجهُ: درەخشایەوە.

إهتَمَّ گرنگیدا، بایەخیدا.

●إهتَنَأ ٨/مالهُ: چاکسازی تێدا کرد.

●أهجَلَ ٨/الشيءَ: پانی کرد. ٢/المالَ: ونی کرد، بەفیڕۆیدا.

أهجَمَ خەوت، نوست، ڕاژا.

●أهَــدَأَ ٨/هُ: ئـارامی کـردەوە، هێمنـی کردەوە.

●أهدَرَ ۱/دم فلان: بەفیڕۆ خوێنی فلان کەسی ڕشت، خوێنی فلان کەسی حەڵاڵ کرد.

●أهدَفَ ۱/منه: نزیك کەوتەوە لێی. ۲/الیه: پەنای بردە بەری.

●أهدَنَ ۱/الطفل: لاوازی کرد.

أهرَت دەم پان، کەسێك دەمی پان بێت.

أهرَقَ ماڵوسامانی گەشەی کرد.

أهرَم پیربوو، پەکی کەوت.

أهزَقَ زۆرپێکەنی.

أهشَلَ وشتری دزراوی بەخشی.

●أهِلَ ۱/به: خوی پێوەگرت.

أهْل کەس وکار، خزم ودۆست.

●أهَلَّ ۱/الشهرُ: مانگەکەی دەرکەوت.

أهلاً وسهلاً واژەیەکە بۆ بەخێرهێنان وچاك وچۆنی کردن بەکاردەبرێت.

أهلَب کەسێك زۆری موو پێوەبێت، مووداوی، کەسێك توکی زۆر بە لەشیەوە بێت.

●أهلَكَ ۱/ه: لەناوی برد. ۲/المالَ: فرۆشتی.

أهلِيّ ئاژەڵی ماڵی کراو، ئەهلی.

أهلِيّة شایستەگی، شایستەیەتی.

أهلِيّة گونجاوی، شایستەگی.

●أهَمَّ ۱/الامرُ فلاناً: ناڕەحەت ودڵ تەنگی کرد.

إهمال فەراموش کردن، سستی، پشت گوێ خستن.

●أهمَعَ ۱/الدمع: ڕژا. ۲/الطلّ: کەوتە سەردرەختەوە.

●أهْمَلَ ۱/ه: پشت گوێی خست، وازی لێهێناو بەکاری نە هێنا. ۲/الأمرَ: ڕێك وپێك وتوند وتۆڵی نەکرد.

أهنَفَ پێکەنی، پێکەنی بەشێوەیەك وەك گاڵتە بکات بەشتێك.

أهوَج نادان، گەمژە، ئازاو چاو نەترسێك بەبێ باکانە خۆی بکات بەنێو جەرگەی شەڕدا.

أهوَن ئاسانتر، ئاسان.

●أهْوَى ۱/الشيءَ: کەوت.

أُهوِيّة چاڵی قوڵ.

أهيَق مل درێژ.

أَي واتە.

اِي بەڵێ، بەرێ، ئەرێ (وشەی وەڵامدانەوەیە).

أَيّ چ، چ شتێك (أيّ شيءٍ = چ شتێك؟).

أيَا وشەی بانگ کردنە بۆ دوور.

أياب گەڕایەوە.

إياب گەڕانەوە.

●**اَيأسَ ١/هـ** بێ ئومێدی کرد، خستیه ناو بێ ئومێدیەوە.

**اِيـاكَ** تۆ، هەر تۆ، بە تەنها تۆ ( **اياك نعبد** ).

**أيَّانَ** کەی، چ وەختێك، چ کاتێك؟.

**اِيتاء** بەخشین.

**اِيتَسَرَ** گۆشتی قوماری دابەش کرد.

●**اَيـتَمَ ١/هـ** هەتیوی خست، کردیە هەتیوو.

**اِيثار** ڕێز گرتن لە کەسانی تر.

**اِيجار** بە کرێ گرتن.

**اِيجـاز** ڕوونکردنـەوەی مەبەست بـە کورتترین دەستەواژە، کورت کردنەوە.

**اِيحاء** نیگا ناردن.

**اَيِّد** بەهێز، بە توانا.

●**أيَّدَ ١/هـ** سەقامگیری، بەهێزی کرد.

**اِيذاء** زیانگەیاندن.

**اِيراد** هێنانی کاڵای بازرگانی.

**اَيِسَ** ئومێد بڕاو بوو، بێ هیوا بوو.

●**اَيسَرَ ١/ت المرأة** منداڵ بوونی لە سەر ئاسان بوو.

**اَيْـسَر** ئاسـانتر، سـوکتر، چـەپ، دژی لای ڕاست.

**اِيضاح** ڕونکردنەوە، ڕۆشن کردنەوە.

**اِيفَعَ** کەشتە تەمەنی بلوغی.

**اِيقاع** هەماهەنگی دەنگ.

**أَيقَـاظ** بێـدار، چاوکراوە و ئاگـادار لـە مەسەلەکان.

●**أيقَـظَ ١/فلانـا،** وەئاگـای هێنـایـەوە، بێداری کردەوە.

**اَيقَن** بێ گومان.

**اَيقَنَ** دڵنیایی و یەقینی دەستکەوت.

**اَيك** دار و درەختی زۆرو پێکدا هەڵچوو.

**اِيلاف** پەیمان، بەڵێنی شێوە مۆڵەت.

**أَيِّـم** کەسـێك هاوسـەرەکەی لـە دەست دابێت، بێوە ژن یان بێوە پیاو.

**اَيم** مار، نێرەی مار.

**اِيمان** باوەڕ، بڕوا.

**أَيمَـنَ** بـەرەو لای ڕاسـت چـوو، هـات بـۆ وڵاتی یەمەن.

**أَيمَن** لای ڕاست، پێچەوانەی لای چەپ.

**أيْنَ** وشەیەکە پرسیاری پـێ دەکرێـت لـە شوێن، کوێ، لە کوێ؟.

**اَينَعَ** میوە خۆش بـوو پێگەیشت و کـاتی لێکردنەوەی هات.

**أيْنَمـا** هەر کوێ، دەگوترێـت (**اينما تكونوا**).

**اَيوان** کۆشك، هەیوان لە ماڵدا.

**أَيْن** کات، هیلاکی و ناڕەحەتی.

●باءَ ١/بالحق: دانی پێدا نا. ٢/الیه: گەڕایەوە. ٣/ه: گەڕاندیەوە. ٤/فلان بفلان: کوژرایەوە لەبریتی فلانی تردا، لەبری خوێن کوژرایەوە.

بِئر بیر، چاڵێکی قوڵە لەزەویدا دروست دەکرێت بۆ ئاو لێدەرهێنان.

بائت شیرێ یان ئاوێ شەوی بەسەردا بێتەوەو سارد بێتەوە.

بائِخ بێ مەزە، بێ تام.

●بادَ ١/ لەناو چوو. ٢/ت الشمس: دیارنەما.

●بارَ ١/العمل: هەڵوەشایەوەو پوچ بویەوە.

بائِس بەدبەخت، هەژارو نەدار.

بائِع فرۆشیار، کڕیار.

بائِقَة سەختی وتەنگانە.

بائِن ئاشکرا، ڕوناك، ڕۆشن، بێ تەمومژ.

بائِنَة ئەو شتومەك وبوخچەو پێداویستییانەی لەگەڵ بوکدا دەنێردرێن بۆماڵی زاوا.

باب درگا، دەروازە.

بابِلی ئەفسونگەر.

●باتَ ١/ شەوی گوزەراند لەجێگەیەکدا، شەو مایەوە. ٢/الرجلُ: ژنی هێنا. ٣/الرجلُ: ژنی بۆ هێنا.

باتِر شمشێری بڕندە.

باثِر ڕژد، حەسود.

باج باج، سەرانە.

باحَثَ گفتوگۆی کرد، بەڵگەی هێنایەوە.

باحِث لێکۆڵیار، توێژەر، کەسێك لێکۆڵینەوە بکات لەهەر بوارێکدا.

باحَة ناوەڕاستی ڕێگە.

●باخَ ١/اللحم: بۆگەنی کرد.

باخِرَة کەشتی زەبەلاحی هەڵمی.

●بَخعَ ١/بالحق: دانی پێداناو مل کەچ بو بۆی.

●بادَّ ١/ه: لەناکاوا دای بەسەریدا.

بادَرَ پێش دەستی کرد، پەلەی کرد.

بادِر دەست پێشخەر، پەلەکەر.

●بادَلَ ١/ ه: گۆڕیەوە، شتێکی لەگەڵدا ئاڵوگۆڕکرد.

بادِه غافڵگیر، کەسێك لەناکاودا هێرش بکات.

●بادَی ١/ه: نیشانیدا، دەری خست، ئاشکرای کرد. ٢/بالعداوة: دوژمنایەتی کرد، دوژمنایەتی ئاشکرا کرد.

**بادِیء** دەشت پێکەری هەرکاریَ، دەست پێشخەر، کەسێك بەر لەکەسانی تردەست بەکردنی کارێك بکات.

**بادِیَة** بیابان.

**باذِخ** خۆبەزلزان، کەشخە.

**بارَ** تاقی کردەوە.

**بارَّ** چاکەی کرد، میهرەبانی نواند.

**بارّ** چاکەکار، دروستکار، ڕاستگۆ.

**بارِجَة** کەشتی زەبەلاحی جەنگی.

●**بارِحَة** ١/ دوێنێ، دوێکە، ڕۆژی بەر لە ئەمڕۆ. ٢/**الأولی** پێریَ، پێرەکە.

**بارِد** سارد.

**بارِع** کەسێك لە جوانیدا یان لە زانیاریدا یاخود لەچاکەکاریدا دیار بێت لەناو مەردومدا.

**بارِقَة** هەوری پزیسکەدار، شمشێر.

●**بارَكَ** ١/**الرَجلَ** نزای بەرەکەتی بۆ کرد.

**بارُود** باروت، سوتەمەنی نێو تەقەمەنیەکان.

**بارَیَ** چاودێری کرد، سانسۆری کرد.

**بارِیء** وەدیهێنەر، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە.

**بَاز** هەڵۆ، بازی ڕاوکردن.

**بازِل** پیاوی وەناگا و کارشوناس.

**بَاس** ئازایەتی، هێز.

**بَأساء** نارەحەتی، هەژاری، ڕەنج و دژواری ژیان، ئەشکەنجە.

**باسِط** ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە و بەمانای فراوانکەرو گوشادکاری ڕۆزی دێت.

**باسِق** دارخورمایەك پەلوپۆکانی بەرز وبڵند بوبێتەوە.

**باسِل** ئازا، چەلەنگ، دلێر، چاونەترس، قارەمان.

**باسِم** دەم بەخەندە.

●**باشَرَ**/ دەستی پێکرد. ٢/**المرأة** لەگەڵیدا جووت بوو.

●**باضَ** ١/**بالمکان** تیایدامایەوە. ٢/**الطائر** هێلکەی کرد. ٣/**فلاناً** سپێتی بەسەریدا زاڵ بوو، زۆر سپی بوو. ٤/**السّحابة** بارانی باراند.

**باطِل** بێهودە، پوچ.

**باطِن** ناواخنی هەرشتێك، دیوی ناوەوە.

●**باطَنَ** ١/**ه** پرسی پێکرد.

**باطِنيّ** دەرونی، ناوەوەیی.

**باع** باڵ، ئەندازەی درێژی نێوان کرانەوەو والاکردنی هەردوو دەست.

●**باعَ** ١/ فرۆشتی. ٢/**الضَبلَ**: بەباڵ گوریسەکەی پێوانەکرد. ٣/**العَرَق**: ڕژا. ٤/**الشعاع من الصفو**: دەرکەوت لەڕیزەکەدا.

**باعِث** هۆکار.

●**باعَدَ** ١/ ە: دوری خستەوە.

**باغ** زاڵ بوو، لەنێو چوو.

**باغي** ستەمکار، یاخی.

●**باقَ** ١/ت **السَفینة**: نقوم بوو. ٢/**الشيء**: خراپ بوو، بۆگەنی کرد.

**باقَة** چەپك، چەپکە گوڵ یان هەرشتێکی تر.

**باقِعَة** ئەو پەلەوەرەی لەترسی ئەوەی کەنەبادا ڕاوبکرێت هەر ئەملاولایەتی، پیاوی زۆر زیرەك.

**باقِي** بەرقەرار، نەمر، هەرشتێك بمێنێتەوە، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە.

**باقِيات** کاری چاکە وپیاوەتی کەدەمێنێتەوە.

●**باكَ** ١/**المتاع**: فرۆشتی.

**باكّ** کەمزە.

**باكِر** بەیانی، سەرلەبەیانی، کیژی شوونەکردوو.

**بَال** ئەندێشە، خەیاڵ، بیر.

**بالِد** کەسێك لە جێگەیەکدا بمێنێتەوە و بیکاتە وڵاتی خۆی.

**بالِع** قوت دەر.

**بالِغ** کەسێك گەشتبێتە تەمەنی باڵق بوون.

**بالَغَ** زیادەڕەوی کرد، کۆششی کرد لەکاردا.

**بالوعَة** لولەی چوونە دەرەوەی ئاوی پیس لەماڵدا.

**بالُون** میزەڵان، میزەڵدان، تۆپی یاری، باڵۆنی هەوایی.

**بانَ** جیابویەوە، ڕۆش بویەوە.

**باني** بیناکار، دروستکەر.

●**باهَتَ** ١/ە: سەرسامی کرد.

**باهِرَة** ڕوەکێکە لەگروپی نەرگسیەکان بۆ جوانی دەنێژرێت ولەتەمەنیشیدا یەك جار گوڵ دەکات.

**باهِضَة** هەرچی شتێك یان مەسەلەیەك قورس بێت لەسەر شان و ببێتەهۆی ئەشکەنجە و ناڕەحەتی بۆ مرۆڤ.

●**باهَلَ** ١/**بعضهم بعضاً**: نەفرەتیان لەیەکتری کرد.

**بايَضَ** زیادە ڕەوی کرد لەسپێتیدا، زۆرسپی کردەوە.

**بايَعَ** پەیمانی بەست وبەڵێنیدا.

**بَبغــاء** تــوتی، باڵندەیــەکی زیرەکــەو دەتوانێت هەندێك قسەبكات.

**بَتَّ** بڕی، لەتی کرد.

**بَتات** شمەکی ناومال، توێشوو.

**بَتّار** شمشێری بڕندە.

**بترول** نەوت، نەوتی خاو، پترۆڵ.

●**بَتَّـلَ ١/الشيءَ** بـڕی وجیـای کـردەوە لەشتی تر.

**بَتول** پاکدامێن.

**بُتولَة** پاکدامێنی.

**بَثَّ** پەخشی کرد، بلاوی کردەوە.

**بَــثّ** پــەخش، بلاوکردنــەوە، نارەحــەت ترین دلگرانی ودلتەنگی.

●**بَــثَّ ١/الــسرَّ** نهێنــی بــلاو کــردەوە. **٢/الغبـارَ** بــەبای کــرد، تــەپ وتــۆزی کردبەبادا.

●**بَثَّثَ ١/الشيءَ** پەرتەوازەی کرد.

●**بَثَرَ ١/وجهه** پەلەی لێ دەرکەوت.

● **بَثَقَ ١/النهرَ** بەربەستەکەیی شـکاند، لافاوەکەی لێ دەرهات.

●**بَــجَّ ١/ه** لــەتی کــرد. **٢/ه بـالرمح** بەنێزە لێیدا.

**بُجرَة** ناتەواوی، عار.

●**بَجَّسَ ١/الماءَ** تەقاندی، فوارەی پێکرد.

**بَجِلَ** شادومان بوو، خۆشحاڵ بوو.

●**بَجَّلَ ١/ه** بەمـەزنی دانـا، گـەورەی کرد.

**بَجَل** وشـەیەکی وەلامدانەوەیە بـەمانای بەڵێ.

**بَحّـاث** لێکۆڵیـار، توێـژەر، کەسـێك زۆر لێکۆڵینەوە بکات.

**بَحّار** کەشتیەوان، دەریاوا.

**بَحت** پاڵفتە، بێ خەوش وخاڵ.

●**بَحَثَ ١/** لێکۆڵینەوەی کرد. **٢/ه** داوای کردو بەدویدا گەڕا.

**بَحـث** لێکۆڵینــەوە، توێژینــەوە، گــەڕان بەدوی شتێکدا لەژێر خۆڵدا.

**بَحثَرَ** پرژوبلاوی کردەوە.

**بَحِرَ** سەرسام بوو، شلەژا لەترسا.

**بَحر** دەریا.

**بُحــران** ئــەو گۆڕانــەی لەنەخۆشــیە توندوتیژەکاندا دەردەکەون.

**بَحرِيَّة** هێزی دەریایی.

**بُحَيرَة** دەریاچە.

**بَخ بَخ** بەه بەه.

**بَخت** بەخت، بەهرە.

**بَخْتَـرَ** بــەنازو لـوت بەرزیــەوە ڕێگــەی کرد.

●**بَخَرَ ١/ ت الفمُ** هەڵمی لێ هەستا.

● **بَخَسَ ١/ه** لێی کەم کردەوە، ستەمی لێکرد.
**بَخس** کەم، ناتەواو.
● **بَخَصَ ١/الرجلُ** بەرچاوی ئاوسا، بەرچاوی هەڵاوسا، بەرچاوی هەوی کرد.
● **بَخَعَ ١/نفسه** خۆی هیلاك کرد بەرادەیەك خەریك بوو خۆی لەناو بەرێت.
**بَخَقَ** کوێری کرد.
**بَخِلَ** ڕژدی برد، چاوپیسی کرد.
**بُخل** ڕژدی، چاوپیسی.
**بَخیل** ڕژد، چاوپیس.
● **بَدَّ ١/رجليه** قاچەکانی بلاوکردەوە.
**٢/الرجلَ عن الشيء** دوری خستەوە.
**بُدّ** چارە، ڕێگەچارە.
**بَدء** سەرەتا، دەست پێکردن.
**بِدّ** هاوشان، هاو وێنە.
**بَداءة** دەست کردن بەگشت وسەفەر تائەو جێگەیەی مەبەستە.
**بُداد** بەش، بەرکەوتە، پشك.
**بَدال** وردەواڵە فرۆش، وەك سەوزەو میوەو خواردەمەنی تر.
**بَداوَة** ژیانی بیابان نشینان.
**بِداوَة** بیابان نشینی.

**بَداهَة** سەرەتای هەموو شتێك، هەرشتێکی ئاسایی.
**بِداية** سەرەتا، دەست پێك.
● **بَدَّدَ ١** پرژو بلاوی کردەوە.
**٢/الرجلُ** هیلاك بوو.
**بَذَرَ** پەلەی کرد.
**بَدر** مانگی چواردە، مانگ لەچواردەیەمین شەوی هەڵاتنیدا.
**بَدَرِيّ** بارانی پێش زستان.
● **بَدَعَ ١/الشيء** دای هێناو دروستی کرد، ئەفراندی.
**بِدع** نوێ، تازە.
**بِدعَة** بیروباوەڕی تازە لە ئایندا، هەڵسوکەوتی تازە لە بیروباوەڕو پەرستشە ئیسلامیەکاندا.
● **بَدَلَ ١** ئازاری جومگەو دەستەکان یاخود ئازاری ئێسك. **٢/جێ** نشین، جێگە گرەوەی هەرشتێك.
**بَدَن** پەیکەری مرۆڤ وئاژەڵ.
**بَدو** بیابان نشینانی عەرەب کەدابەش دەبن بەسەر چەند هۆزو تیەیەکدا.
**بَدَوِيّ** کەسێکی بیابان نشین.
**بَديئة** سەرەتای هەرحاڵێك، دروست بوون.
**بَديد** هاوتا، هاوشان.

**بَديع** بەدی هێنەر، جوان، داهێنەر، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە، فەڵەو.

**بَديل** جێگەگرەوە، ئەلتەرناتیڤ.

**بَديلة** پێداویستی یەدەگ.

**بَدين** کەسێك لەشی بەخۆوە بێت، قەڵەو.

**بَديهي** ئاسایی، ئاشکراو سەلمێنراو بەگوێرەی نەریتە عەقڵییەکان.

●**بَذأَ ۱/الشيء:** ڕقی لێی بوو.

**بَذأَ، بَذؤَ** دەم پیس و جنێو فرۆش بوو.

**بَذاءة** بەدزمانی، جنێوفرۆشتن، شتی پڕوپوچ گوتن.

**بَذّاخ** لوت بەرز، خۆبەزلزان.

**بَذّال** زۆربەخشندە.

●**بَذَرَ ۱/الحَبّ:** تۆوی چاند. **۲/ت الأرض:** ڕوەکی لێ دەرهات، ڕوەکی لێ سەوزبوو.

**بَذر** تۆو.

**بَذِر** کەسێك ماڵی خۆ شپرزبکات، دەست بڵاو.

●**بَذّرَ ۱/المال:** بەدەست بڵاوی ماڵی سەرف کرد، ماڵی خۆیی شپرز کرد.

**بَذرَقَ** دیدەبانی کرد، ئێشکی گرت.

**بَذل** بەخشین.

●**بَذَّلَ ۱/الثوب:** لەبەری کرد، پۆشی.

**بَرّ** چاکەکار، ڕاستگۆ، میهرەبان، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە، فەرمانبەردار، بیابان، زەوی وشکەڵان.

**بِرّ** چاکە، دیاری، سیلەی ڕەحم و بەزەیی، گوێڕایەڵی.

**بُرّ** گەنم.

**بَرّاد، بَرّادَة** فێنك کەرەوەی ئاو، ئامێرێکی کارەباییە ئاو فێنك دەکاتەوە بەڵام نایکاتە سەهۆڵ.

**بُرادَة** وردەئاسنی هەڵوەریو لەئەنجامی لەبڕیەن داندا.

**براز** جەنگ.

**بَراعة** تایبەت مەندێتی وەرگرتن، زمان پاراوی.

**بَرافين** پارافین.

**بَرّاقة** هەرچی شتێك درەخشاوەبێت، هەرچ شتێك بریسکێتەوە.

**بُرام** دەزوو.

**بَرائة** بێ گوناهی، بێ لەکەیی، دوری.

**بَرّاة** چەقۆ، بڕەر، بڕندە.

**بَراء** دورلە لەکەو پەڵەو ناتەواوی.

**بَربَرَ** قسەی زۆری بێ سودی کردو لەتوڕەیدا هاواریکرد.

●**بَرّ ۱/بِرّاً:** گوێڕایەڵی کرد.

**بُرتُقال** پرتەقاڵ.

**بُرثُن** چنگاڵی شێر.

**بُرج** قەڵا، بورج، کۆشك.

**بُرجاس** کورتان، پۆشاکێکە دەخرێتە سەر پشتی گوێدرێژ.

**بِرجِيس** ئەستێرەی موشتەری.

**بَرِحَ** سڕایەوە، لەناو چوو.

●**بَرَّحَ ١/بِهِ الأمرُ:** هیلاك وشەکەتی کردو ئازاری زۆری پێگەیاند.

**بَرح** سەختی و دژواری.

**بُرحاء** تەنگانە، ئازار، خراپە.

**بَرَدَ** سارد بویەوە.

●**بَرَّدَ ١/هُ:** ساردی کردەوە.

**بَرد** سەرما، ساردیی، خەوتن، نوستن.

●**بَرَدَ ١/فلان:** خەوت، نوست.

**بَرَد** تەرزە، دڵۆپە بارانی بە سەهۆڵ بووگ.

**بُرِدَ** سارد کرایەوە.

**بَردَج** دیل، بەخسیر، ئەسیر.

**بَرَزَ** ئاشکرابوو، دەرکەوت.

**بَرزَخ** ماوەی نێوان دنیاو قیامەت، ژیانی ناو گۆڕ.

**بُرس** لۆکە.

**بَرسَمَ** توشی هەوکردنی پەردەی نێوان جگەر ودڵ هات.

**بَرِشَ** لەسەر پێستی لەشیدا پەڵە و نیتکەی سپی بەدەرکەوت.

●**بَرشَمَ ١/الرَجلُ:** دڵتەنگی خۆی ئاشکرا کرد.

**بَرِصَ** توشی بەڵەکی بوو.

**بَرَص** بەڵەکی، پیسی.

**بَرطَلَ** بەرتیلیدا.

**بَرِعَ** لە زانستدا یان لەجوانی یاخود لە ڕێزداریدا دەرکەوت.

**بَرعَمَ** خونچەی کرد.

**بُرعُم** خونچە، گوڵ بەر لە پشکوتنی.

●**بَرغَثَ ١/المكان:** مێشولەی تێدا زۆر بوو.

**بَرغَش** مێشولە، پێشکە.

**بُرغوث** مێشولە، پێشکە.

**بِرفير** ڕەنگی ئەرخەوانی، ڕەنگی تێکەڵ کراوی شین و سور.

**بَرَقَ** درەخشایەوە، بریسکایەوە، بریکەیدا، بروسکەی نارد، سەفەرێکی دووری کرد.

**بَرق** ڕوناکی هەورەتریشقە، تەلەگراف.

●**بَرقَحَ ١/الثوبُ:** چڵکن بوو، پیس بوو.

●**بَرقَشَ ١/هُ:** بەڕەنگی ئاڵ وواڵا ڕازاندیەوە. ٢/**في الكلام:** قسەی تێکەڵاو کرد، قسەی تێکەڵ وپێکەڵ کرد.

**بَرقَعَ** پەچەی پۆشی، دەمامکی لەڕونا.
**بُرقَع** پەچە، دەمامك، ڕوبەند، نیقاب.
**بُرقوق** جۆرە هەڵوژمیەکی بچوکە.
**بَرقِیّة** بروسکە، پەیامی تەلەگراف.
**بَرك** سینە، سنگ.
**بَرَكَ** نیشتەجیبوو، سەقامگیر بوو.
**بِركال** پرگاڵ، ئامێرێکی دووقاچەدارە بۆ دروستکردنی شێوە ئەندازەییەکان بەکاردێت بەتایبەتی بۆ دروستکردنی هێڵی بازنەیی.
**بِركَة** گۆمی ئاو، گۆلاو، چاڵاو، حەوز.
**بُركان** گڕکان، بورکان.
**بُركُع** پیاوی کورتە باڵا.
**بَركَة** فەڕ، پیرۆزی، بەرەکەت.
**بَرِمَ** دڵگران بوو.
**بُرمَة** قابلەمە، دەفری تایبەت بە ئاشکردن.
**بِرميل** بەرمیل، بوشکە، یەکەی پێوانەکردنی پترۆڵ.
**بَرنامَج** بەرنامە، پرۆگرام، فەهرست، پێڕستی هەرکارێك.
**بُرنُس** هەرپۆشاکێك سەرپۆشەکەیشی پێوەلکابێت.
**بَرنِی** چاکترین جۆری خورما.

**بُرهان** بەڵگەی ڕون وئاشکرا وحاشا هەڵنەگر.
**بَرهَنَ** بەڵگەی هێنایەوە.
**بُرهَة** بەشێك لەکات.
**بَرّي** زەمینی، بیابانی.
**بَريء** پاك، بێگوناه، بێ تاوان.
**بَريد** پۆستەچی، پەیك، نامەبەر، فەرمانگەی پۆستە.
**بَرِیّة** وەدی هێنراوان، خەڵك.
●**بَرِیءَ** ١/**من المَرَض**: چاك بووەوە. ٢/**من العَیب**: لێی ڕزگار بوو.
●**بَزَّ** ١/**الشَيء منهُ**: بەتوبزی لێی سەند.
**بَزّاز** کوتاڵفرۆش، قوماش فرۆش.
**بُزاق** ئاوی دەم، لیك، تف.
**بَزَجَ** کەش وفشی کرد، شانازی کرد.
●**بَزَرَ** ١/**الإناء**: پڕی کرد. ٢/**الحبوبَ**: چاندی.
**بُزاع** منداڵێك بێشەرمانە قسان بکات.
●**بَزَغَ** ١/**ت الشمسُ**: درەخشایەوە، هەڵهات.
**بَزَقَ** تفی کرد، تفی داکرد.
●**بَزَلَ** ١/**الشيء**: کونی کرد، لەتی کرد.
**بَزَل** ناڕەحەتی، توندو تیژی، تەنگ وچەڵەمە.

**بَزَمَ** به ددانەکانی پێشەوەی گرتی، بە ددانەکانی پێشەوەی گەستی.

**بَزَمَخَ** لوت بەرزی نواند، کەش وفشی کرد.

**بَـزِيّ** شیرخۆر، خوشك یاخود برای شیری، کەسێك بەهۆی شیر خواردنەوە بو بێتە مەحرەم.

● **بَـسَّ ١/المالَ**: پرژوبلاوی کردەوە. **٢/السويقَ**: تێکەڵی ڕۆنی کرد.

**بَس** بەس، تەواو.

**بِساط** زەوی فراوان، زەوی پان وبەرین.

**بَساطَة** سادەیی، خاکێتی.

**بَسَّام** زۆر زەردەخەنە کەر، کەسێك زۆر ڕوخۆش بێت، دەم بەخەندە.

● **بَسبَسَ ١/بهِ**: پێی گوت: بەس.

**بُستان** باخ، بێستان.

**بَسر** خورمای کاڵ، هەرشتێکی تازەو نوێ، ئاوی سارد.

● **بَسَطَ ١/اليدَ**: دەستی درێژکرد، دەستی ڕاکێشا، دەستی بلاوکردەوە. **٢/العُذرَ**: پاساوی هێنایەوە یان بەعوزر قایل بوو.

● **بُسِط ١/من الأيدي**: دەستی کراوە، دەستی ئاوەلا.

● **بَسَّطَ ١/الثوبَ**: ڕایخست، پانی کردەوە.

**بَسيط** ئاسان، سادە، ساکار.

**بَسطَة** فراوانی لەزانستدا.

**بَسَلَ** ڕوی گرژ بوو لەئازایەتی یان لەتوڕەیدا.

**بَسُلَ** ئازاو چاونەترس بوو.

● **بَسَّلَ ١/هُ**: ڕقی لێی بوو. **٢/نفسهُ للموتِ**: خۆی دایە دەست مەرگ.

**بَسل** حەرام، حەلاڵ.

**بَسَمَ** زەردەخەنەی کرد.

**بَسمَلَ** دەستە واژەی "بسم الله الرحمن الرحيم"ی گوت.

● **بَشَّ ١/للضيفِ**: ڕوی تێکردو دڵخۆش بوو پێی.

**بَشّ** ڕوخۆش.

**بَشارَة** جوان ڕوخساریی.

**بَشاشَة** خۆش ڕوییی، شادومانی.

**بَشاعَة** بەدخوییی، خراپەکاری.

● **بَشَرَ ١/بهِ**: پێی دڵخۆش بوو. **٢/الأمرَ**: گرنگی پێداو لەئەستۆی گرت.

**بَشَّرَ** هەواڵی خۆشیدا، مژدەیدا، هەواڵی خۆشی گەیاند.

**بَشَر** مرۆ، مرۆڤ ئادەمیزاد.

● **بَشَرَ ١/الجلدَ**: موی پێستی ڕوتاندەوە.

**بِشر** شادی، شادومانی.

**بَشَرَة** پێستی لەش.

بُشرى مزده، موزده، هەواڵێکە شادومانی ببەخشێت.

بَشِعَ دەمی بۆگەن بوو بەهۆی نەشۆردنی دەم وسیواك نەکردنەوە، قێزەون وترسێنەر بوو.

بَشِع خۆراکی تام ناخۆش، روگرژ.

●بَشَقَ ١/ە بالعصا: لێیدا.

بَشِمَ بێزار بوو، نەفرەتی کرد.

بَشیر مزدەدەر، هەواڵی خۆش هێنەر، مزدە.

بَشیع پیاوی ناشیرین.

بَصَّ درەخشایەوە، بریسکایەوە.

بُصاق ئاوی دەم، تف.

●بَصُرَ ١/ە: بینی، چاوی پێی کەوت. ٢/بە: پێی زانی.

●بَصَرَ ١/الشیء: بڕی.

●بَصَّرَ ١/الجرو: چاوی کردەوە.

بَصَر بینایی، دانایی، زانست، هەست کردن، دەرکی بینین.

●بَصَعَ ١/ە: کۆی کردەوە.

بَصَقَ تفی کردەوە.

بَصَل پیاز.

بَصَلَة سەلکی پیاز.

●بَصَمَ ١/القماش: وێنەی لەسەر دروست کرد.

بَصمَة نیشانە، ئاماژە، نیشانەی سەرە پەنجەکان.

بَصیر بینەر، خاوەن، یەکێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە.

●بَضَّ ١/ت العین: فرمێسکی رژاند، ئەسرینی داباراند. ٢/الماء: کەم کەم رژا. ٣/لە: پێی بەخشی.

بِضاعَة کالا، شمەك، ئەو سامانەی بۆ بازرگانی ئامادە دەکرێت.

بَضَّضَ لەنێو نازو نیعمەتدا ژیا.

●بَضَعَ ١/الکلام: لێی تێگەشت، لێی حاڵی بوو. ٢/الکلام: رون بویەوە.

بَضْع پارچە گۆشت.

بُضْع مارەیی ژن، جوت بون، تەلاق، ئەندامی زاو زێی ئافرەت.

●بَضَّعَ ١/الشیء: پارچە پارچە بڕی.

بِضْع هەندێك، لەنێوان سێ تاکو نۆ دانە، بەش.

بُضم دەرون.

بَضَّة ژنی پێست ناسك، ژنی ناسك ونازدار.

بَطَّ لەتی کرد.

بَطّ سۆنە، مراوی.

بَطاطا پەتاتە.

بِطاقَة کارت، بلیت.

**بَطّال** قارەمان، دلاوەر.
**بَطالَة** ئازایەتی، دلێری، چاونەترسی.
**بِطالَة** بێ کاری، ڕۆژی بێ کاری.
●**بَطَأَ ١/عليه الأمرُ:** دوای خست، پاشی خست.
●**بَطَحَ ١/هـ:** خستی بەدەمدا، ڕایخست.
**بَطحاء** ناوی سەرزەمینی مەککەیە.
●**بَطَخَ ١/هـ:** لێسایەوە.
●**بَطِرَ ١/النعمة:** سوکایەتی پێکردو سوپاسی گوزاری نەبوو.
**بَطِر** سوپاس نەکەری نیعمەت.
**بِطر** ناڕەواو بێ سود.
**بَطریق** پەنگوین، باڵدارێکە پتر لەنێو ئاوو جێگە ساردەکاندا دەژی.
**بَطشَة** هەڵمەتی نائاگایی.
**بَطش** توندوتیژی، دڵ ڕەقی.
**بَطَشَ** لەناکاودا هەڵمەتی برد، هێرشی نائاگایی برد.
**بُطلان** پوچەڵ بونەوە.
**بَطَلَ** بەفیڕۆ چوو، لاوەنرا، بێکار بوو.
●**بَطَّلَ ١/هـ:** لەکاری خست، پوچەڵی کردەوە.
**بَطَل** قارەمان، دلاوەر.
●**بَطُلَ ١/بطولة:** قارەمان بوو، ئازا بوو.
**بَطَنَ** پەنهان بوو، سکی زل بوو، دڕێی ڕەویەوە، ورگن بوو.
**بَطِن** سك زل، ورگن.
**بَطن** سك، زگ.
**بِطنَة** زۆر خۆری، زیادەڕەوی کردن لەخواردندا.
**بَطَّة** مراوی، سۆنە.
**بَطّیخ، بِطّیخ** گندۆرە، کاڵەك.
**بَطیش** سەخت گیر، توندوتیژ.
**بَطیط** درۆ، بەڵا، قسەی ناڕاست.
**بَطین** سك زل، ورگن، پڕ، لێوان لێو.
**بَطِیء** هێواش، هێدی، هێور، لەسەرخۆ.
**بُطء** هێواشی، لەسەرخۆیی، هێواش ڕێکردن وجوڵانەوە.
**بَظّ** قەڵەوێکی پێست ناسك، کەسێك بەهۆی قەڵەویەوە پێستی تەنك وناسك بێت.
**بَظر** قیتکە، ئەو بەشەی ئەندامی زاوزێ کە مێینە دەگەیەنێتە ئۆرگازم.
●**بَعَّ ١/الماء:** ئاوێکی زۆری ڕژاند.
**بُعاق** لافاوی زۆر گەورە، زریانی مەزن.
**بَعبَعة** توربوون، قسە تێکەڵ کردن بەهۆی پەلەکردن لەقسەدا.

● **بَعَثَ ١/هُ**: بەتەنها ناردی، بەتەنها ڕەوانەی کرد، وروژاندنی، ژیاندیەوە. **٢/الميت**: زیندوی کردەوە.

**بَعث** شەو بێدار، کەسێك شەو نەنوێت.

**بَعث** زیندوبونەوە، ژیانەوە، قیامەت.

● **بَعثَرَ ١/الشيء**: پرژوبلاوی کردەوە. **٢/المتاع**: هەڵی گێڕانەوە بەسەریەکتریدا.

**بِعثة** دەستەی نێردراو، شاند.

**بَعَجَ** بڕیی، هەڵی دڕی.

**بَعُدَ** دورکەوتەوەو مرد.

● **بَعَّدَ ١/هُ**: دوری خستەوە.

**بَعد** دوا، ماوەی دوری، مەرگ.

**بُعد** دووریی.

**بُعَد** خێر، سود.

● **بَعزَقَ ١/هُ**: پرژوبلاوی کردەوە.

● **بُعِضَ ١/الرجلُ**: مێشولە گەستی، مێشولە پێوەیدا.

**بَعض** هەندێ، هەندێك.

● **بَعطَ ١/الحيوانَ**: سەری بڕی.

**بَعط** زیادڕەوی لەکاری خراپدا.

● **بَعَقَ ١/الجملَ**: سەری بڕی. **٢/البئرَ**: هەڵی کەند.

● **بَعكَ ١/الجسمُ**: قەڵەو بوو.

● **بَعَلَ ١/الرجلُ للمرأة**: بویە سەرپەرشتیاری، بویە هاوسەری.

**بَعل** زەویەك بەئاوی باران ئاوبدرێت، دێم.

**بَعو** گوناه، هەڵە، خەتا.

**بَعوض** مێشولە، پێشکە.

**بَعيد** دوور، پێچەوانەی نزیك.

**بَعير** وشتری ٩ یان ٤ ساڵە.

**بَغّ** هەڵچوو، وروژا.

**بُغا** پێداویستی.

● **بَغا ١/عليه**: دەست درێژی کردە سەری.

● **بَغَتَ ١/هُ**: لەکتوپڕدا هات بۆلای.

**بَغت** کتوپڕ، ناکاو، ناگەهان.

**بَغتة** ناگەهانی، کتوپڕی.

**بَغثَ** ڕەنگی بویە سپیەکی سەوز باو.

**بَغثاء** خەڵکی تێکەڵ و پێکەڵ.

**بُغثة** ڕەنگی پێستی پەز.

● **بَغَرَ ١/ت السماءُ**: بارانی باراند.

**بَغر** ڕەهێڵە بارانێکی بەهێز.

● **بَغَزَ ١/هُ**: بەگۆچان لێیدا.

**بَغز** خێرایی جموجوڵ وچالاکی.

● **بَغَشَ ١/ت السماءُ**: بارانێکی کەمی باراند، سوکە بارانێکی باراند، نەمبارانێکی باراند.

**بَغشَة** بارانی هێواش ونەرم.

**بَغِضَ** ڕقاوی بوو، بویە کەسێکی ڕق لەدڵ.

**بَغیض** زۆر ڕقاوی، زۆر کینە لەدڵ.

**بُغض** ڕق وکینەو دوژمنی.

**بَغضاء** دژایەتی توندوتیژ، ڕقێکی زۆر.

●**بَغَلَ ١/في المشي:** لاوازو سست بوو.

**بَغل** هێسر، ئێستر.

●**بَغَمَ ١/ت الظبیة:** بۆ ڕاندی.

**بُغوم** بۆڕەی گاو بزنەکێوی.

**بَغوَة** میوە بەرلە پێگەشتنی.

**بَغی** یاخی بوو، ستەمی کرد، دەست درێژی کرد.

**بَغي** ستەم، یاخی بوون.

**بِغیة،بُغیة** پێداویستی، هەرچی شتێك داوابکرێت.

● **بَقَّ ١/النبت:** دەرهات، ڕوا. **٢/لنا العطاء:** فراوان وزۆری کرد. **٣/ماله:** شپرزی کرد.

**بَقّار** گاوان.

**بَقاق** شمەك وپێداویستیەك كە نالەبار وخراپ بێت لەماڵدا، خاشاك.

**بَقّال** سەوزە فرۆش، میوە فرۆش.

●**بَقّا ١/ه:** سەقامگیریکرد، هێشتیەوە، نەیهێلا لەناوبچێت.

**بَقاء** مانەوە، پایەداری، نەمریی، هەمیشەیی.

**بَقَرَ** هەڵی دڕی ولەتی کرد، کردیەوە، فراوانی کرد.

**بُقَر** بەلا، درۆی ئاشكرا.

**بَقَر** گا، نێرەی چێڵ.

**بَقَرَة** مانگا، چێڵ.

●**بَقَطَ ١/متاعه:** کۆی کردەوە بۆ سەفەر.

●**بَقَّطَ ١/الشيء:** شپرزی کرد، پرزوبلاوی کردەوە. **٢/في الجبل:** سەرکەوت.

**بَقَط** کۆمەڵێکی پەرتەوازە، ئەو خورمایەی لەکاتی ڕنیندا دەکەوێتە سەرزەوی.

**بُقطَة** بەشێك یان پارچەیەك لەزەوی، وشەکە هاوشانی وشەی (**بقعة**) یە.

●**بَقِعَ ١/فلان بالشيء:** کومسایی پێ هات. **٢/الطیر:** ڕەنگی جۆراو جۆر بوو.

**بَقَع** جۆراو جۆری ڕەنگ لەمریشك وسەگدا.

**بُقعَة** لەکە، پەڵە، شوێن، جێگە، بەشێك کەلەچوار دەوری خۆی جیاوازبێت.

●**بَقَلَ ١/** دەرکەوت. **٢/وجه الغلام:** توکی لێ دەرهات.

**بَقلاَوي** جۆره شیرینیه‌كی ناسراوه.

**بُقّم** داری بادام، دره‌ختی بادان.

**بَقِيَ** مایه‌وه، به‌جێما، به‌رقه‌رار بوو.

**بَقِيَّة** پاشماوه‌ی شت.

●**بَكَّ** ١/**الرجلَ**، هه‌زاركه‌وت. ٢/**الناقةَ**، له‌ڕێ كردندا هیلاك وشه‌كه‌تی كرد.

**بُكابِك** شادومان، فیزكه‌ر، كه‌ش وفش كه‌ر.

**بَكـارَة** ئه‌ومیه ئافره‌ت به‌داوێن پاكی مابێته‌وه‌و په‌رده‌ی كچێنی نه‌دڕابێت وله‌ده‌ستی نه‌دابێت.

**بَكامَة** كه‌ڕی زگماكی.

**بُكاء** گریان، فرمێسك ڕشتن.

●**بَكَأَ** ١/**ت البئرُ**، ئاوی كه‌م بووه‌وه. ٢/**ت الناقةُ**، شیری كه‌م بووه‌وه.

●**بَكَتَ** ١/**ه**، به‌شمشێر یان گۆچان لێیدا، به‌به‌لگه به‌سه‌ریدا زاڵ بوو.

**بَكّتَ** سه‌رزه‌نشتی كرد.

**بُكرَة** كۆمه‌ڵ، تاقم، ده‌گوترێت: (**جاؤا على بَكرَة ابيهم**) له‌كاتێكدا ئه‌م قسه‌یه ده‌گوترێت كه كۆمه‌ڵێك بۆ شتێك ئاماده ببن وهیچ كه‌سێكیان لێ دوانه‌كه‌وتبێت.

●**بَكَرَ** ١/**عليه**، زوو هات بۆ لای.

**بِكر** كچی شونه‌كردوو، ده‌ست پێكردنی هه‌رشتێ، نوێ، تازه، نفت، نۆبه‌ره‌ی منداڵ بۆ باوك ودایكی ئیدی كوڕبێت یان كچ.

**بَكَر، بُكرَة** به‌یانی سه‌رمتای ڕۆژ.

●**بَكَسَ** ١/**ه**، سه‌ركوتی كرد.

●**بَكَعَ** ١/**ه**، لێدانێكی توندی لێداو هات به‌وێزه‌یدا له‌چه‌ندجێگه‌یه‌كی جیاجیای له‌شیدا.

●**بَكَلَ** ١/**الشيءَ**، تێكه‌ڵی كرد، تێكه‌ڵاوی كرد.

**بِكلَة** شێوازو جلوبه‌رگ، سروشت.

**بَكِمَ** لاڵ بوو.

**بَكُمَ** به‌ده‌ست ئه‌نقه‌ست خۆی لاڵ كردو بێده‌نگ بوو.

**بَكّة** مه‌ككه‌ی پیرۆز.

**بَـكى** گریا، فرمێسكی ڕژاند.

**بَكيء** كه‌م، له‌هه‌رشتێك.

**بَلأَ** ژنی بێ حه‌یا، ژنی بێ ئابڕوو.

●**بَلا، بَلوا** ١/**الرجلَ**، تاقی كردمووه.

**بِلاتين** پلاتین، ئاڵتونی سپی.

**بَلاغ** گه‌یاندنی په‌یام وفه‌رمان، ئاگادار بوون، ئاگاداری.

**بَلاغـة** ڕه‌وان بێژی، شێوازی جوان وپاراوی ده‌ربڕین.

●**ساقَى** ١/ه: هەریەکەیان ئاو یاندا بە هاورێ کەی خۆیان.

**ساكت** خامۆش، ئارام، بێدەنگ.

**ساكن** دانیشتوو، نیشتەجێ، بێ جوجۆڵ.

●**سالَ** ١/سؤالا: داوای کردو پرسیاری کرد. ٢/سیلا: ڕژا، لەبەری ڕۆشت.

**سالِف** پێشین، ڕابردوو.

**سالفَة** ڕۆژگارەکانی ڕابردوو.

**سالِم** دروست، تەواو، سەلامەت.

●**سالَمَ** ١/ه: ئاشتی لەگەڵدا کرد.

●**سَامَ** ١/السلعة: خستیە بەرچاوو نرخەکەشی ئاشکراکرد. ٢/ت الماشیة: چونە دەرێ بۆ لەوەڕگە.

**سام** مردن، خەیزەران، ناوی باوکی نوح.

●**سَامَتَ** ١/ه: ڕوبەڕوی بویەوە، بەرانبەری بویەوە.

●**سامَرَ** ١/ه: بەشەودا قسەی لەگەڵدا کرد.

**سامِق** بالابەرز، بڵند بالا.

**سامِه** سەرسام، سەرسوڕماو، مەدهۆش.

**سامَة** خەیزەران.

●**سامى** ١/الرجل: فیزوکەشخەی بەسەردا کرد.

**سامى** بڵندپایە، بەرز، بڵند.

**سانِحَة** هەل، بوار، دەرفەت، ماوە، جێگەی لەبار.

●**سانَدَ** ١/ه: یارمەتیدا.

●**سَاوَمَ** ١/سازشی کرد. ٢/بالسلعة: سازشی پێومکرد، نرخێکی زۆری لەسەرداناو کڕیارەکەشی نرخێکی کەمی پێدا تاکو دوایی فرۆشیار لەقسەی خۆی دێتە خوارێ ولەنرخێکدا لەگەڵ کڕیاردا ڕێ دەکەوێت.

●**ساوى** ١/الشیء: یەکسان ورێکی کرد. ٢/بینهما: ڕێکی کرد.

**ساه** کەسێك ئاگای لە کارەکەی نەمێنێت ودڵی بچێت بۆ لای کارێکی تر.

**ساهِر** شەو بێدار، کەسێك شەو نەنوێت.

**ساهِف** کەسێك لە کاتی بەرانبەر بونەوەدا تینوێتی زۆری بۆ هێنابێت، کەسێك زۆری تینوبێت.

**ساهِك** ئازارو نەخۆشیی چاو، چاویەشە.

**ساهِمَة** مێینەی وشتری لات ولەڕ.

**ساهِي** بێ ئاگا، فەرامۆش کار، پشتگوێ خەر.

●**سایَرَ** ١/ه: لەگەڵیدا بەرێدا ڕۆشت.

●**ساءَ** ١/الأمرُ فلاناً: دڵتەنگ ونارەحەتی کردو بە لایەوە ناخۆش بوو. ٢/به ظناً:

گومانی خراپی پێ برد. ٣/الشيءُ: خراپ وبەدبوو.

●**سَأَبَ** ١/هـ: خنکاندی. ٢/السقاءَ: فراوان وپانی کرد.

**سَأب** مەشك، مەشکە، خیگ.

●**سَأَتَ** ١/هـ: خنکاندی.

●**سَأَدَ** ١/خواردیەوە. ٢/الجرحُ: کرایەوە.

**سَأَرَ** ئاوی لەدەفرەکەخواردەوە وکەمێکی لێ هێشتەوە.

●**سَأَرَ** ١/الشيءُ: مایەوە، بویەدەماو.

●**سَأسَأَ** ١/بالحمار: هەچەی لێکرد، یان بانگی کرد بۆ ئاوخواردنەوە.

●**سَأَلَ** ١/عنهُ: پرسیاری کرد لە بارەیەوە، پرسی.

●**سَأَوَ** ١/الثوبُ: ڕایکێشا ودڕا.

**سَأو** نیشتمان، کۆتایی شت، دووری.

●**سَبَّ** ١/جنێویدا، جنێوێکی ئازاربەخشی دا. ٢/الحبلَ: بڕی، قرتاندی.

**سَبّ** جنێو، بوهتان.

**سَبَأ** ناوی شارەکەی بەلقیس لەیەمەنی کۆندا.

**سِبَأ، سَبيئة** مەی، بادە، شەراب.

●**سَبَأَ** ١/الخمرَ: کڕی بۆ ئەوەی بیخواتەوە. ٢/الجلدَ: دای ماڵی. ٣/الجلدَ بالنار: سوتاندنی. ٤/الرجلَ: تەوقەی لەگەڵدا کرد.

**سَبأ** پێستە داماڵین، دڕۆ.

**سَبّابة** پەنجەی شایەتمانی دەست.

**سَبّاح** زۆر مەلەوان.

**سِباحة** مەلەوانێتی، مەلەکردن لەئاودا.

**سَبار** توخمە دڕندەیەکی ئەفریقیە.

**سُباطة** تاڵە قژ کە لەکاتی قژ داهێناندا هەڵدەوەرێن، جێگەی تورپدانی پیس وپۆخڵی.

**سِباق** کێ بەرکێ، پێش پێشین، پێش برکێ.

●**سَبَّبَ** ١/هـ: زیادەڕەوی کرد لەجنێو پێدانیدا.

**سَبَب** هۆ، هۆکار، فاکتەر، سۆنگە.

●**سَبَتَ** ١/پێی نایە ڕۆژی شەممەوە، حەسایەوە. ٢/الشيءَ: بڕیی. ٣/الرأسَ: چاکی کرد.

**سَبت** ڕۆژگار، پیاوی خەواڵو، پیاوی زیرەك، ڕۆژی شەممە، ڕۆژێکی هەفتەیە لەنێوان هەینی ویەك شەممەدا، مێرد منداڵی ئازاو چاونەترس.

**سِبت** پێستەی خۆشەکراو.

●**سَبَحَ** ١/دوور ڕۆشت. ٢/في الماءِ: مەلەی کرد. ٣/في الأرضِ: چاڵی هەڵکەند.

**سَبَّحَ** واژەی **(سبحان الله)** ی گوت.

**سُبح** سوپاس، ستایش.

●**سَبَحَ ١/الرجلُ:** خەوت، نوست. **٢/ عن الأمر:** دەستی لێ بەتاڵ بوو.

**سُبحانَ** پاك وبێ گەرد و بێ لەکە وپەڵمیە.

**سُبحَة** نزا، پاڕانەوە، نوێژی سوننەت، دانەکانی تەسبیح، دنکۆڵەی تەزبیح.

**سَبَّخَ** خەوێکی قوڵی لێکەوت.

**سَبَّخَ** خەوێکی قوڵی کرد.

●**سَبَدَ ١/الشعرَ:** تاشی، چاکی کرد. **٢/شاربهُ:** موی سمێڵی درێژ کردەوە تاکو ڕژایە ناودەمی.

**سِبد** گورگ، بەڵاو نارەحەتی.

**سَبَد** کەمێك موو.

●**سَبَرَ ١/الماءَ:** قوڵاییەکەی تاقی کردەوە تاکو بزانێت ئەندازەکەی چەندە. **٢/الأمرَ:** تاقی کردەوە.

**سَبر** بنەڕەت، ڕەنگ، شێوە، شێری بێشەوجەنگەڵ.

**سِبر** دوژمنایەتی، ڕقابەری.

●**سَبِطَ ١/الشعرُ:** خاو وپەخش بوو.

**سِبط** کوڕەزا، کچەزا، بە زۆری بۆ کچەزا بەکاردێت لەبەرانبەر(**حفيد**) دا کەبۆ کوڕەزا بەکاردێت، کۆمەڵێك لەجولەکە، منداڵان ونەوەکانی یەعقوب.

**سَبْط** بارانی بەلێزمە، بارانی بەخوڕ.

●**سَبَعَ ١/القومَ:** بویە حەوتەمیان، کردنیە حەوت، حەوت یەکی سامانەکەی بردن. **٢/الشيءَ:** کردیە حەوت، دزی. **٣/الرجلَ:** غەیبەتی کرد، جنێوی پێدا.

**سُبْع** حەوت یەك، ١/٧ ی هەر شتێك.

**سَبُع** درە ندە، شێر.

**سَبْع، سَبْعَة** حەوت، ژمارەی نێوان ٦و٨.

**سَبعُون، سَبعِين** حەفتا، حەوت جاران دە.

**سَبْعَةُ أضعاف** حەوت بەرابەر، حەوت ئەوەندە

●**سَبَغَ ١/الشيءُ:** تەواو وبێ کەم وکورتی بوو. **٢/الثوبُ:** درێژ بوو بەرەو زەوی.

**سَبْغَة** خۆشگوزەرانی.

●**سَبَقَ ١/الى كذا:** پێشڕەوی کرد بۆی. **٢/على قومه:** لە ڕووی ڕێزەوە لەوان بەرزتر بوو.

**سَبَّقَ** پێش دەستی کرد.

**سَبَق** ئەو شتەی گرەوی لەسەر دەکرێت.

**سَبَق، سِباق** قەیدو هەر شتێکی تری بەستنەوەی ئاژەڵ.

سَبَكَ، سَبَّكَ زیوی تواندەوە و کردیە قالب.

●سَبَلَ ٨/هـ: جنێوی پێدا.

●سَبَّلَ ٨/المالَ: خستیە پێناوی خودا، کردی بەخێر.

سَبَل باران بەر لەوەی بدات لە زەوی، خوێن یان بارانی تکاو، لوت، پۆشاکی درێژ.

سَبَلَة گوڵە گەنم، گوڵە جۆ.

سَبَّة گەرمی یان ساردیەك چەند ڕۆژێك بخایەنێت، شەپۆلی گەرماوسەرما.

●سَبيَ ٨/العدوَ: دیلی کرد، گرتی بەدیل.

سَبِيّ دیل، بەندکراوی لەجەنگ داگیراو ئیدی چ نێر بێت یان مێ.

سَبيكَة پارچە زیوێك توێنرابێتەوە نێو قالب وپاشان لەقالب دەرهێنرابێت، قالبی زیو.

سَبيل ڕێگە، ڕێگەی ڕۆشن، ڕێباز.

سَبِيَّة ژنی دیل کراو، مەی لەولاتێکەوە برا بێت بۆ ولاتێکی تر، مرواری کەمەلەوان دەری دێنێت.

سَتّ قسەی ناشیرین، لەکەو پەڵەو ناتەواوی، عەیب وعار.

سِتّ شەش، ژمارەی نێوان پێنج وحەوت.

سَتّار زۆر پۆشەر، زۆر داپۆشەر، ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە.

سِتْر ترس، پەردە، شەرم.

سَتْر سوپەر، قەڵغان.

●سَتَرَ، سَتَّرَ ٨/الشيء: داپۆشی، شاردیەوە.

سُتْرَة چاکەت، پاڵتۆ.

سُتَارَة ئەو شتەی شتی تری پێ دەشاردرێتەوە ودادەپۆشرێت.

●سَتِلَ ٨/هـ: شوێنی کەوت، بەدوایدا ڕۆشت.

سَتْل باڵندەیەکە لەداڵ دەچێت.

سِتُّون شەست، شەش جاران دە.

●سَتَهَ ٨/الرجلَ: شوێنی کەوت، لەدوایەوە ڕۆشت.

سَجّة شیرێك ئاوی زۆر بێت، شیری تراو.

سُجَاح هەوا.

سَجَّاد زۆر کڕنوش بەر.

سَجَّادَة بەرماڵ، شوێنی نوێژکردن، پارچە قوماشی پاکی نوێژ لەسەرکردن.

سِجَافَة پەردەو حیجاب.

سَجَّان خاوەنی زیندان، پاسەوانی زیندان، زیندانەوان.

سَجْح ڕێگەو ناوەڕاستی ڕێگە.

**سَجَدَ** كڕنوشی برد، ڕووی خۆی لەسەر زەوی دانا بۆ خواپەرستی، سوژدەی برد.

**سِجْدَة** كڕنوش، سوژدە.

●**سَجَرَ ١/التنورَ:** پڕی كرد لە سوتەمەنی وگەرمی كرد. ٢/**الماءُ النهرَ:** پڕی كرد.

**سَجَر** تێكەڵاو بوونی سوری بە سپیایی چاو.

**سَـجر** پڕكـردن، هەڵگیرسـاندنی ئـاگر، دەنگی هەورە چەخماخە.

**سُجرة** ئاوێك ڕوبار پڕ بكات.

●**سَـجَعَ ١/الخطيـبُ:** قسەی سـەرواداری كرد. ٢/**ت الحمامةُ:** گمەگمی كرد.

**سَجِفَ** ناو قەدی باریك بوو.

**سَجَف** ناو قەد باریكی، كەمەر باریكی.

**سِجف، سَجف** دووپەردە نێوانیـان كـەل بێت بۆ سەرەوە.

●**سَجَلَ ١/الماءَ:** ڕژاندی. ٢/**بِهِ:** لە سەرەوە فڕێیدا.

**سَـجْل** دۆڵچەی گـەورە ئـاوی تێـدا بێـت، گوانی گەورە.

**سِجِلّ، سجيل** پەڕاوێكە جۆرەها زانیـاری تایبەتی بەهەر فەرمانگەو مەسـەلەیەكی تێدا كۆ دەكرێتەوە، تیانووسی تۆمار.

●**سَـجَّلَ ١/**تۆمـاری كـرد، لـە تیانووسـدا نوسـی. ٢/ **القاضيُ عليـه:** فـەرمانی بـە سەردا سەپاند. ٣/**هدفاً:** گۆڵی كرد، گۆڵی تۆمار كرد.

●**سَـجَمَ ١/الـدمعُ:** ڕژا ئـیتر بـەزۆری یـان بەكەمی.

**سَجَم** ئاو، فرمێسك، ڕۆندك، ئەسرین.

**سَجَنَ** زیندانی كرد، خستیە زیندانەوە.

**سِجن** زیندان، گرتوخانە، زینان.

**سُجُود** كڕنوش بردن، سەر خـستنە سـەر زەوی بۆ خواپەرستی.

**سَجُوم** فرمێسك ڕێژان.

**سَـجِير** دۆسـت، یـار، هـاوەڵ وهـاوڕێی دڵسۆز.

**سَـجِين** زینـدانی، زینـدانی كـراو، گـیراو، حەپس كراو.

**سَجِيَّة** خوو، سروشت.

**سَحَّ** زۆر قەڵەو بوو، گۆشتی زۆری گرت.

**سَحَاب** هەور، عـەور، مـژی زۆر بـەرزەوە بوگ كەبارانی لێ دەڕژێتە خوار.

**سُحَابَة** پاشماوەی ئاو لەچاڵدا.

**سَحَاح** هەوا.

**سُحَاف** نەخۆشی سیل.

**سَحَاة** گۆڕەپان، حەوشەی ماڵ.

**سَحَاءَة** پەردەی مێشك.

●**سَـحَبَ ١/هُ:** بەسـەر زەویـدا ڕای كێـشا. ٢/**الرجلُ:** زۆری خوارد وخواردەوە.

●سَحَتَ ١/مالّ وساماني حەرامی دەست خۆخست. ٢/هـ لەناوی بردو لەبنج وبێخەوە هەڵی کەند، سەری بڕی.
سَحَت لەناوبردن، لە بن وبێخ هەلکەندن.
سُحت، سُحُت یاساغ وحەرام، هەرکارێك مایەی شەرمەزاری بێت وەك بەرتیل خۆری.
سَحْت پۆشاکی کۆن، ئەشکەنجە.
●سَحَرَ ١/هـ فێڵی لێکرد، خەڵەتاندی، چاوبەستی لێکرد.
سِحر سیحر، چاوبەست، جادوو، فێڵ، هەر شتێکی پوچ وناڕاست نیشاندان لەبەرگی ڕاست وهەقیقیدا.
سَحَر کۆتایی شەو وکەمێك بەرلەبەیانی، پارشێو.
سِحرِيّ جادویی، سیحر ئامێز، جادوگەر.
سُحر، سَحر سییەکانی مرۆڤ.
●سَحَّرَ ١/هـ خۆراکی پارشێوی پێدا، سیحری نیشاندا.
سَحّ، سُحّ خورمای وشکی پرژوبلاو.
●سَحَطَ ١/هـ بەخێرایی سەری بڕی.
٢/الشرابَ تێکەڵاوی ئاوی کرد.
●سَحَفَ ١/الرأسَ: چاکی کرد، سەری تاشی.

سَحفَة بەزی پشت.
●سَحَقَ ١/هـ هاڕی، وردوخاشی کرد، لە ناوی برد. ٢/هـ الله دوری خستەوە.
سَحق پۆشاکی کۆنە، هەوری تەنك، هاڕین.
سُحق، سُحُق دووری، پێچەوانەی نزیکی.
سُحکَة کەروێشکی بچوك کەلە دایکی جیا دەبێتەوە.
سَحِمَ ڕەش بوو، ڕەش هەڵگەڕا.
سَحَم ئاسن، ئێسن، هەسن.
سُحُم چەکوشی ئاسنگەر.
سُحمَة، سُحَام ڕەشایی، ڕەشی.
سَحَمَة پارچەیەك ئاسن.
سَحنَة نەرمی پێست، شێوەو ڕەنگ.
سَحُور ئەو خواردن وخواردنەوەیەی لەپارشێودا دەخورێت.
سُحُور پارشێو، هەستانی ڕۆژووەوان بۆ نان خواردن بەر لەبانگی بەیانی.
سَحُوف، سَحِيفَة بارانێك کە زەوی داتاشێت.
سَحِيق دوور.
سَحِيقَة بارانێك زەوی داتاشێت.
سُخَام خەڵوز، ڕەشیی قابلەمە، پەڕی نەرم لەژێر باڵی باڵندەدا.
سُخَامِيّ ڕەش.

**سَخاوَة** دەست بڵاوی بۆ پیاوەتی، بەخشندەیی، سەخاوەت، دەستگوشادی.
**سَخَاء** بەخشش، بەخشندەیی
●**سَخَرَ ١/هُ** سەرشۆڕی کرد، دەستەمۆی کرد، هێنایە ژێر بار، کارێکی دا بەسەردا بەبێ کرێ.
**سَخَرَ، سَخَّرَ** بێگاری پێکرد.
**سُخرَة** بێگاریی، کاری بێ کرێ، سوغرە.
**سِخريّ** کاری بە زۆر پێکراوی بێ کرێ.
**سَخِطَ** تورە بوو، ڕقی هەستا.
**سُخط** تورەیی، دەگوترێت ئەم وشەیە تەنها بۆ تورەیی گەورەکان بەکاردەبرێت.
**سَخَط** ناڕازیمەندی، تورەیی.
**سَخُفَ** ئەقڵ وژیری لاواز بوو.
**سُخف، سَخف** لاوازی ئاوەز.
**سَخَافَة** بێ هێزی وسستی لەهەر شتێکدا.
**سَخْفَة** لاوازی و سستی.
**سَخَّلَ** عەیب ولەکەداری کرد.
**سَخل** لاواز، سست، بێ هێز.
**سَخَم** کینە، ڕق.
●**سَخَّمَ، سَخَم ١/اللحمَ** بۆگەنی کرد.
**٢/الماءَ** گەرمی کرد.
**سَخَم، سُخامي** ڕەش، ڕەشی، ڕەشایی.

**سَخَنَ** گەرم بوو.
**سَخن** گەرمی.
●**سَخَّنَ ١/الشيءَ** گەرمی کرد، هێنایە کوڵ.
**سُخن** گەرم، داغ.
**سَخنَة** گەرمی.
**سَخُونَة** گەرمی، تا، گەرمی لەش لەکاتی نەخۆشیدا.
**سَخيّ** دەست ودڵ کراوە، سەخی وبەخشندە.
**سَخِيَ، سَخا** دەست ودڵ کراوە بوو، سەخی وبەخشندە بوو.
**سَخيف** پیاوی بێ ئەقڵی بێ ئەرزش.
**سَخيمَة** کینە، چڵك وچەپەڵی.
**سِخْيَن** کاردی قەساب، چەقۆی قەساب.
**سَخِين** شلەتێن، هەر شتێکی نەگەرم ونەسارد.
**سَخينَة** چێشتی گەرم، خواردنێکە لە ئارد دروست دەکرێت
**سَدَّ** دایخست، پێومیدا، قوفڵی کرد.
**سَدّ** بەنداو، بەربەستکردن.
**سَدَاد** ڕاست وڕێك.
**سِداد** شیرێ وشك بوبێتەوە لەگوانی وشتردا وکونی گوانەکەی گرتبێت.
**سَداد** هۆشیاری، ئاگایی.

سُدَاد لوت گیران.
سَدّادة دەمبەست، سەرقاپی بۆری.
سُداس شەش شەش.
سُداسيّ شەش تایی، شەش پاڵوو.
سدافَة پەردە.
سَدّان ئامێرێکە ئاسنگەران ئاسنی لەسەر دەکوتن ( سندان).
سَدَان پەردە.
سِـــدانَة پـەردەداری وخزمــەت کردنــی کەعبە.
سَداة ئەندامی نێرینە لەگوڵدا.
●سَدَحَ ٨/ە: سـەری بـڕی وخـستیە سـەر زەوی، دای بـە زەویـدا. ٢/القربـة: پـڕی کرد. ٣/بالمكان: تیایدا مایەوە، نیشتەجێ بوو.
سَدَّدَ رێکی کرد، رێی ڕاستی نیشاندا.
سَدَد دروستی، ڕاستی ورێکی.
سَدِرَ سەر گەردان بوو، سەرسام بوو.
سَدِر سەرگەردان، سەرسام، دەریا.
●سَدَّسَ ٨/الشيء: کردیە شەش.
سُدْس شەش یەك ٦/١ ی هەر شتێك.
سَدّ، سُدّ شاخ، چیا، کێو، کەژ، بەربەست لەنێوان دەشتدا.
سَدَفَ چووە ناو تاریکیەوە، پێی نایە نـاو تاریکیە وە.
سَدَف تاریکی، دژی ڕۆشنایی.
سَدْف کەسێك لە دوورەوە ببینرێت، ئـەو کەسەی لە دوورەوە چاودەکرێت.
●سَدَلَ ٨/الشعرَ: خاوی کردەوە.
سُدل پەردە.
سَدَل کەچی، لەنگی.
سدل ملوانکەی درێژ تاسەر سینگ.
سَدَلَ، سَدَّلَ موی سەری ڕەها کرد، مـوی سەری بەردایەوە.
●سَـدِمَ ٨/ خەفـەتی خـواردو پەشـیمان بـوو. ٢/الماء: بـەهۆی زۆر مانەوەیــەوە گۆڕاو قەوزەی لێ نیشت.
سَـدَم خەفـەت لەگـەڵ پەشـیمانیدا، ڕق ودڵتەنگی.
سَدَنَ خزمەتی کەعبەی کرد.
سَدَن پەردە یان پەردەوان.
سدْن پەردە، ڕووپۆشی درگاو پەنجەرە لە قوماش.
سَدَى شەونم، ئاونگ.
سُدَى بێ سوود، بێ هودە
سَـــدید قـایم وقـوڵ، گونجـاو، ڕاسـت ودروست.
سَـدیس بەشـێك لەشـەش، هـەر شـتێك پێکهـاتوو لەشـەش بـەش، مـەڕێك ساڵی شەشەمی تەمەنی بەسەردا هاتبێت.

**سَـــدیم** هــەوری تــەنك، پەڵــەی گەلەئەســتێره یــان گــازی تیــشكدەر لەئاسماندا كەبە شەودا دەردەكەوێت.

**سَذاجة** سادەیی.

●**سَرَّ ١/هُ** دڵشادو دڵخۆشی كرد، چەقۆی دا لەناوكی.

**سِــرّ** ناوەڕاســت، نــاو دۆڵ، نهێنــی، ڕاز، هەرچی شتێك مرۆڤ بیشارێتەوە.

**سُــرّ** شــادومانی، دڵخۆشــی، ئــەو بەشــەی ناوكی منداڵ كەماماں دەیبڕێت.

●**سُــرَّ ١/فُــلان:** فـلان كــەس خۆشــحاڵ وشادومان بوو.

**سُــرّة** ئــەو كەناڵــەی لێیــەوە خــواردن بەكۆرپە دەگات لە سكی دایكیدا، نــاوكی مرۆڤ.

**سَراب** تراویلكە، سەراب، وێنەی ئاو كەبە هۆی زۆر بەتینی گەرماوە لەسەر زەوی دروست دەبێت، مرۆڤ كە سەیری دەكات پێی وایەئاو بێت.

**سِــراج** چــرا، چــراو، لامپــا، ڕونــاكی دەر لەتاریكیدا، فتیلە.

**سَــرّاج** درۆزن، زیــن ســاز، زیــن دروســت كەر.

**سِــراجُ اللیــل** گۆنەســتێرە، مەگــەزێكی بــچكەڵەیە بەشــەودا كلكی دەبریكێتــەوە وەكو نیتكە گڵۆپێكی بچوك وایە.

**سِـــراجَة** زیــن ســازی، پیــشەی زیــن دروستكردن.

**سَــراح** ناوێكەلــە(تــسریح) وەرگــیراوە بــەمانای بــەرەڵاكردن دەگوترێت: (**اطلق سراحه** = بەرەڵای كرد، بەرەڵاكرا).

**سِرَاد** كون كەر.

**سُــرَادق** خێــوەت، چــادر، دووكــەڵی بەرزبووەوە لەدەوری شت.

**سِراط** ڕێگەی ڕۆشن وڕون.

**سُراط** شمشێری زۆر بڕندە.

**سَرّاق** دز، زۆر دز.

**سَــرَاة** پــشت، بــەرزایی هــەر شــتێك، ناوەڕاست وجێگەی بڵند لەڕێگەدا.

**سَــرّاء** زۆر گەڕیــدە بەشــەودا، زۆر شــەو ڕەوی كەر، خۆش گوزەرانی.

●**سَرِبَ ١/الإناءُ:** ئەوەی تێیدا بوو ڕژا.

●**سَــرَّبَ ١/الإبــلَ:** بــەش بــەش نــاردنی، بەدەستە دەستە ناردنی. **٢/الفَتیَ:** دزەی پێكرد.

**سَــرب** ڕێگــە، چوار پێ، وڵاخــی سواری، سینگ.

**سِرْب** دڵ، دەستە، گرۆ، پۆلێ باڵنــدە یان فڕۆكە.

**سِربال** كراس، پۆشاك، جل.

**سَرِبَة** سەفەروگەشتی نزیك.

●**سَرَّجَ ١/الحديث:** قسەی دروست کرد، قسەی هەڵبەست. **٢/الشيء:** ڕازاندیەوە.
**سَرج** زین، جلێکی پشتی ئەسپ کەلە دارو چەرم دەکرێ ودەکەوێتە بن قونی سوار.
**سَرَج، سَرِجَ** درۆی کرد، قسەی ناڕاستی کرد.
●**سَرَّحَ ١/ت/المواشي:** چون بۆ لەوەڕ.
**سَرَّحَ** ڕەوانەی کرد، ناردی.
**سَرح** هەر درەختێکی بێ دڕك ودرێژ.
●**سَرَدَ ١/الدرع:** زرێی دروست کرد. **٢/الشيء:** کونی کرد. **٣/الصوم:** یەك بەدوای یەکدا ڕۆژوی گرت. **٤/الكتاب:** بەخێرایی خوێندیەوە. **٥/الحديث:** گێڕایەوە.
**سَرْد** ناوێکە دەبرێت بەسەر هەموو جۆرەکانی زرێدا.
**سَرَد** هاتن بەدوای یەکدا، هاتنی هەرشتێك بەبێ بچڕان وناو بەناوکردن.
**سَرداب** ژێر زەمین، زووری بچکۆلەی دروستکراو بۆخۆپاراستن لەبۆمب، مەنهۆڵ.
●**سَرَّ ١/ه:** خۆشحاڵی کرد، شادومانی کرد، دڵشادی کرد.
●**سَرَطَ ١/الشيء:** قووتی دا.

**سُرَط** ئازا، پاروی گەورە.
**سَرَطان** نەخۆشیی شێرپەنجە، قرژانگ، قرژاڵ، قارژنگ، ناوی بورجێکی ئاسمانە.
**سَرِع** خێرا.
●**سَرِعان ١/**خێرا. **٢/ القوم:** پێشینەکانی خەڵك ویەکەمینەکانیان.
**سَرِعَ، سَرُعَ** پەلەی کرد، خێرای کرد.
●**سَرِفَ ١/الأمرَ:** پشت گوێی خست، پێی لێ خشاند، زیادەڕەوی کرد.
**سَرَف** لەسنور دەرچوون، هەڵە.
**سُرفَة** کرمی ئاوریشم.
**سَرَقَ** دزیی، دزیی کرد.
●**سَرِقَ ١/الشيء:** بزربوو، ون بوو، شاردرایەوە.
**سَرِقَة** دزیی کردن، هەر شتێکی دزراو.
**سَرْمَد** هەمیشە، هەمیشەیی.
**سَرمَديّ** هەر شتێکی بێ سەرەتاو بێ کۆتایی.
**سَرُوَ** پیاوچاك وسەخی بوو.
**سَرو** درەختێکی ناسراوە لەدێرزەمانەوە لەباخچەکاندا بۆجوانی دەنێژرێت، پیاوەتی وسەخاوەت.
**سَرو، سِرو، سُرو** تیری کورت وبچوك، تیری پەیکان پان.
**سَرور** دڵخۆش وشادومانی.

**سِرّي** هەر شت یان مەسەلەیەکی نهێنی، پەنهانی.

**سَرَى** شەو ڕەویی کرد، بە شەودا ڕۆشت.

**سُرَى** ڕۆشتنی شەو، شەوڕەوی.

**سَرء، سِرء** گەرای ماسی و کوللە.

**سَرِيّ** ڕوباری بچوك.

**سَرِيَّة** دەستەیەك سەرباز لە پێنج کەسەوە تا چوار سەد کەس، شەڕی بچوك.

**سَرِيح** ئاسان، ڕەوان، پەلەکردن.

**سَرِيد** کون کەر.

**سَرِير** تەختی پادشا، تابوتی خالّی لەمردوو، نوێنی لەسەر نوستن.

**سَرِيرة** نیاز، نیەت، هەر مەسەلەیەکی پەنهانی، نهێنی.

**سَرِيع** خێرا، تیژ ڕەو.

**سُرِيَّة** کەنیزەك.

**سَرِيَّة** نهێنی، هەر مەسەلەیەکی پەنهانی.

●**سَرَءَ ١/ت السمكة والجرادة:** گەرای دانا.

**سِطَام** سەر قاپی کاسەی شەراب.

●**سَطَحَ ١/ه:** ڕای کێشا، ڕای خست.

**سَطح** بان، سەربانی خانوو

●**سَطَحَ، سَطَّح ١/البيت:** سەربانەکەیی ڕێك کرد.

●**سَطَرَ ١/ه:** نوسی.

**سَطَّر** ئەفسانەو قسەی بێ بناغەی دروست کرد.

**سَطر، سَطَر** خەت، دێڕ، نوسین، مەڕی یەك ساڵە.

**سُطرَة** هیوا، ئارەزوو، ئاوات.

●**سَطَعَ ١/الغبارُ اوالرائحة اوالنور:** بەرز وبڵاوبویەوە.

**سَطع** هەرچی شتێك بەرزوبڵاوبوبێتەوە وەك ڕوناکی یان بۆن یان تۆز.

**سَطَع** درێژی مل، دەنگی کێشانی شتێك بە شتێکی تردا، دەنگی هاویشتنی هەر شتێك.

**سَطَعَ، سَطعاً** درەخشایەوە، ڕۆشن بویەوە.

●**سَطَلَ ١/ه الدواءُ:** سەر خۆشی کرد. ٢/ه: سەرسامی کرد.

**سُطل** سەرخۆش کەر.

**سَطل** پیاوی درێژ، پیاوی باڵا بەرز، سەتڵی ئاو تێکردن.

●**سَطَمَ ١/الباب:** دای خست.

**سُطُم** بێخ وبنج.

**سَطم** تیژی تیغ و چەقۆ.

**سَطرَة** توانا، توانا داری.

**سَطيح** هەر شتێکی ڕاخراو، کەسێك لەبەر لاوازی یان نەخۆشی بە هێواشی هەستێتە سەر پێ.

**سَطيع** درێژ، پێچەوانەی کورت، بەیانی، بەرە بەیان.

**سَعادتُکم** بەرێزتان، جەنابتان.

**سَعادة** خۆش بەختی.

**سُعار** گەرمی ئاگر، توندی و سەختی برسێتی، خراپەو گەندەڵی.

●**سُعال** ١/کۆکە، قف، کۆخە. ٢/**الديکي:** کۆکە ڕەشە، نەخۆشیەکی بلاّوە بە هۆی سەرماوە بە زۆری توشی منداڵان دەبێت.

**سِعايَة** بەدگۆیی، قسەهێنان و بردن، تۆمەت، قسە هەڵبەستن.

**سَعبَر** چاڵی پڕ لە ئاو.

**سَعتَر** گیایەکی بۆن خۆشە.

**سَعتَرِيّ** پیاوی بەخشندەو ئازا.

**سَعِدَ** بەختیار بوو.

**سُعِدَ** کامەران بوو.

**سَعد** بەخت باشی، بەخت.

**سُعر** شێتی، شێتێتی، گەرمی ئاگر، برسێتی، حەز لەگۆشت کردن.

**سَعِر** شێت، دێوانە.

**سِعْر** نرخ، بەها، قیمەت، هەر نەخۆشیەك گشتی بێت وەکو پەتا.

●**سَعَّرَ** ١/**الحرب:** شەڕی هەڵگیرساند. ٢/**النار:** ئاگری هەڵگیرساند. ٣/**سَعراً:** ڕۆشنی کرد، نرخی دانا.

**سَعرَة** کۆکە، کۆخە، سەرەتای هەر کارێك.

●**سَعَطَ، سَعَّطَ** ١/ه **الدواء:** دەرمانی کردە لوتیەوە.

**سَعَفَ** پەنجەکانی لە تەنیشت نینۆکەکانیەوە توێکی هەڵدا.

**سَعَفْ** کەل وپەلی ناو ماڵ، جۆرە زامێکی ناو دەمی وشترە وەك گەڕی.

**سَعَفَة** پەلی دار خورما.

**سَعَلَ** کۆکەی کرد، کۆکی.

●**سَعَمَ** ١/**البعير:** بە خێرایی ڕۆشت. ١/ه: خواردنی پێدا.

**سَعن** شەرابی خۆلاسەی تێکەڵ نەکراو بە ئاو.

**سُعن** کەلاّزی گەورە.

**سعو، سعوَة** بەشێك لە شەو.

**سَعُوط** دەرمانێکە دەکرێتە لوتەوە، هاڕاوەی توتن کە دەچێتە لوتەوە.

**سَعوَة** مۆم، شەم، شەمێ، موم.

**سعى** ڕەنجی کێشا، کۆششی کرد.

**سَعى** ڕەنج، کۆشش، کار.

**سَعيد** خۆش بەخت، بەختیار.

**سَعير** زمانەی ئاگر، کڵپەی ئاگر.
●**سَعَی، سَعیاً** ۸/کاری کرد. ۲/**الأمرَ**؛ گرنگی بەبەئەنجام گەیاندنیدا. ۲/**لعیاله**؛ کەسابەتی بۆ کردن.
**سَغَبَ** برسیی بوو.
**سَغَب** تینوێتی.
**سَغِبٌ** هەر کەسێکی برسیی، توندو تیژترین برسێتی.
**سَغب، سَغَب** برسێتی، سەخت.
**سَغبی** زنی برسی.
**سُفَدَ** ئاوسا، هەڵاوسا لە نەخۆشیندا.
**سَفَد** بارانی نەرم، بارانی هێواش.
●**سَفَّ** ۸/**الطائرُ اوالسحابُ**؛ بەسەر زەویدا ڕۆشت، نزیك بەزەوی فڕی.
**سِفَّ، سُفَّ** جۆرە مارێکە.
●**سفائِن** ۸/کەشتی. ۲/**البَرِ**؛ ووشتر.
**سِفاح** زینا، داوێن پیسی.
**سَفّاح** خوێنرێژ، پیاوی زمان پاراو لەوتاردان وقسە کردندا.
**سَفّاك** زۆر خوێنرێژ، زۆر توانادار وزمانپاراو لەئاخافتندا.
**سِفانَة** کەشتی سازی، پیشەی کەشتی دروستکردن.
**سَفاء** دەوا، دەرمان.
**سَفَحَ** خوێن یان ئاوی ڕشتە.
●**سَفْحُ** ۸/**الجبل**؛ دامێنی کێو، بنکی کەژ.
●**سَفَرَ** ۸/سەفەری کرد. ۲/**تِ المرأة**؛ ڕوی خۆیی دەرخست، خۆی سفورکرد، بەڕوتی هەندێك لەلەشی خۆیی دەرخست. ۲/**الکتاب**؛ نوسی.
**سَفر** پیاوێکی موسافیر.
**سِفر** هەر بەشێك لە بەشەکانی تەورات، پەرتوکی گەورە.
**سَفَر** بڕینی ماوەیەك، سەفەر.
●**سَفَّرَ** ۸/**الرجلَ**؛ ناردی بۆ سەفەر، ڕەوانەی کردبۆ سەفەر.
**سُفرَة** خواردنی ڕێبوار، سفرەی نان لەسەر خواردن.
●**سَفَعَ** ۸/**ه**؛ لێیدا.
**سَفع** جلی ڕەنگ کراو، پۆشاك.
●**سُفَعُ** ۸/**الثور**؛ خاڵ وپەڵەی ڕەش بەڕوخساری گاوە.
**سَفعاء** کۆتری مل سەوز.
**سَفَكَ** ئاو یان خوێنی ڕژاند.
**سَفُلَ** نزم بویەوە، دابەزی.
●**سَفَّلَ** ۸/**ه**؛ نزمی کردەوە، دایبەزاند.
●**سَفِلَةُ** ۸/**القوم**؛ گەجەرو گوجەرەکانیان.
**سُفل، سِفل** نزمی، پێچەوانەی بەرزی وبڵندی.

●سَفَنَ ١/ـه: نەرمی کرد، نەخشی لێ هەڵکەند.
سَفُود سیخی گۆشت برژاندن، مێخی ئاسن.
سَفُوك زۆر درۆزن.
●سَفِهَ ١/ت الطعنة: بەخێرایی خوێنی لێوە دەرچوو.
سَفُهَ کەم ئەقڵ و نەزان بوو.
سَفَه نەفامی، نەزانی، گەمژەیی.
●سَفِي ١/الرجل: کەم ئەقڵ ونادان بوو.
٢/يده: قلیش قلیش بوو.
سَفِير باڵیۆز، نوماینەدەی باڵای دبلۆماسی وڵاتێك لە وڵاتێکی تردا، گەڵای ومریوی دار، تاڵە موی ومریو لە قژ، نێردراوی نێوان دوو کۆمەڵ بۆ ئاشتەوایی.
●سَفَنَ ١/ت الريح: هەڵی کرد بەسەر زەویدا.
سَفِينة کەشتی، پاپۆر، گەمیە، گەمی، خانوێکی ئاسنین یا دارینی زۆر فرەوان بەسەر دەریاوە بۆ سەفەرو بار.
سَفِيه نادان، هەرزە، نەزان، گەمژە.
سِقَاب بێچووی وشتر ئەو ساتەی لە دایك دەبێت. (وشەکە جەمعە)
سِقَايَة ئاودان، ئەو دەفرەی ئاوی پێ دەدرێت.

سَقَّاء ئاودەر، ئاودێر.
سَقب بێچووی وشتر لەو ساتەدا کەلەدایك دەبێت.
سَقَب نزیکی، پێچەوانەی دوری.
سَقَط هەڵە لەنوسین یان ژماردن وئاخافتندا، هەر شتێکی بێ خێر، شمەکی خراپ.
●سَقَطَ ١/ کەوت، کەوتەسەر زەوی. ٢/في الكلام: هەڵەی کرد. ٣/ عليه الأمرُ: بە فیرۆیدا، لێی ون بوو، وونی کرد.
سقط باڵی باڵندە.
سَقط بەفر، شەونم، بەور، ئاونگ.
سُقط کۆرپەی نابەکام، کۆرپەی لەبارچوو، کۆرپەیەك بە مردوویی لە دایك بێت.
●سَقَّطَ ١/في عيني، لەبەرچاوم کەوت، لەبەر چاوم بێ ڕێزو ئەرزش بوو.
●سَقَعَ ١/ـه: بە لەپی دەستی لێیدا.
٢/الديك: کەڵەشێرەکە خوێندی.
سُقع هەر لایەکی سەر زەوی، خانوو، ئەملاولای چاڵ.
●سَقَفَ ١/البيت: سەقف وبانی بۆ دروست کرد، سەری گرت.
سَقف بانی خانوو، سەقف.

**سَقِمَ** نەخۆش كەوت ونەخۆشيەكەی درێژەی كێشا، لاوازو سست بوو.
**سَقَمْ، سُقم** نەخۆشيی، بيماری.
**سُقُوط** كەوتن، ڕمان، كەوتنە خوارەوە.
**سُكاك** چينە بالآكانی كەش.
**سُكّان** دانيشتوانی هەر شارو ولآتێك، خەڵكی هەر شارو ولآتێك.
●**سَكَبَ** ١/**الماءَ** ڕژاندی.
**سَكْب** ئەسپی تيژ ڕەو، جۆرە پۆشاكێكە، پياوی بالآ بەرز، مس يان قورقوشم.
**سَكبَة** كرێشێ لەسەركەوتبێتە خوارەوە.
●**سَكَتَ** ١/بێدەنگ بوو، مرد، كۆچی دوايی كرد. ٢/**الغضبُ** هێور بويەوە.
**سُكّتَ** خامۆشيی بەسەردا هات.
**سَكْت، سُكات، سُكُوت** بێدەنگی، خامۆشی، قسەكەم كردن.
**سَكتَة** بورانەوە، لەهۆش خۆ چوون، نەخۆشيەكی ناسراوەو هەموو ئەندامان لەكارو هەست كردن دەخات جگە لە هەناسەدان.
●**سَكِرَ** ١/ سەرخۆش بوو، مەست بوو. ٢/**الحوضُ** پڕ بوو.
●**سَكَّرَ** ١/**الباب** دايخست، كلۆميدا. ٢/**الشيءُ** تێكەلآوی شەكر بوو يان وەكو شەكری لێهات.

**سِكر** بەربەستی ڕووبار.
**سَكَر** مەيی، شەراب، هەرچی شتێك مەست كەربێت.
●**سُكَّر** ١/شەكر، خورمای تازە. ٢/**العنب** شەكری گلوكۆز.
●**سَكْرَة** ١/گومڕايی، سەرلێ شێواوی، مەستی. ٢/ **سكرةُ الموت** سەرەمەرگ.
**سُكَّرِي** شەكريی.
**سَك، سُك** بيری تەسك، چالە ئاوی تەسك وتروسك، زرێی تەنگ، بينای ڕاست ورێك، ڕێگەی بەربەستكراو، كونی دووپشك، كونی جالّجالۆكە.
**سَكَعَ** بەبێ ڕێنمونی بەڕێدا ڕۆشت، بە سەر لێ شێواوی بە ڕێدا ڕۆشت.
**سُكَع** سەرسام، سەرگەردان.
●**سَكَنَ** ١/ نيشتەجێ بوو، لەجموجۆڵ كەوت ونارامی گرت. ٢/**عنهُ الوجعُ** ئازاری لێبڕا، ئازاری لێ دوور كەوتەوە. ٣/**اليه** خۆشحاڵ و شادومان بوو.
●**سَكّنَ** ١/**الحرفَ** سكونی لەسەردانا.
**سَكَن** بەزەيی، خێروبێر و بەرەكەت، هەرچی شتێك مرۆ خوی پێوە بگرێت، ئاگر.
**سُكنى** ماڵ، خانوو چونكە مرۆڤ تيايدا نيشتەجێ دەبێت، ئۆقرەگرتن.

**سکُوت** زۆر بێدەنگ وخامۆش.
**سُکُون** دژی جموجۆڵ، ئارامی، بێدەنگی، بریتیە لەنیشانەی سکون لەسەر پیتە عەرەبیەکان.
**سِکّة** سکە، پارەو دیناری سکە لێدراو، پوول.
**سکّیت** پیاوی هەمیشە خامۆش.
**سکّین** کارد، چەقۆ.
**سَکینة** دڵئارامی.
**سِل** نەخۆشیەکی سیەکانە.
**سَل** سەوەتەی لەپەلی درەخت دروستکراو، سەبەتە.
●**سَلَّ ١/الشيءَ من الشيءِ:** بە نەرمی ولەسەرخۆیی لێی دەرهێنا. ٢/**سَلاء** ددانەکانی نەمان.
**سَلّاب** کەسێك زۆر شت لە خەڵك داگیر بکات، دز.
**سلاح** چەك، کەلوپەلی جەنگ.
**سلاحيّ** چەك ساز.
**سَلاّخ** پێست لێکەرەوەی مەرو هەر ئاژەڵێکی تر.
**سَلاخة** بێ تایمی، بێ چێژی.
**سُلاس** بێ هۆشی، ئەقڵ وژیری لەسەردا ڕۆشتن.

**سَلاَطَة** زەڵاتە، خواردنێکە لە جنینی هەندێك سەوزەو تەرەکاڵ بەناو یەکدا دروست دەکرێت پاشان خوێو سرکەی بەسەردا دەکرێت.
**سُلالَة** ئاوی پشتی پیاو، کوڕ، نەوە، نەژادی پیاو.
**سَلاّل** دز.
**سَلام** ناوێکە لە ناوەجوانەکانی خوای گەورە، پاکی و بێ لەکەیی لەهەر ناتەواویەك، ئاسودەگی، ئاشتی، ئاشتەوایی، درود.
**سَلامة** تەندروستی، بێ وەیی.
**سِلاء** ڕۆن دەرهێنان، ڕۆن کەشی، هەرچی شتێك کوڵێنرابێت وپاك کرابێتەوە لەڕۆن.
**سُلاء** دڕکی خورما، باڵندە.
**سَلّة** دزی کردنی پەنامەکی.
●**سَلَبَ ١/الشيءَ:** بەزۆر بردی وداگیری کرد، دزی.
**سَلْب** داگیرکردن، دزین، بەتۆبزی دەست بەسەرداگرتنی هەرشتێ.
**سَلَبُ** جلکی تازێ باری پۆشی، خۆیی ڕەش پۆش کرد.
**سِلب** درێژ، پێچەوانەی کورت.

**سُلت** جۆی ڕوتەڵەی بێ بەرگ، جۆرێکی گەنمە.

●**سَلَتَ ١/الشعر**: تاشیی، چاکی کرد. **٢/الشيء**: بڕیی. **٣/ه**: شەلاقی لێدا.

**سَلج** بەخشیش، دیاریی.

**سُلَج** سەدەفی ئاوی.

**سُلجان** چەك.

**سَلَحَ** ڕیقنەی کرد (بۆ باڵندە)، شیاکەی کرد( بۆ مانگاو. . . هتد )، تەرسی کرد (بۆ کەرو ئەسپ و... هتد).

**سُلح** دۆشاوێکە خیگی پێ دەهەنون.

**سَلَح** ئاوی باران کەلەچاڵدا کۆدەبێتەوە وزۆر دەبێت.

**سُلحَفاة** کیسەڵ، گیاندارێکە لەوشکانی وئاودا دەژی.

●**سَلَخَ ١/الخروف**: پێستەکەی لێکردەوە. **٢/ت الحية**: کاژی فڕێیدا.

●**سَلَخَ ١/الشهر**: کۆتا ڕۆژی هەر مانگێك.

**سِلخ** پێستەی داماڵراوی ئاژەڵ، کاژی مار.

●**سَلخَةُ ١/الحية**: کاژی مار.

**سَلِسَ** نەرم وشل وگوێڕایەڵ بوو.

**سَلَس** میزە جرکێ، میز بە خۆ نەگرتن، ڕانەگرتنی میز.

**سَلِس** ڕام، دەستەمۆ، نەرم وئاسان.

**سَلسَبیل** ناوی چاوگە کانیەکە دەڵێن لەبەهەشتدا یە، مەیی، ئاوی سازگار.

**سِلّ، سُلّ، سُلال** نەخۆشیکە لەسیەکاندا دروست دەبێت.

**سِلسِلَة** زنجیر، ئەڵقەی لەئاسن دروستکراوی بەناویەکدا کراو، زنجیرە.

**سَلُطَ** زمان درێژ بوو (مەدحە بۆ پیاو لۆمەیە بۆ ژن).

**سَلطَنَة** پادشایەتی، دەستەڵاتداری.

**سُلطَة** دەسەڵات، توانا.

**سلطَة** جۆرە تیرێکی درێژە.

●**سَلِعَ ١/ت قدمه**: قاچی قڵیشا. **٢/الرجل**: بەڵەك بوو.

**سَلع** قڵیشاوی قاچ.

**سِلعَة** کەلوپەل، شمەك، هەر کەلوپەلێك بازرگانی پێوە بکرێت، کاڵا.

**سَلعَة، سِلعَة** هەر شتێکی زیادە لەلەش دەربێت وەك دوومەڵ وغوددەی نێوان پێست وگۆشت.

**سَلَفَ** ڕابورد، تێ پەڕی، بەسەرچوو.

**سَلَف** هەر کردەوەیەکی چاك مرۆڤ بیکات، قەرزی بێ سوو، پێشینان.

●**سِلف ١/الرجل**: ئاوەڵ زاوا، مێردی خوشکی ژنی پیاو.

●**سَلَّفَ ١/ه**: قەرزی بێ سووی پێدا.

**سَلَق** سووتاوی.
**سلق** گورگ، ڕێڕەوی ئاو، جۆگە.
**سَلق، سَلَق** شوێنەواری برین، جێگەی زام.
●**سَلَكَ ١/المكان:** تێی چوو، چوەناویەوە.
**٢/الطريق:** لەسەری ڕۆشت.
**سلك** سیم، تەل.
**سُلَك، سُلَكَة** بێچووی کەو.
●**سَلَّمَ ١/**سڵاوی کرد. **٢/عليه:** سڵاوی لێکرد، پێی گوت (**سلام عليك**). **٣/اليه:** ملکەچ بوو، خۆی دابەدەستەوە. **٤/ه الشيء:** تەسلیمی کرد.
**سُلَّم** پلەکان، پێپلیکانە، قادرمە.
**سَلم** ئاشتەوایی، ئاشتی، دروودگوتن.
**سِلم** ئاشتی، ئاشتەوایی.
●**سَلِمَ ١/من عيب:** ڕزگاری بوو، قوتاری بوو. **٢/من الخطر:** بێ وەی بوو لەمەترسیەکە.
**سُلوك** ڕەفتار، ڕەوشت، ئاکار.
**سَلوَة، سُلوَة** بێ خەمی، فراوانی ژیان، خۆشگوزەرانی.
**سَلوى** هەنگوین، چونکە بە شیرینیەکەی دڵخۆشت دەکات.
**سُلّة** زەمبیلە.
**سَلّى** دڵی دایەوە، دڵخۆشیی کرد.

**سَلِيب** ژنێک یان وشترێک کۆرپەی بە ناکامی لەبار چووبێت یان کۆرپەکەی مردبێت.
**سَليخ** بێ مەزە، بێ چێژ، بێ تام.
**سَليط** پیاوی زمان پاراوی زمان درێژ، تیژ لەهەر شتێك، زەیتی چاك.
**سَليطَة** ژنی زمان درێژ.
**سَليقَة** سروشت، جێگەی قاچی مرۆڤ و سمی چوار پێ لەڕێگەدا.
●**سَليم ١/**برینداریێك بەهۆی برینەکەیەوە لەسەرە مەرگدا بێت(بۆیە وایان ناوناوە تاکو ئومێدی چاك بونەوەی تێدا دروست بکەنەوە). **٢/** تەندروست، بێ وەی، بێ لەکەو ناتەواوی.
●**سَمّ ١/ه:** ژەهری دەرخواردداا. **٢/الطعام:** ژەهری تێکرد.
**سَما** بەرزبویەوە، بڵند بویەوە.
**سُما** خۆشناوی.
**سماح** ڕێگەدان، چاوپۆشی.
**سَماحَة** جوانمەردی، پیاوەتی، بەڕێزی، بەخشش.
**سماخ** کونی گوێچکە.
**سَماد** پەین، پەینی کیمیاوی، بەرتیل.

●**سِماط** ١/سفرەی نان لەسەر دانان. ٢/**الطريق**: ئەملاولای ڕێگە، ڕیزی خەڵك.

**سَماع** گوێ بیستن.

**سُماق** پوختەو پاڵفتەو بێ تێكەڵە.

**سَمّاك** ماسی گر، ماسی فرۆش.

**سَمال** كرمی ناوچاڵە ئاو.

**سِمام** دەم وهەردوو كونە لووت وگوێچكەكانی مرۆڤ گورگ.

**سَمّان** ڕۆن فرۆش.

**سماء** ئاسمان، سەقفی خانوو، پشتی ئەسپ، هەور، باران، گیای تەڕ.

**سَمتَ** بەگومان بەسەر ڕێگەكەدا ڕۆشت.

**سَمُجَ** دزێو بوو، ناشیرین بوو.

**سَمِج**، **سميج** شیری تام ناخۆش.

**سَمُحَ** جوانمەردو سەخی بوو.

●**سَمَّحَ** ١/چاو پۆشی كرد. ٢/**الرجل**: پەلەی كرد، هەڵات.

**سَمح**، **سميح** جوانمەرد.

**سَمحَة** ژنی سەخی ودڵفراوان.

●**سَمَخَ** ١/**الزرع**: جوزەلەی دەركرد.

**سَمَدَ** بەسەرسامی هەستا، سەری بەرز كردەوە وسنگی دەرپەڕاند بۆ فیزكردن.

**سَمد** هەمیشە.

**سَمَرَ** شەو نەخەوت وهەر قسەی كرد.

●**سَمَّرَ** ١/**الباب**: بەمێخ قایمی كرد.

**سَمُرَ** گەنم ڕەنگ بوو.

**سَمر** شەو، چیرۆك وئەفسانەی شەو، قسەو باس لەشەو، ڕۆژگار، سێبەری هەر شتێك بەهۆی ڕوناكی مانگەوە دروست بێت، تاریكی شەو.

**سَمراء** ژنی گەنم ڕەنگ.

**سِمسار** دەڵاڵ، كەسێك ناوەندگیری نێوان كڕیار وفرۆشیار بكات.

**سَمسَرَ** دەلالی كرد، بوویە دەڵاڵ.

**سمسم** كونجی.

**سَمّ**، **سُمّ** ژەهر، زەهر، زار، هەر مادەیەك كەچوە ناو لەشەوە زیندە فرمانەكانی لەش پەك بخات یان بە تەواوی لەناوی بەرێت.

●**سَمَطَ** ١/**الرجل**: بێدەنگ بوو، لەقسە كردن ڕاوەستا. ٢/**السكين**: تیژی كرد، دەمەزەردی كرد.

**سَمط** پیاوی هەژارو نەدارو دەست كورت.

**سِمط** ڕشتەی مرواری، ملوانكەی گەردن بەند، پیاوی زیرەك وچالاك.

**سُمط** پۆشاكێكی لەخوری دروستكراوە.

**سَمع** گوێ، گوێچكە، بیستن، هەستی گوێ شنەوتن.

**سِمع** یادی چاك وجوان، یادكردنەوەی چاك‌وجوان.

●**سَمِعَ ١/الصوتَ:** گوێ بیستی بوو، گوێی لێ بوو، بیستی. ٢/**الی حديثه:** گوێی بۆ قسەكەی ڕادێرا.

**سُمعَة** ناوبانگ، شۆرەت، ئەوەی دەبیسترێت.

●**سَمَكَ ١/الشيءَ:** بەرزی كردەوە.

**سَمُكَ** بەرزبویەوە، بڵند بویەوە.

●**سَمَّكَ ١/الشيءَ:** ئەستور وقەوی كرد، پێچەوانەی تەنك وناسكی كرد.

**سَمك** سەقفی خانوو.

**سَمَك** ماسی، ماسۆ، گیانەوەرێكە بەبێ ئاو ناژی و بە مردویی گۆشتی دەخورێت وەك گیاندارەكانی تر بە (تۆپیو)لەقەڵەم نادرێت.

**سُمك، سَماكَة** قەوی وقوڵی.

**سَملْ** پاشماوەی ئاو لەحەوزدا.

**سُملَة، سَمَلَة** ئاوێكی كەم.

●**سَمْن ١/**ڕۆن، كەرێ، ئەو چەوریەی بە ژەندن لەماست دەگیرێت. ٢/**النباتي:** ڕۆنی ڕوەكی، ڕۆنی لەڕوەك دەرهێنراو.

**سَمِنَ** قەڵەو بوو، بەزو ڕۆنی لەشی زیادی كرد.

●**سَمَّنَ ١/ه:** قەڵەوی كرد.

**سُمُوّ** بڵندی، بەرزی.

**سَمُور** گیاندارێكە لەپێستەكەی جۆرێكی هەرە گرانبەها وناوازەی فەروە دروستدەكرێت.

**سَمُوم** بای گەرم، ڕەشەبای گەرم وسوتێنەر.

**سُمَّة** درۆ، هەر تشێكی پوچ و بێ ناوەرۆك.

**سُمَّة** ڕاخەرێكە لەژێر دارخورمادا دادەخرێت بۆ وەی هەرچی خورمایەكی لێ وەری بكەوێتە سەر ئەو ڕاخەرە.

**سَمّى** هاوتا، هاوشان.

**سَمّى الله** گوتی (بسم الله)، ناوی خوای هێنا.

**سميد** گەنمی هاڕاو، نانی سپی.

**سَمير** ڕۆژگار.

**سَميع** بیسەر، ناوێكە لەناوە جوانەكانی خوای گەورە.

**سَمين** قەڵەو، گۆشتن، قەوی وقوڵ.

●**سَنَّ ١/السكين:** تیژی كرد، دەمە زەردی كرد. ٢/**الطريقة:** لەسەری ڕۆشت، پەیڕەوی لێكرد. ٣/**العقدة:** گرێكەی كردەوە. ٤/**الماءَ:** لەسەر خۆ ڕژاندی. ٥/**الرجلَ:** هات بەشان و باڵیدا، پیایدا هەڵدا، مەدحی كرد.

**سِنّ** ددان، ددانەی شانە، ماوەی تەمەن، تەمەن.

**سِنام** گردۆلکەی سەر پشتی وشتر.

**سِنان** سەرە نێزە، نوکی ڕم.

**سُنبُل** گوڵە گەنم، گوڵە جۆ.

**سُنح** بەرەکەت، ناوەڕاستی ڕێگە.

**سِنخ** بێخ، بنج، بنەڕەت.

**سَنَخْ** خراپ، بۆگەن.

**سَنخَة، سَنَخَة** بۆنی ناخۆش.

●**سَنَدَ ١/الیه:** پشتی پێوەدا، پشتی پێ بەست، پاڵی پێوەدا.

**سَنَد** پاڵپشت، پشت وپەنا.

●**سَنَّدَ ١/الشيء:** بە هێزی کرد، پشت ئەستوری کرد.

**سَنُط** بێ ڕیش بوو، ڕیش تەنک بوو، کۆسە بوو.

**سَنط** گوڵی ئاوریشم.

**سِنط** مەچەك، جومگەی نێوان دەست وباڵ.

**سَنَع** جوانی، چاکی.

**سَنف** شوڵێك گەڵاکانی لێکرابێتەوە، گەڵا.

**سِنف** دەستە، کۆمەڵ، پێڕ.

●**سَنَّمَ ١/الإناء:** پڕی کرد. **٢/الشيء:** بەرزی کردەوە.

**سَنِم** وشترێك گردۆلکەی سەر پشتی زور بڵند بێت.

**سَنُّون** هەر شتێك سیواکی پێ بکرێت.

**سَنوی** ساڵانە.

**سَنَه** ساڵانێکی بەسەردا تێ پەڕی.

**سَنَّة** مێیەی ورچ، ورچی مێینە.

**سُنَّة، سِنَّة** کردەوەو گوفتارو هەر چیەك بدرێتە پاڵ پێغەمبەری خودا (د. خ)، سروشت، یاسای خوا، ڕێباز.

●**سَنَة ١/**ساڵ، ١٢ مانگ، زەوی وشك. **٢/الدراسية:** ساڵی خوێندن.

**سِنّ، سِنَّة** تەوری دووسەر.

**سَنیع** پیاوی جوان ڕوخسار.

**سَنیعَة** ژنی جوان ڕوخسار.

**سَنیف** جلکێکە دەبەسترێت لەهەردوو شانی وشتر.

**سَواد** ڕەشی، ڕەشایی، سامان ومالێکی زۆر، ژمارەیەکی زۆر، زۆربەی هەر شتێك.

●**سُوَاد ١/**نەخۆیەکە دووچاری ددانەکان دەبێت. **٢/الأعظم:** زۆربەی خەڵك. **٣/العین:** ڕەشێنەی چاو. **٤/الناس:** عامەی خەڵك.

**سُوَاع** بەشێك لەشەو، ناوی بتێکە، ئارامی.

**سَوَّاق** لێخوڕ، شۆفێر، ڕاننده.

**سِــواك** ســیواك، دارێکــی بــچوکه دەم ودداني پێ خاوێن دەکرێتەوە.

**سُوَام** باڵنده.

**سَــوَاة** ڕیــسوایی، خــوو ڕەوشــتی بــەدو قێزەون.

**سَــواء** خــوی بــەد، ژنــی بــەد فەســاڵ وقێزەون.

**سَوَاء** یەکسانی، وەك یەکی.

**سَوَاء** هاوشان، ناوەڕاست، لوتکەی چیا.

**سِواء، سُواء** بەرابەر، ڕاست وڕێك.

**سَوِدَ** ڕەش بوو، ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕا.

**سَوِدَة** زەویەك دار خورمای تێدا بێت.

●**سَوَّدَ ١/الشيءَ:** ڕەشی کرد.

**سُور** دیواری خانوو، دیواری دروستکراو بەدەوری شاردا، میوانی.

**سُورَة** بەشێك لە (١١٤) بەشەکەی قورئان، سورەت.

**سَوط** قامچی، شەللاق.

**سَوع** ئارامی.

**سَوَّفَ** دەست بەدەستی کرد، بۆ کردنی کارێك ئەمڕۆو بەیانی کرد.

**سَوَفَ** زوو، بەزویی.

●**سَوَّقَ ١/النبتُ:** لاسکی دروستکرد، ساقی بۆ دروست بوو.

**سُــوق** بــازاڕ، جێگــەی مامەڵــەو کــڕین وفرۆشتنی هەموو جۆرە کاڵایەك.

**سُوقَة** خەڵکی بەر دەستی پادشا (بۆیە واناونراون چونکە چۆنی بوێت لێیان دەخورێت).

**سُوقِيّ** بازاڕی.

●**سَوَّكَ ١/الشيءَ:** خوراندی.

**سَولاء** دۆڵچەی گەورە.

**سَوِلَ** ورگی لە خوار ناوکیەوە شۆڕ بوو.

**سَــولَة** ورگ شــۆڕی لــەخواروی ناوکــەوە، هێلانەی کۆتر.

**سُوَلَة** زۆر پرسیار کەر وزۆر داواکەر.

●**سَوَّمَ ١/ه الأمرَ:** تەکلیفی کــرد، خستیە ئەستۆی، بەو کارەی ڕاسپارد.

**سَوم** بەها، نرخ.

**سُومَة** بەها، نرخ، نیشانە، ئاماژە.

●**سَــوِيَ ١/الرجــلُ:** مەســەلەکەی بــۆ ڕێکوپێك بوو.

**سِوى** بێجگە، بەدەرلە.

**سَــوّى، ســاوى** یەکسان وبەرابەری کــرد، ڕێکوپێکی کرد.

**سَوِيق** مەی، هاڕاوەی نەرمی گەنم وجۆ.

●**سُــوء ١/**بــەدی، خراپــی، لاوازی توانــای بیــنین، خیانــەت وناپــاکی، ئــازار، بــێ ئــەدەبی، بــەد ڕەوشــتی. **٢/التــدبیر:**

ناكاربینی، بێ سیاسەتیی، لێ نەزانین. ٣/الظن: بەد گومانی. ٤/النیة: بەد نیازی.

**سَها** فەرامۆشی کرد، پشت گوێی خست.

**سُهار** بێداری، نەنوستویی، وشیاری.

**سُهاف** زۆرتینوێتی، نەخۆشیەکە مرۆڤ بە هۆیەوە تینوێتی ناشکێت.

**سَهّاك** پیاوی زمان پاراوی توند قسەکەر.

**سُهام** لاوازی وباریکی.

**سَهاوَة** نەرم ونۆڵی، ناسکی.

**سَهب** دەشت، زەوی تەخت وفراوان.

**سَهب، سَهِب** ئەسپی بەتوانای هەنگاو فراوان.

**سُهب، سَهُب** زەوی تەخت ولەبار.

**سَهِدَ** لەخەو بەئاگا هاتەوە، خەو نەچوە چاوی، خەوی زڕا.

**سَهد** چاك، جوان.

**سُهُد** کەم خەو.

**سُهد، سُهاد** بێداری، نەخەوتن.

**سَهدَة** ئاگایی، زیتی ونەخەوتویی، بێداری.

**سَهِرَ** شەو نەخەوت، ئێشکی گرت.

●**سَهِرَ ١/البرق**: بەردەوام بریکەی دایەوە.

**سُهَرَة** کەسێك بێدارو هۆشیاربێت.

**سَهرَة** مەجلیسی شەو نشینی، مەجلیسی سەردانی شەوانە.

**سَهِفَ** لەناو چوو، تیاچوو، زۆر تینوی بوو.

**سَهف** پولەکەی ماسی، تەپاوتل وپەلەقاژەی کوژراو لەناو خوێندا لەکاتی گیان دەرچوندا.

●**سَهَكَ ١/ت الریح**: زۆربە توندی هەڵیکردو تێپەڕی.

**سَهَك** بۆنی ناخۆشی کەسێکی عارەق کردو، بۆنی ناخۆشی گۆشت، بۆنی ماسی وژەنگی ئاسن.

**سَهُلَ** نەرم بوو، ئاسان و پێچەوانەی زبربوو.

**سَهل** دەشت، زەوی نەرم، حەسانەوە، سادەوساکار.

●**سَهَّلَ ١/الأمر**: سادەو ئاسانی کرد.

●**سَهَّلَ ١/الطریق**: ڕێگە کەئاسان ولەبارو ڕێکوپێك بوو.

**سَهل، سَهِل** نەرم ونۆڵ لەهەر شتێك.

**سَهُمَ** ڕەنگو ڕوخساری گۆڕا بەهۆی لاوازی وکەم گۆشتیەوە.

**سُهمَة** نزیکی وخزمایەتی.

**سَهم** تیر، ئەوی بە کەوان دەیهاوێژن.

**سُهُم** تاڵه تاڵەی تیشك، توندوتیژی تینوێتی وگەرما، پیاوانی ژیرودانا.

**سَهو** ئاوی سازگارو شیرین، نەرمی، ئارامی، پیاوی نەرم ونیان، بیر پەرتی.

**سَهوَق** زۆر درۆزن، لاق درێژ.

**سُهُولَة** ئاسانی، ڕەحەتیی.

**سَهُول** دەرمانی ڕەوانی، دەرمانی دژ بە قەبزی.

**سَهوَة** بەرد، گەنجینەی بچوکی لە شێوەی تاقدا دروستکراو لە دیواردا بۆ شت تیا هەڵگرتن.

**سُهَیل** ناوی ئەستێرەیەکی درەوشاوەیە.

**سَهیم** هاو بەهرە، هاوبەش.

**سِیّ** هاو شێوەو هاو نمونە، هاوشان.

**سَیّ** دەشت، هەر جێگەیەکی تەخت.

**سَیِّئَة** خراپ، بەدیی، هەڵە.

**سَیّاح** زۆر گەشتوگەڕان کەر، جیهانگەڕ.

**سِیاحَة** گەشت وگوزار، جیهانگەڕیی.

**سِیادَة** سەروەری.

**سَیّارة** ئۆتەر، ئۆتۆمبیل.

**سِیاسَة** سیاسەت، ڕامیاری.

**سِیاع** قوڕ، حەری، خۆڵی تەڕ.

**سَیّاف** خاوەنی شمشێر، کەسێك بە شمشێر شەڕ بکات، پیاوی خوێنڕێژ.

**سِیاق** مارەیی ژن.

**سِیاق** شێوازی قسەیاخو کارکردن.

**سَیّال** ڕوەکێکە دڕکێکی سپی درێژی هەیە.

**سَیب** باران، دیاری وبەخشش، ماڵ وسامان، موی کلکی ئەسپ.

**سِیب** ڕێڕەوی ئاو.

**سِیبان** گەرای مێشولە.

●**سَیَّبَ، سابَ** ١/**ە** وازی لێ هێنا، پشت گوێی خست، فەرامۆشی کرد. ٢/**العبد**: ئازادی کرد، بەرەڵای کرد.

**سیجارة** جگەرە، جغارە، توتنی دەکاغەزەوە پێچراو بۆ کێشان، جغەرە.

**سِیح** ئاوی ڕەوان، ئاوی لەبەر ڕۆشتوو.

**سَیِّد** بەڕێز، نازناوی پیاوی گەورە، لای گاورەکان نازناوی مەسیحە، لای موسڵمانان نازناوی ئەوانەیە کەوەچەی پێغەمبەر (د. خ)ن.

**سَیِّدَة** خاتون، خانم، نازناوی خاتو مریەمی عەزرایە.

●**سَیَّرَ** ١/**الرجل**: وای لێکرد بڕوات. ٢/**المثل**: لە ناوخەڵکدا بڵاویکردەوە. ٣/**ە عن بلده**: دەری کردولەوڵاتی خۆی هەڵی کەند.

**سَیر** ڕۆشتن، پیادەڕەوی

**سِيرَة** شێواز، ژيانی پێغەمبەری مەزن (د. خ)، سوننەت، ڕێگەو ڕێباز، نامەی کردەوەی پياو، ڕەوش، ژياننامە.
**سَيع** ئاوێك بە هەموو لايەكدا لەبەری بڕوات.
●**سَيّعَ ١/الحائط:** سيواقيدا بە قوڕ.
**سَيف، سِيف** شمشێر، ماسيەكی دەرياييە دەنووكێكی درێژو تيژی لە شێوەی شمشێردا هەيە، ڕۆخی دەريا.
**سِيفَة** دووری، درێژی.
**سيكولوجيا** زانستی دەروون ناسی.
**سَيَلان** ڕەوانی ئاو.
**سِيلان** جۆرە بەردێكی بە نرخە، لەعل.
●**سَيّلَ ١/الماءَ:** جاری و ڕەوانی كرد.
**سَيْل** ئاوێكی زۆری لەبەر ڕۆشتوو.
**سِيلَة** ڕووبار، جێگەی لێوە ڕۆشتنی ئاوی زۆری لەبەر ڕۆشتوو، ئەوجێگەی لافاوی لێوە دەڕوات.
**سِيماء** نيشانە، ئاماژە.
**سِيمَة** بەها، نرخ.
**سُيوب** ماڵی شاردراوە و پەنهانی لەزەويدا.
**سَيّئ** بەد، ناشيرين، قێزەون.
**سُؤال** پرسيار، سواڵ، داوای خێر كردن.
**سُؤبان** پاسەوان.

• **شَنِزَ** ٨/ **المكان**: سەخت و بەرزبوو.

• **شَنِفَ** ٨/ت **اصابعُهُ**: دەوروبەری نینۆکەکانی قڵیشا. ٢/ت **الرجلُ**: بڕینی لێهات.

**شَنِفَ** ترسا وسڵەمیەوە.

**شِنْشِنَة** خوو، نەریت، سروشت.

**شُـئُون** هەرکارێکی قورس وگەورە، کاروبار (وشەکە جەمعە).

**شائبَة** ژنی سەرسپی، ئالودەگی ولەکە وناتەواوی.

**شائح** خاوەن غیرەت، ئەسپی سەرکەش.

**شائع** هەرمەسەلەیەك بڵاوبێت لەناوخەڵکدا، دەنگۆی ناوخەڵك، مقۆمقۆ.

**شائف** تەماشاکەر، سەیرکەر.

**شائق** ئارەزومەند.

**شائه** ڕژد، چاوپیس وحەسود.

**شابّ** پیاوی گەنج، لاو، جوان لەتەمەندا.

• **شابَ** ٨/ پیربوو، موەکانی سپی بوو. ٢/**الشيءَ**: تێکەڵاوی کرد. ٢/ **الرجلَ**: ناپاکی لەبەرانبەر کرد.

**شاجر** سەختی ونارەحەتیەکانی ڕۆژگار.

• **شاجَرَ** ٨/ **الماشيةَ**: لەوەڕاندی. ٢/**ه**: دژایەتی ورقابەری لەگەڵدا کرد

**شاجِن** خەمبار، خەفەتبار.

• **شاجَّ** ٨/**القومُ**: یەکتریان برینداركرد(بەتایبەت برینی سەر).

**شاحِنَة** لۆری، ترومبیلی باربەر، ئۆتەری بارهەڵگر، ئۆتۆمبیلی بارکێش.

**شاخَ** پیربوو، چوبەساڵدا.

**شاخِص** بەرجەستە، بەرچاو.

• **شادَ** ٨/ **البناءَ**: بەرزی کردەوە. ٢/**الرجلُ**: تیاچوو، لەناوچوو. ٣/**الابلُ**: وشترەکەی بانگ کرد.

**شادِن** بێچوی ئاسك.

**شاذ** ڕیزپەڕ، هەرشتێك لەیاساو بنەما لابدات، لادەر، نامۆ، سەیر.

**شاذّ** تەنها، نایاب، تاك.

**شاذِب** کەسێك لە زێدو نیشتمانی خۆی دورکەوتبێتەوە.

**شارَة** جوانی وپێکەوتویی، شێوە، جل و ڕازاوەیی، شمەکی کەشخەی ناوماڵ.

**شارِبَة** هەر کۆمەڵێك لەرۆخی ڕوباردا نیشتەجێ بن.

**شارِب** لاوازی لەئاژەڵدا، کەسێك ئاو بخواتەوە.

**شارِح** ڕاڤەکار، کەسێك پاسەوانی کشتوکاڵ بکات ولە باڵندە بیپارێزێت.

**شــــارِد** سەرگەردان، ئاوارە، كەسێك لە گوێ رايەڵى خودا ياخى بوبێت.

•**شـــــارَطَ ١/ه:** هەريـەكيان مـەرجيان دانابۆ ئەوى تريان، مەرجى بۆدانا.

**شـــــارِع** شەقام، جادە، شارێ، كەسێك ياسا دابنێت، ياسادانەر.

•**شـــــارَفَ ١/ه:** فيـزى كـرد بەسـەريدا لەشـەرافەتمەنديدا. **٢/المكان:** بـەرزى كردەوە. **٣/ الشيءَ:** لەسەرەوە چاودێرى كرد وسەيرى كرد.

**شارِم** تيرێك لايەكى ئەو نيشانەى بۆى دەتەقێنرێت بپەڕێنێت وكەلى بكات.

**شارة** نيشانە، ئامازە.

**شاسّ** لاواز وسست ووشك.

**شـاسِف** لاوازو وشـك.

**شّــــاش** چـنراوێكى تـەنكى لۆكەيـە، شـاش.

**شاصِرْ** بێچوى ئاسك كەبەهێز دەبێت وجموجوڵ دەكات.

•**شـــاطَ ١/الـشيءُ:** سووتا. **٢/بـ القـدرُ:** بنكرى سوتاو بە بنەكەيەوە لكا. **٣/بـ الذبيحة:** هەموو گۆشتەكەى بەش كرا. **٤/فلان:** تياچوو. **٥/في الأمر:** پەلەى كرد.

**شــاطِن** دوور لـە هـەق وڕاستى، ناپـاك وبۆگەن.

**شـــاطىء** ڕۆخ، كەنار، قەراغ، لێوار، دەم چەم.

•**شـاعَ ١/بالخبَر:** بلاوى كردەوە وپەخشى كـرد. **٢/الخـبرُ:** پـەخش بويـەوە. **٣/ه:** شوێنى كەوت. **٤/الإناءَ:** پڕى كرد.

**شـــاعِر** هەسـتيار، شـاعير، هۆنـەر، هۆزانڤان.

**شـــاعة** هاوسـەرى پيـاو، ژن چـونكە شوێنى پياوەكەى دەكەوێت.

**شاعى** دوور.

**شاغَبَ** ئاژاوەى نايەوە.

**شاغِرْ** خاڵى، بەتاڵ.

**شـــاغُور** تافگـەى ئـاو، ئاوێـك لـە بەرزاييەوە بەخوڕ بۆ نزمايى دابەزێت، هەڵدێر.

**شاف** تينو، تێنگ، تێنو.

**شافِع** شـفاعەت كار، تكا كار.

**شــــافى** شـيفا بـەخش، ناوێكـە لەناوەجوانەكانى خواى گەورە.

**شـاكّ** بەگومان، كەسێك گومانى هەبێت لەشتێك يان مەسەلەيەك، پياوێ چەكى لەخۆى دابێت وئامادەبێت بۆ شەڕ.

•**شـاكَ ١/ه:** دڕكى كرد بەلەشيدا. **٢/ثديُ الجارية:** مـەمكى بنجى داكوتا. **٣/شوكاً:** دڕكى لێدەركەوت.

**شـــاكِر** سوپاس گوزار، سوپاس كەر، خزمەتكار.

•**شـــاكَر ١/الحديث:** دەستی بەقسە كردن كرد.

•**شـــاكَسَ ١/ه:** پێچەوانەی وی بوو.

**شاكِع** نەخۆشێك ناڵەو هاواری زۆر بێت.

**شـــاكِل** وێكچویی، لێكچون.

**شاكِلَة** تەنیشت، لاتەنیشت، پێداویستی.

**شاكی** كەسێك كەمێك نەخۆشی بگرێت، گلەیی كەر، شكایەت وگازندە كەر، شێری بێشە وجەنگەڵ.

**شال** پارچە قوماشێكە دەدرێت بەسەر شاندا.

•**شالَ ١/الكفه:** بەرز بویەوە، بڵند بوو.

**شـــامْ** وڵاتی شام كە ئیستە بەوڵاتی سوریا دەگوترێت بەڵام جاران (لبنان، سوریا، فەلەستین، ئوردن) ی دەگرتەوە.

•**شـــامَ ١/البرق:** سەیری كرد بزانێت بۆكوێـــوە دەڕوات ولـــەكوێ بـــاران دەبارێنێـت. **٢/شـيماء** خـاڵ لەلەشـیدا دەركەوت.

**شامِت** بەدخوا، كەسێك بە دووچاربوونی كەسانی تر بە بەڵاو نارەحەتی دڵخۆش بێت.

**شامِخ** چیای بڵند، پیاوی گەردنكەش.

**شامِس** ئەسپی سەركەش، ئەسپێك ڕێگە نەدات كەس سواری پشتی بێت.

**شامِل** گشتگیر، هەمەلایەنە.

**شامَة** هەستی بۆنكردن، یەكێكە لە پێنج هەستەكە.

**شـامَة** خـاڵ، نیشانە، ڕەنگـی لـەش یـان خاڵی ڕەش لە لەشدا.

**شامِی** كەسێك خەڵكی وڵاتی شام بێت.

**شانِب** ڕۆژی ساردو سەرما و سۆڵە.

•**شـــان، شـــیناً ١/ه:** لـە كـەداری كـرد، عەیبداری كرد.

**شانی** دوژمن، دژمن.

**شاوَرَ** ڕاوێژی كرد، پرس وڕای كرد.

**شـاهِب** ئەسـپێك ڕەنگـی مومكـانی سـپی بێت وناوەناوە ڕەشی تێكەڵ بێت.

**شاهَدَ** بینی، سەیری كرد.

**شـاهِد** گەواهیـدەر، شـایەتی دەر، زبـان، نوێـژی مـەغریب، نوێـژی شـێوان، ڕۆژی هەینی، بەڵگە، ناو یاخود سیفەتێكە بۆ پێغەمبـەری خـودا (د•خ)، هـەر كـارێكی پەلەو خێرا.

**شاهِدَة** زەوی، كێلی بەرز.

**شاهِق** بڵند، بەرز.

**شاهِین** باڵندەیەكە لە گروپی (هەڵۆ) كان و دووباڵی درێژی هەیە، ستونی ترازوو.

**شاة** مەڕ، ژن.
**شاوِیّ** خاوەن مەڕ.
**شای** چا، چایی، چای.
**شاءَ** ویستی.
**شاء، شیئاً وَ مَشِیئةً** ویستی.
**شافَة** برینداری لە بنی پێدا.
•**شـأمَ ١/القوم وعلیهم:** بەدبەختی بۆ هێنان، بەدچارەیی هێنا بە سەریاندا.
**شامَة** لای چەپ.
**شأنَ** پلەو پایەی بۆ دروست بوو.
**شأن** ئەو ڕەگەی فرمێسکی لێوە دەڕژێتە چاوەوە، پلەو پایە، هەر مەسەلەیەکی گەورە.
**شاو** کۆتایی هەر شتێك، جڵەوی وشتر، خۆڵی دەرهێنراو لە چاڵ وبیر.
•**شَبَّ ١/الفرس:** دەستەکانی بەرزکردەوە. **٢/الغلام:** چوە تەمەنی لاوێتییەوە. **٣/النار:** هەڵی گیرساند. **٤/ت النار:** هەڵگیرسا. **٥/الشيء:** بەرز بویەوە وگەشەی کرد. **٦/لَهُ الشيء:** لە لایەنی خواوە بۆی تەقدیرکرا.
**شَبّ** جۆرە زاخێکی کانزایی ڕەنگ سپیەو ڕەنگی شینیشی هەیە.
**شِباب** شادومانی و چالاکی.
**شَباب** گەنجێتی، لاوێتی، تەمەنی جوانی نێوان ( بالق بون — ٣٠) ساڵ.
**شَبارِق** پارچەی قوماش.
**شَباعَة** ناوی چاڵی زمزم، پاشماوەی خواردن لە دوای تێربوون، بەردەماو.
**شُبّاك** پەنجەرە، پەنجەر، داوی ڕاوکەر، خودی ڕاوکەران.
**شِبام** دارێکە دەخرێتە نێو دەمی کاژۆلەوە بۆ وەی گوانی دایکی نەمژێت.
**شَباة** ئەونەسپەی لەسەر قاچەکانی هەڵدەستێتەوە، بێچووی دووپشك لەو ساتەدا لە دایك دەبێت، دووپشکی زەرد، چزوی دووپشك، تیژی هەر شتێك، پیاوی گەمزەو گێل.
•**شَبِثَ ١/بکذا:** خۆی پێوە هەڵواسی.
**شَبَثْ** جاڵجاڵۆکە، کاکڵەموشان، پس پسە کۆڵە، پیرۆشك.
•**شَـبَحَ ١/الرجل:** ڕای کێشا بۆ وەی شەلاقی لێبدات. **٢/الداعی:** هەردوو دەستی درێژ کرد بۆ نزاکردن و پاڕانەوە. **٣/الشيء:** لەتی کرد.
**شَبح، شَبَح** مۆتەکە، شەبەح، ئەودیمەنە ناشیرینانەی لە ئەنجامی خەیاڵ کردن و ترسدا دێنە بەرچاوی مرۆڤ.

**شَبَحَة** زرێ یەکە قاچی ئەسپی پێ دەبەسترێتەوە.

**شَبَرَ** بە بست پێوانەی کرد، بە بست پێوای، بە بس پێوای.

•**شَبَّرَ ١/الشيء:** پێوای، مەزندەی کرد.

**٢/فلاناً:** بە گەورەی دانا، گەورەی کرد.

**شَبْر** مارەیی ژن، تەمەن.

**شِبْر** یەك بست، یەك بس، یەك بۆس، درێژی نێوان پەنجە توتەو ئەسپێ کوژە بە کراوەیی.

**شَبَر** دیاریی، بەخشش، ئینجیل، چاکە وخێر.

**شِبْرِق** بێچووی پشیلە، بەچکە پشیلە.

**شُبْرَة** دیاریی و بەخشش.

**شَبِعَ** تێری خوارد، پرگەدەی نانی خوارد.

•**شَبُعَ ١/عقله:** ئەقلی قایم وقوڵ ودامەزراو بوو، ئەقڵی تێر وتەسەل بوو.

**شِبَع** تێریی، تێر خواردن.

**شبعان** تێرخواردوو، کەسێك تێر بوبێت لە خواردن.

**شِبْع، شِبَع** هەرچیەك برسێتی لابەرێت.

**شَبِق** هەرزە، شەهوەتباز.

**شَبَق** ئارەزوو، هەواو هەوەس، هەزرەیی.

•**شَبَكَ ١/بـ الأمور:** تێکەڵو پێکەڵ بوو.

•**شَبَّكَ ١/الشيء:** تێکەڵ وپێکەڵی کرد، دژواری کرد.

**شَبَكَة** زەویەك چاڵ وبیری زۆری تێدا بێت، بیری لەیەکەوە نزیك هەڵکەنراو، داو، تۆڕ.

**شُبْكَة** خزمایەتی، نزیکی ودۆستایەتی، خوێشی.

•**شَبِلَ ١/الغلام:** لە نێو ناز ونیعمەتدا پێگەیی وگەورە بوو.

**شِبْل** بێچووی شێر، بەچکەی شێر.

•**شَبِمَ ١/الماء:** سارد بوو.

**شَبِم** ساردی وسەرما، برسێتی، مردن، ژەهر، چەك.

**شَبو** ئازار، ئێش وژان.

**شَبوَة** ناوێکی (غیر متصرف) ە بۆ دووپشك، ژنی بەد زوان.

**شِبه** نمونە وشێوە.

**شُبهَة** گومان، هەر چیەك هەقی تێدا تێکەڵ ببێت بە ناهەق وحەلاڵ وحەرامی تێدا تێکەڵ بەیەك ببێت.

**شَبیه** وێکچوو، هاوشێوە.

**شَبِیبَة** جوانی، لاوێتی، گەنجێتی.

**شَتَّ** پەرتەوازە بوو، پرژو بڵاو بوو.

•**شَتَأَ ١/بالبلد:** زستان تیایدا مایەوە، زستان تیایدا سەقامگیربوو.

**شتّام** زۆرجنێودەر، زۆر زمان پیس.
**شتامة** بەدڕەوشت.
**شـــتّان** (ئیـــسمی فیعلـــه) بـــه واتـــای:
(دورکەوتەوە، دوورە، جیاوازە) دێت.
**شتاء** زستان، زسان، کژی سەرماوسۆڵە، ســـێ مانگـــەی پاشـــینی ســـاڵ، زمـــسان، زمستان.
**شـتَّتَ** پـرژوبلاوی کـردەوە، پەرتـەوازەی کرد.
•**شـتَرَ ١/الشئ:** بـڕی، دڕی ولـەت وپـەتی کرد. **٢/الرجلَ:** بریندارى کرد. **٣/العین:** پێڵووەکانی هەڵگەڕاندەوە.
**شـتَر** لەکـه وعـەیب وناتـەواوی، بـڕان، هەڵگەڕانـــەوەی پێڵـــووی چـــاوەکان یـــان قڵیشانیان.
**شتَرَة** نێوانی دوو پەنجە.
**شتَمَ** جنێوی دا، جوێنی دا.
**شـــتُمَ** ڕوخـــساری ناشـــیرین و نـــەخوازراو بوو.
**شـتَوِي** زستانی، زستانەیی، هـەر شـتێك تایبەت بێت بە زستانەوە.
**شتّی** جۆراوجۆر، هەمەڕەنگ.
**شتی** بارانی زستان.
**شـتیم** کەسـێك ڕوخـساری نـەخوازراو و دزێو بێت.

•**شجَّ ١/الرأسَ:** بریندارى کرد، شکاندی.
**شجاج** هەوا.
**شجّاج** شکاویەکی زۆر لە سەردا.
**شـجار** پارچـه تەختەیەکـه دەخرێتـه پشتی دەرگاوە، ڕکابەری، ناکۆکی.
**شجاعة** ئازایەتی، چاونەترسـی وبـوێری، دلێری.
**شجاعَة** ژنی ئازا وچاو نەترس.
•**شجَبَ ١/هـ:** لە ناوی برد، ڕای کێشا وسەر قاڵی کرد.
**شـجب** کۆڵەکـەی ناومـاڵ، پێداویـستیی وخەفەت وغەم، ڕیسواکردن.
**شجَب** ڕەنج، هیلاکی شەڕ وجەنگ.
**شجِبَ** مردو لە ناو چوو.
•**شجَرَ ١/الرجلَ بالرمحِ:** بریندارى کـرد. **٢/البیتَ:** کۆڵەکـەی بـۆ دانـا. **٣/فمهُ:** بـه لقـه دارێـك دەمـی کـردەوە. **٤/بینهم:** تیایدا ناکۆك بون، ناکۆکیـان تێکەوت لـه سەری.
**شـجَر** درەخـت وهـەر گیایـەك سـاقی هەبێت.
**شـجر** هـەر جێگەیـەك درەختـی زۆر لێبێت، جەنگەڵ، بێشە.
**شـجراء** زەویـەك درەختـی چـڕو پـڕی زۆری تێدابێت.

**شَجُعَ** ئازاو چاو نەترس بوو.

•**شَجَّعَ ١/ه:** چالاکی کردەوە وهانیدا.

**شَجِعَة، شُجعَة** پیاوی ترسنۆك و بێ توانا.

**شَجِنَ** خەفەتبار بوو، غەمبار بوو، خەمی خوارد.

**شَجن** ڕێگە لە دۆڵدا یان لە سەرەوەی شیودا.

**شَجَن، شُجُون** خەفەت، دلگرانی وخەم، ئارەزووی دەرون.

**شِجنَة، شُجنَة** پەلوپۆی پێکەوە تێکەڵاوبوی درەخت.

**شَجِي** خەفەتبار، خەمگین، کەسێك خەیاڵی پەرت بێت.

**شِجِّير** شەشێر، هاوەڵی بەد وناچیزە، هەر کەسێکی بێگانەو نامۆ.

**شَجِيع** ئازا وچاونەترس.

•**شَحَبَ، وشَجُبَ، شَحِبَ ١/لونه:** ڕەنگی گۆڕا بە هۆی نەخۆشی یان برسێتیەوە، ڕەنگی پەڕی.

**شَحَمَ** قەڵەو بوو، بەزی زۆر بوو.

**شَحم** بەز، پیو، چەوریی هەناوی حەیوان.

•**شَحمَةُ ١/الأذن:** نەرمەی گوێ، نەرمایی گوێچکە، جێگەی گوارە پێوە هەڵواسین لە گوێچکەدا.

•**شَحَنَ ١/السفينة:** باری کرد. ٢/الرجلَ: دەری کرد، دوری خستەوە.

**شَحْن** بارکردنی کەشتی، بارگاوی کردن.

**شَحِيم** قەڵەو، گۆشتن، پەرتوکی فەرزی نوێژەکان لای مارۆنی وسریانیەکان.

•**شَخَرَ ١/الحمار:** سەرِاندی، دەنگی هەڵبڕی. ٢/الفرس: پرماندی.

•**شَخَسَ ١/الرجلُ:** شلەژا وتێکچوو. ٢/الحمار: دەمی داچەقاند لەکاتی باوێشکدان دا.

**شَخس** شلەژان، دەم کردنەوەی گوێ درێژ لەکاتی باوێشکدان دا.

•**شَخَصَ ١/الشيء:** بەرز بویەوە. ٢/النجم: دەرکەوت. ٣/الجرح: ئاوسا. ٤/الى بلد: ڕۆشت. ٥/اليهم: گەڕایەوە.

**شَخَّصَ** دیاری کرد، دەست نیشانی کرد.

**شَخص** کەس، تاکە کەسێك، مرۆ، مرۆڤ.

**شَخصِي** خودی، تایبەت بە هەرکەسێك.

**شَخصِيّة** کەسێتی، کەسایەتی.

•**شَخِمَ ١/اللحم:** بۆگەن بوو.

•**شَخَمَ ١/الفم:** بۆنی گۆڕا.

**شــخم** كەســانێك لــە بــۆنی خــۆش وناخۆشیش لوتیان بگیرێت.
**شخیر** دەنگێ لە قورگەوە یان لە لوتـەوە دەربچێت.
**شدّ** گرێیدا وبەستی وتوندو تۆڵی کرد.
**شَدَحَ** قەڵەو بوو، گۆشتی زیادی کرد.
**شدحة** فراوانی.
•**شَدَخَ ١/الرأس،** شکاندی. ٢/**شدخاً،** لە مەبەست گەڕایەوە وپاشەکشەی کـرد، لە مەبەست لایدا.
**شَدَخ** کۆرپەی ناکامڵ کە لەباردەچێت.
•**شَـدّدَ ١/ه،** توند وتۆڵی کرد. ٢/**الضربة،** زیــادە ڕەوی تێــدا کــرد. ٣/**الحــرف،** نیـشانەی شـەددەی لەسـەردانا. ٤/**علی،** فشاری خسته سـەر، سـەختگیری لەسـەر کرد.
•**شَدَفَ ١/ه،** بڕی وپارچە پارچەی کرد.
**شَدَف** تاریکی، گەورەیی، شادومانی.
**شــــدِف** گەورەوچالاك، بالابـەرز، قـەد وقیافە بڵند، بالابەرز.
**شُدفَة** تاریکی.
**شُدفَة** پارچە، بەشێك لە شەو.
**شــدِقَ** گۆشەی دەمی فراوان بوو.
**شِـدق** گۆشەی دەم لە ژێرگۆناوە.

•**شَدَنَ ١/الظبي،** بـەهێز بـوو ولـەدایکی بێ منەت بوو.
**شــدَو** کەم لە هەرشتێکی زۆر.
**شــدَهَ** سەرسام بوو، سەری سوڕما.
**شــدِهَ** سەرسام بوو، سەری سوڕما.
**شــدَّة** زۆر، هێـز، بـەتوانایی، تونـدی، سەختی.
**شــدید** بـەهێز، ئـازا، شـێری بێـشە وجەنگـەڵ، بـێ ڕەحـم ودڵـڕەق، مـرۆی ڕژد.
**شـدیق** هەردووکەناری دۆڵ.
•**شــــذَّ ١/عـن الجمهـور،** تـاك بویـەوە وڕیزپــەڕی کــرد. ٢/**عــن الأصــول،** سەرپێچی لێ کرد ولێی لادا.
**شــذا** ئازار وخراپـە، مـێش، تـیژی بـۆن، خوێ، نەخۆشی گەڕی، جۆرە کەشتیەکە.
**شــذاة** یەك مێش، پاشماوەی هێز.
**شــــذَب** کەلوپــەل وشمــەکی ناومــاڵ، پاشماوەی گزوگیای خوراو.
•**شـــذَبَ، شــذّبَ ١/اللحاء،** تاشـی. ٢/**الشیء،** بڕیی، لـەتی کـرد. ٣/**ه،** دەری کرد.
**شــذَّرَ** پرزوبلاو بویەوە.
**شــذر** پارچـەی زێـڕی پاڵفتـە، دەنکـە مرواری بچوك.

**شـذوذ** لادان، ریزپەرپبوون.

**شـذو** مسك، بۆنی مسك.

•**شَـرّ** ١/شەڕانگێزبوو، بەدرەوشت بـوو. ٢/**فلانـاً:** لەکـەداری کـرد. ٣/**اللحـمَ:** لەبەرخۆردا داینا. ٤/**الماءُ:** دڵۆپـە دڵۆپ چکاو هاتە خوارێ.

**شَـــرّ** خراپـە، پێـچەوانەی چـاکە، بەدی، زیان وهەرکارێکی بەدو ناڕەوا.

**شَـــرّ** نـاخۆش، نـەخوازراوی تەرێزلێکراو.

**شَـراب** هەرچی شتێك بخورێتەوە (وەك شەربەت و ئاو و ...هتد).

**شَـرَار** پزوسکە، پزوسـك، پزیـسك، ئـاورینگ، پریـشکەی ئـاگر، نەختۆکـە ئاگرێك، هەرچی لەئاگر دەردەچێت.

**شَـرّاز** ئەوکەسانەی ئەشکەنجە وئـازاری سەختی خەڵکی دەدەن.

**شِراع** چارۆکەی کەشتی، ملی وشتر.

**شِراعیّ** چارۆکەداریی.

**شِـراء** کـڕین.

•**شَـــرِبَ** ١/**الماءَ:** ئاوی خواردەوە.

•**شَـــرَّبَ** ١/**هُ:** ئاوی دایـە تـا بیخواتـەوە، ئاوی پێدا.

**شُـــرب** خواردنەوە.

**شَربَة** هەرچیەك بەیـەکجار بخورێتـەوە، قومێك ئاو یان هەرشتێکی تـر، دەرمـانی ڕەوانکەر.

**شَـــرِث** تیغ وشمشێری تیژ.

•**شَـــرَجَ** ١/**الـشيءَ:** کـۆی کـردەوە. ٢/**الشراب بالماء:** تێکەڵی کـرد. ٣/**شـرجاً:** درۆی کرد.

**شَـرْج** جۆر، کۆمەڵ، گرۆه.

•**شَـــرَحَ** ١/**مـسألة:** ڕاڤـەی کـرد، ڕونـی کردەوە، تەمومـژی لەسەرلادا. ٢/**الشيءَ:** پاراستی.

**شَـــرح** ڕاڤـە، شیکردنەوەی هـەردەقێك، پێناسە، ڕونکردنەوە.

**شَـــرِح** خۆشحاڵ، خەندەڕوو.

•**شَـرَّحَ** ١/**الشيءَ:** پارچەکانی لێك جیـا کردەوە، تەشریحی کرد.

**شَـــرخ** بـنج، بنـەڕەت، سـەرەتای لاوێتـی وجوانی، بەری یەك ساڵی وشتر، وەچـەی پیاو.

•**شَـرَدَ** ١/ئاوارە بوو. ٢/**علی الله:** لە گوێ ڕایەڵی خـودا دەرچـوو. ٣/ **عن الطريق:** لایدا لە ڕێگە.

•**شَـرَّدَ** ١/**هُ:** ئاوارەی کرد، دەری کرد.

**شَـــرد** ئـەو بارانـەی ( بـا) دەیکـات بەناوماڵدا، بارانی لاتیر.

**شَرَرَة** پریشکه، پزیسکه، ئاورینگ.
**شَرَز** بڕی، لەتی کرد.
**شَرز** هێز، توانا، توندو تیژی ودڵڕەقی.
**شَرَز** پاڵفته وبێ خەوش لەهەرشتێك.
•**شَرَّز ١/ه**: ئازاریدا، ئەشکەنجەیدا، جنێوی پێدا، بڕیی.
**شَرِس** ڕەوشت وخوی ناشیرین بوو.
•**شَرَس ١/ت الماشیة**: زۆریان خوارد.
**٢/ه**: بەقسەی ناشیرین نارەحەتی کرد.
**شَرِس** سەرسەخت و شەڕانگێز.
**شَرِش** ریشە، بێخ وبن.
**شَرشَر** گیای عەلەفی مریشك.
**شَرشَبر** مەراوی، سۆنه، سەرکەسك.
**شَرَص** ڕای کێشا.
**شَرص** ڕاکێشان، بڕین.
**شَرِص** توندوتیژی.
•**شَرَّص ١/ه بکلامه**: جنێوی پێدا، جوێنی پێدا.
**شَرِط** کەوتە ناو کارێکی گەورەوە، کەوتمناو مەسەلەیەکی گەورەوە.
•**شَرَّط ١/الشيء**: بەستی وتوندی کرد.
**شَرط** مەرج، شەرت، بڕیار.
**شَرَط** نیشانەو ئامازە، سەرەتای هەرشتێك، هەر جۆگەلەیەکی بچوکی ئاو.
**شُرطة** سازمانی پۆلیس.
**شُرطيّ** پاسەوان، پۆلیس.
•**شَرَعَ ١/**یاسای دانا، یاساڕێزی کرد. **٢/في الماء**: چوە ناوئاوەوە یاخود بەهەردوو مشتی ئاوی خواردەوە.
**شِرعَة** خوو، نەریت، نمونە، کەشتی، پاپۆڕ، ڕێی ڕاست.
**شَرْع** یاسای خوا، ئاین.
**شِرع، شَرَع** نمونە، وێنە.
**شَرع وشَریعَة** دەستور، ئەویاسایانەی خودا دایناون بۆ مەردوم.
**شَرعيّ** گونجاو لەگەڵ شەرعی خوادا، دروست.
**شَرَف** لوت، هەرجێگەیەکی بەرز وبڵند، شەرەف.
**شَرُفَ** بویە خاوەن شەرەف، لە دین یان لەدنیادا بەرزو بڵند بویەوە.
**شَرِفَ** بەرزبویەوە، بەرەو بڵندی چوو.
•**شَرَّفَ ١/المکان**: بەرزی کردەوە. **٢/ه**: کردیە خاوەن شەرەف، شەرەف و ڕێزی پێ بەخشی.

**شَرُفَةٌ** شانازی کردن بەبەرێزی وچاکەی باوباپیرانەوە.

•**شَرَقَ ١/تِ الشمسُ:** خۆرهەڵهات.

٢/**الثمَرُ:** بەروبومی ڕنی.

•**شَرِقَ ١/الدمُ فی عینه:** خوێن لە ناوچاویا دەرکەوت. ٢/**لونهُ:** ڕەنگی لەبەر خەجاڵەتباری سوربویەوە.

**شَرْقٌ** خۆر، هەتاو، جەمسەری خۆرهەڵات، ئەوجێگەیەی لە سەرەتای بەهارو پایزدا خۆری لێوە هەڵدێت.

•**شَرِكَ ١/هُ:** بویە هاوبەشی، بویە بەشداری.

**شِرك** بەشداری، هاوبەش بڕیاردان بۆ خودا، کوفر، بەش.

**شَرَك** داوی ڕاوکردن، تۆڕ.

**شُرُك** ناتەواو.

**شِرك** هاوبەش پەرستی، بت پەرستی.

•**شَرَمَ ١/الأنفَ:** پەرەکەیی بڕی.

٢/**لفلانٍ من مالهِ:** کەمێکی پێ بەخشی.

•**شَرَّمَ ١/هُ:** بڕی ودڕی.

**شَرم** کەنداوی دەریا.

**شَرَم** شکاوی لوت، بڕاوی پەرەکەی لوت.

**شُرُوق** خۆرهەڵهاتن، خۆرکەوتن.

•**شَرِهَ ١/الی الطعام:** زۆر ئارەزوو مەندی بوو، زۆر حەزی لێی بوو.

**شَرِه، شَرهان** ئارەزوومەند، کەسێك زۆرحەزی لە خواردن یان شتێکی تربێت.

**شَرِه** کەسێك زیاد لە پێویست بخوات، زۆرخۆر.

**شَرَی** کێو، کەژ، شاخ، ڕێگە.

**شَریح** پارچە گۆشت، ئەندامی زاوزێی ژن.

**شَرید** دەربەدەر، ئاوارە.

**شَریر** بەدکار، شەڕانگێز وخراپەکار.

**شَریس** شێری بێشە وجەنگەڵ.

•**شَریط ١/**نەوار، شریت، کاسێت.

٢/**المصباح:** فتیلەی چرا، پلیتەی چرا.

**شَریع** ئازاو دلێر، کەتانی باش.

**شَریف** بەڕێز، خاوەن شەرەف، لای موسڵمانان بەوکەسانە دەوترێت کە لە وەچەی پێغەمبەرن (د٠خ).

**شَریك** هاوبەش.

**شَزَبَ** زبرو باریك ولاواز بوو.

**شَزَبَة** هەل، فرسەت، کاتی گونجاو بۆ هەر کارێك.

•**شَزَرَ ١/الیه:** بە لاچاو وبەڕقەوە سەیری کرد.

**شَزَر** سورایی لەچاودا، قین.

**شَزِنَ** شادومان بوو، چالاك بوو.

**شَزَن** پیاوی بەد ڕەوشت، سەختی ژیان.
**شَزْن** توند وتیژی ودڵڕەقی.
•**شَسَّ ١/الشیئ**: وشك بوو، وشكەوە بوو، سیس بوو.
**شَسَعَ** دووربوو، دورکەوتەوە، پان و پۆڕ بوو.
**شسع** پەلکی نەعل، ماڵ وسامانێکی کەم.
**شُسُوع** دوور، دووریی.
**شِصّ** دزێکی زۆرچالاك و وریا.
**شِصاب** قەساب.
**شِصب** بەخت، بەش، سەختی.
•**شَصَبَ ١/الشاة**: قەڵخی کرد.
**شَصْب** مەڕی قەڵخ کراو.
•**شَصَرَ ١/فلانا بالرمح**: زامداری کرد.
**شـصَر** بێچووی ئاسـك لەکاتێکـدا بـە کۆرپـەیی بـەهێز دەبێـت وجموجـۆڵ دەکات.
**شَصّ، شِصّ** قولاپی ماسی گرتن، ئاسنێکی چەماوەی تیـژە و ماسیگران ماسـی پـێ دەگرن.
**شَـصیب** پیـاوی بێگانـە ونـامۆ، بـەش، بەخت.
**شَطّ** دورکەوتەوە.
**شَطّ** ڕۆخی ڕوبار یان دەریا.

**شـطائِب** گروپـی لێـك چـوو، سـەختی ونارەحەتی.
**شَطارة** حیلە بازیی، زیرەکی.
**شَطَأ** بەسەر ڕۆخی دەریادا ڕۆشت.
**شَـطْأ** درەختـی خورمـای بـچوك، گـەڵای کشت ودرەخت.
•**شَـــطَبَ ١/هُ**: خــەتی بەســەردا هێنــا، کوژاندیەوە. **٢/الشیئ**: بـڕی یـان لـە بـاری درێـــــژی هـــــەڵی دڕی. **٣/الرجـــــل**: دورکەوتەوە.
**شَـطب** پیـاوی قـەدو بـاڵا بڵنـد، پەلکـە خورمای سەوزی ناسك و تەڕ، سڕینەوە.
**شطبة** کچی باڵا بەرز.
•**شَطَرَ ١/الشیئ**: کـردی بـە دوو کەرتـەوە. **٢/بیت الشعر**: دێڕێکی لێ لابرد. **٣/الناقة او الشاة**: یـەکلا لـەگوانیانی دۆشـی و لا گوانەکەی تریـانی بـە پـڕ لـە شـیری جێ هێشت.
•**شَطّرَ ١/الشیئ**: کـردی بـە دوو کەرتـەوە. **٢/الشعر**: لەسـەر هـەر دێڕێکـی دێڕێکـی تـری زیـاد کـرد. **٣/الناقـة**: یـەکلا لـە گوانەکانی دۆشی.
**شَطَر** نیوەی هەر شتێك.
•**شَطَفَ ١/الرجل**: کۆچی کـرد، ڕۆشـت و دورکەوتەوە. **٢/الثوب**: شۆردی.

**شَــطَف** پارچــەی هەرشــتێك (وشــەكە جەمعە).
**شَطفَة** پارچەیەك لەهەرشتێك.
•**شَطَنَ ١/هُ** دووری خستەوە، بە گوریس بەستی. **٢/الرجـلُ** لـە هـەق و ڕاسـتی دورکەوتەوە.
**شَطَة** بیبەری هندی، بیبەری سور.
**شَــظَاف** تەنگانــەو نارەحــەتی، دەســت تەنگی وكوله مەرگی له ژیاندا.
**شِظَاف** دووریی.
•**شَــظَفَ ١/هُ عــن كــذا** بــەرگری و بەربەســتی لێكــرد، ڕێگــری وياســاغی لێكرد.
•**شَظُفَ ١/الشجرُ** ڕەق بوو.
**شَظَف** بەدڕەوشت، بەدخوو.
**شَظَف** تەنگدەستی، هەژاریی.
•**شَـظَفَ ١/السهمُ** چـوە نێـوان پێـست وگۆشتەوە.
•**شَظِيَ ١/القومُ** پەرتەوازە بوون.
**شَظِيَ** وردوخاش بوو، شكا.
**شَـظِيَّة** پارچـەی هـەر شـتێك، ئێـسكی نێوان ئەنیشك ومەچەكی مرۆڤ.
•**شَــعَّ ١**/پەلــەی كــرد. **٢/المــاءُ** پرژوبلاوبویەوە.
**شَعَ** مالّی جالّجالّۆكە، تۆڕی جالّجالّۆكە.

**شِعار** دروشم، پۆشاكی ژێرەوەی مرۆڤ.
**شُعاع** تیشكی خۆر كەوەك تالّە دەزولـە دەبینـرێت.
**شَعاف** دێوانەیی، شەیدایی.
**شَعاف** دلّ كەجێگەی خۆشەویستیە.
•**شَعَبَ ١/الرجلُ** مرد، كۆچی دوایی كرد. **٢/الشيءَ** چاكی كرد.
**شَعب** دوور، دوریی، گەل، میلـەت، هـۆزی گەورە.
**شِعب** ڕێگە لە ناو شاخدا، ڕێڕەوی ئاو لـە ناو زەویدا، نێوانی دووشاخ.
•**شَــعَب ١/اليــدُ** پەنجــەكانی دەســت. **٢/شــوكةالطعام** هــەر دانەیــەك لەددانەكانی چنگالّ.
**شُــعبة** كۆمــەلّ ودەســتە لەهــەر شــتێك، ســەختی و نارەحەتیــەكانی ڕۆژگــار، لق، پەل.
**شَعبي** میللی.
•**شَعَّثَ ١/الشيءَ** پەرتەوازە وشپرزی كرد.
**شَعَث** ناتەوای و پرژو بلاوێتی لەكاردا.
**شَعِرَ** موەكانی درێژبون و زیادیان كرد.
•**شَــعَرَ ١**/هەســتی كــرد. **٢/الرجــلُ** هۆنراوەی گوت.
**شَعر** موو، توكی لە لەش دەرهاتوو.

**شِعر** قسەی کێش وسەروادار، هۆنراوە، هۆزان، هەڵبەست.
**شَعر** پیاوێ لەشی زۆر مودار بێت.
**شِعراء** ناوی ئەستێرەیەکە کەیەك سانتیمەتری چوارگۆشە خۆڵی ئەو ئەستێرەیە یەکسانە بە دوو هەزار کیلۆ لە ڕووی کێشەوە.
**شِعراء** جێگەی مووێ ڕوان لە ژێر ناوکی مرۆڤدا، بەر.
**شَعر، شَعر** زەعفەران، گیا، درەخت.
**شَع، شَعاع** دڕکی گوڵەگەنم یان گوڵەجۆ.
**شَعَف** لوتکەی چیا، ئەوپەڕی ترس وبیم.
**شَعفَة** یەك دڵۆپ باران، یەك تنۆك باران.
•**شَعَلَ ١/النارَ** ئاگری هەڵگیرساند.
**شَعَل** سپێتی لە کلکی ئەسپدا.
**شَعَل، شَعَّلَ** ئاگری هەڵگیرساند.
**شُعلَة** زبانەی ئاگر.
**شَعُوب** مردن، کۆچی دوایی، لە دنیا دەرچوون.
**شَعیر** جۆ، دانەوێڵەیەکی بەناوبانگە لەدوای گەنم بەپلەی دووەم دێت.
**شَعِیرَة** نیشانە، قوربانی کردن وهەڵسوکەوتەکانی تایبەت بەحەج.

**شعیریَ** جۆ فرۆش.
**شِغار** نیکاحی سەردەمی نەفامی (کە ئیسلام یاساغی کرد)، دەرکردن و دوورخستنەوە، بیرێك ئاوی زۆر بێت.
**شَغال** ڕەنجدەر، کارکەر، زۆر زەحمەت کێش.
•**شَغَبَ، شَغِبَ ١/القوم و بهم وعلیهم:** ئاشوب و ئاژاوەی بۆ نانەوە. **٢/عن الطریق:** لە ڕێگەلایدا.
**شَغَب** ئاشوب، ئاژاوە، پشێوی، ئائارامی.
•**شَغَرَ ١/الرجل:** دورکەوتەوە. **٢/الناس:** پەرتەوازە بوون. **٢/ه عن بلده:** دەری کرد.
**شَغَف** ئەوپەڕی خۆشەویستیی.
•**شَغَلَ ١/ه:** خستیە کارەوە، سەر قاڵی کرد. **٢/ه بکذا:** سەر قاڵی کرد پێیەوە.
**شُغل، شُغُل** کار، ئیش، پیشە، پێچەوانەی دەست بەتاڵیی.
**شَغِیر** بەدخوو، بەد ڕەوشت.
**شَفّ** تەنك و ناسك بویەوە بە جۆرێك ئەو شتەی لە پشتەوە بوو دەبینرا.
**شَفّ** پەردە و پارچە قوماشی ناسك و تەنك.
**شَفا** کەنار، لێوار.

**شَفاعة** میانگیری، پشتیوانی، ئەرکێکە لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا پێغەمبەری خودا بۆ بەرژەوەندی مەردوم لە خزمەتی خوای گەورەدا پێی هەڵدەستێت و شفاعەت بۆ موسوڵمانان دەکات و داوای لێخۆش بونیان لای خوا بۆ دەکات.

**شُفاف** تەنك، ناسك.

**شَفاء** تەندروستی.

**شِفاء** دەرمان، دەوا، چارەسەر.

**شَفِرَ** کەم بویەوە.

**شُفر** کەنار ولێواری هەرشتێك تەنانەت ڕەحم و عەورەتی ژنیش.

**شَـفرَة** چەقۆ وکاردی گەورە، تیـژی شمشێرە.

•**شَفَعَ ١/لفلانٍ** شفاعەتی بۆ کرد.

**شَفع** ژمارەی جوت، جەژنی قوربان، دوو ڕکاتی کۆتایی نوێژی شەو (شەو نوێژ).

•**شَـفَّفَ ١/ه المـرضُ** لاواز وسستی کـرد، تەنکی کرد.

•**شَـفِقَ ١/علیـه** سور بوو لەسەر خێر وچاکەی ئەو، میهرەبانی وبەزەیی لەگەڵدا بەکارهێنا.

**شَفَق** ڕۆژ، پاشماوەی تیشکی سوری خۆر لە دوا هەناسەکانی خۆر ئاوابوون بە ئاسمانەوە، بەزەیی، ترس، هەر شتێکی بێ کەڵك وخراپ.

**شَفقَة** بەزەیی و میهرەبانی، سۆز لە تەك ترسدا.

**شَفَن** چاوڕوانی، کەسێك چاوی بڕیبێتە میراتی.

•**شَفَنَ ١/الرجلَ** بە قنگە چاو سەیری کرد.

**شَفِن، شَفَن** زیرەك، دانا.

•**شَـفَهَ ١/**کێشای بە لچیدا، پێداگری لێکرد. **٢/الإناءَ** هەرچی ئاوێکی تێدا بوو خواردیەوە.

**شَفَهِیّ، شَفَوِیّ** زارەکی، زمانی.

**شَفَة، شِفَة** لچ، لێو.

**شَفیر** لێواری هەر شتێك.

•**شَفَى، شِفاءَ ١/اللهُ فلاناً** خودا شیفایدا. **٢/فـلانٌ فلانـاً** داوای شیفاو چاك بونەوەی بۆکرد.

**شَفیع** میانگیر، پشتیوان، شفاعەتکار.

**شَفیق** میهرەبان، دڵسۆز، بە بەزەیی.

•**شَـقَّ ١/**لەتی کـرد. **٢/الأمـرُ** ناڕەحەت وسەخت بوو.

**شَـقّ** نیـوەی هـەر شـتێك، بەرەبـەیان، سەختی وناڕەحەتی ودژواری.

**شِقّ** برای له باوکەوە، نیوەی هەر شتێك، نارەحەتی، ڕەگەزێکی میمونە لەمرۆڤ دەچێت.
**شُقّاح** کۆمی سەگی مێچکی.
**شَقَا** بەدبەخت بوو، چارەڕەش بوو.
**شِقاق** ناسازگاری ونەگونجاوی، دووڕوویی، سەرەڕۆیی، بەدبەختی.
**شَقَاوَة** بەدبەختی، چارەڕەشی.
**شَقُحَ** قێزەون بوو.
**شَقحَة** قوزی سەگی مێچکە، قوزی دەڵ.
**شقحة** گوانی سەگی مێچکە، سوری بە سپی تێکەڵاو.
•**شَقَحَ ١/الشيءَ** شکاندی.
**شَقَذَ** دوور ڕۆشت، دورکەوتەوە.
**شَقَذ، شَقَذ** گورگ.
**شِقذ، شَقِيذ** کەم خەو، کەسێك خەوی کەم بێ.
**شَقِرَ** ڕەنگی سورو سی بوو.
**شَقَر** کەڵەشێر، درۆ.
**شَقَر** سپی پێستی.
**شُقرَة** ڕەنگی سورو سپی بە تێکەڵی.
**شَقَلَ** کێشای، بەرزی کردەوە.
**شَقوَة، شِقوَة** بەدبەختی، دژی بەختیاریی.
**شِقّة** نیوەی هەر شتێك کە دەبرِدرێت.

**شُقّة، شُقّة** سەفەری دوور، نارەحەتی، ئەوماوەیەی ڕێبوارێك دەی بڕێت.
**شَقِيّ** بەدبەخت، چەتون، تاوانبار، چارەڕەش.
**شَقِيح** قێزەون، ناشیرین.
•**شَكَّ ١/**گومانی کرد، گومانی برد. **٢/ه بالرمح:** بە نێزە برینداری کرد. **٣/ت الشوكة رجله:** درك چوو بە قاچیدا.
**شَكّ** گومان، دوودڵی، پێچەوانەی دڵنیایی.
**شَكا** شکایەت و سکاڵای کرد.
**شَكا، شَكوَاً وشَكاية** شکایەتی کرد، سکاڵای کرد.
**شَكَرَ** سوپاسی کرد، ستایشی کرد.
•**شَكِرَ ١/ت الناقة:** گوانەکانی پڕبوون.
**شُكر** سوپاس، ستایش.
**شَكُسَ** بەخیل و ڕژد بوو.
**شَكِس** بەد ڕەوشت.
•**شَكَعَ ١/المريضُ:** ناڵەو نرکە وهاواری زیاد بوو. **٢/الزرعُ:** دنکۆڵەکانی زیاد بوون.
**شَكِع، شاكِع، شكوُع** ڕژدی و ڕووگرژی.
•**شَكَلَ ١/الأمرُ:** تێکەڵ وپێکەڵ بوو. **٢/العنبُ:** دەستی بە پێگەیشتن کرد. **٣/الدابة:** بەزنجیر بەستیەوە

**شكل** شێوه، شێواز، چۆنێتی، وێنه ونمونه.

**شكلیّ** روالّەتی.

•**شكَمَ** /۱ه، پاداشتی دایەوه، بەرتیلیدا، بۆ دەنگی كرد.

**شكور** سوپاسگوزار، زۆر سوپاسكەر، ناوێكە لەناوه جوانەكانی خوای گەوره.

**شكو، شكوی** نەخۆشیی، ناساغی، سكالاّ.

**شكة** مەسافە.

**شكیس** بەدقووم، نەگبەت.

**شكَی** شكایەت وسكالاّی كرد.

**شكیمة** سەركەشی، ناز، خۆبە زلزانین، پەیمان وبەلّێن.

**شلاّل** تافگە، ئاوی لە بەرزیەوه بە خوڕ دابەزیو بۆ خوارێ.

**شلاَل** خەلّكی پەرتەوازه وبەش بەش.

**شلاء** دەستی گۆج، ژنی دەست گۆج.

**شلّة** هەر مەسەلە وداخوازیەكی دوور كەمرۆڤ مەبەستی بێت بیگاتێ.

•**شلّت** /۱الید، گۆج بوو، ئیفلیج بوو.

**شَلَقَ** لە باری درێژی بڕیی، بە قامچی لێیدا.

**شلقاء** چەقۆ، كارد.

•**شَلَل** /۱فەلەج، ئیفلیج، گۆجی. /۲الأطفال، ئیفلیجی منداڵان. /۳جزئی، ئیفلیجی ناتەواو. /٤نصفی، نیوه ئیفلیجی.

**شلو** ئەندام، بەچكەی وشتر، هەر قەلّخ كراوێك هەندێكی خوار بێت وهەندێكی مابێتەوه.

**شلو** ڕۆشتن، ڕێ كردن، ڕێ بڕین.

**شلوة** پارچەیەك لەهەر شتێك.

**شلّة** دەستە، گرۆ.

**شلّة** نیاز یان نیاز ونیەتی سەفەر.

**شمّ** بۆن كردن، هەست كردن بە بۆن.

**شمّ** بۆنی كرد، بۆنی هەلّمژی، كەشو فش وفیزی كرد، لوت بەرزی نواند.

**شماتة** بەدخوایی، بەد خوازی بۆ خەلّك.

**شماتی** ئومێد براوان، هیوا بڕاوان.

**شماخ** زۆر شەریف، زۆر عیزەت دار.

**شماع** كالتەو گۆرانی گوتن وپێكەنین، شۆخی وخەنداں وستران گوتن.

**شمّاس** خزمەتكاری كلّێسا.

**شماص** پەلە، خێرا.

**شمّاع** مۆم دروست كەر، مۆم فرۆش.

**شمال** چەپ، لای چەپ، جەمسەری باكور.

**شمّام** گندۆرەی زەرد، كالّەك.

•شمتَ ١/بفلانٍ: حۆشحاڵ بوو بە توش بونی فلان کەس بە بەڵاو موسیبەت.
•شمَتَ ١/بینهما: کۆی کردەوە.
•شَمَجَ ١/الشئ: تێکەڵی کرد، تێکەڵاوی کرد.
شَمَخَ بەرزو بڵند بوو، پلەو پایەی بەرز بوو.
شمخ پەلو پۆی درەخت.
شَمْذَر ڕۆشتنی بەپەلە وخێرا.
شَمَرَ بە فیزو لوت بەرزیەوە یان بەپەلە ڕۆشت.
شمر سەخی، دەست گوشاد.
شَمَرَ، شَمَّرَ خۆی بۆ کار ئامادە کرد.
•شَمَزَ ١/منهُ: نەفرەت و تەرێزی لێکرد لەبەر ڤێزەونیەکەی، بێزار بوو.
شمز تەرێز کردن لە شتێك کە ڤێزەون وناخۆش بێت.
شَمَسَ یاخی بوو و ملی نەدا، سەرکەش بوو.
•شَمَّسَ ١/الکافر: خۆری پەرست.
شمس خۆر، هەتاو، کەهکەشانێکی زەبەلاحی ئاگرینەو سەرچاوەی یەکەمی گەرمیە لەسەر زەویدا پلەی گەرمی ڕوەکەی ( ٦٠٠٠ )و ناو کرۆکەکەشی چەندین ملیۆن پلەی سەدیە، تیرەکەی (١٠٩) ئەوەندەی تیرەی زەویە.
•شَمِسَ ١/الیوم: هەتاو تیایدا دەرکەوت.
شَمْسی هەتاویی.
شَمسیّة چەتر، ئەوەی مرۆڤ خۆی پێ دەپارێزێت لە باران وگەرمای بەتینی خۆر.
شَمِصَ پەلەی کرد بەقسە کردن.
شَمِطَ موی سپی ورەشی سەری تێکەڵاو بوون.
•شَمَطَ ١/الشئ: تێکەڵاوی کرد، ئاوێتەی کرد.
•شَمَظَ ١/الشئ: ئاوێتەی کرد، کەم کەم بردی.
شَمَعَ یاری وگاڵتەو گەپ وشۆخی کرد.
شمع مۆم، بەرەمێوی هەنگوین یان هەرشتێکی تر فتیلەی تێ دەخرێت وبۆ ڕووناك کردنەوە بەکار دەهێنرێت.
•شَمَّعَ ١/الرجلَ: ناچاری کرد یاری و گاڵتەوگەپ بکات.
شَمِعَ نەرم، مۆمی، مۆمین.
شَمِقَ درێژ، پێچەوانەی کورت.
•شَمِلَ ١/الأمرُ القومَ: هەمویانی گرتەوە، سەرجەمیان پشکیان لەو مەسەلەیە بەرکەوت.

**شمَل** خەڵك وباران و وشتر وخورمای کەم.

**شمل، شمَل** گرۆه، کۆمەڵ، بای باکور.

**شملة** عەبا، پارچە قوماشێکی پانەولەخۆوە دەپێچرێت.

**شملة** شێوەی لەخۆوە پێچانی عەبا.

**شمَنْدَر** شەوەندەر، چەوەنەر، ڕوەکێکی بەناوبانگە وچەند جۆرێکی هەیە ولە بواری دروست کردنی شەکردا، ململانێی قامیشی شەکری پێ دەکەن.

**شمُوس** هەر ڕۆژێك خۆری بەچاکی تێدا دەربکەوێت وهەور بەئاسمانەوە نەبێت.

**شمُوص** خێرا، شادومان.

**شمّوط** گوڵە زەرات.

**شمُول** بای باکور، توو، تووفەرەنگی، شلك.

**شميم** بۆنی خۆش، بەرز، بڵند.

**شنّ** کۆن ودڕاو.

**شنّار** لەکەو پەڵە، ناتەواوی وعار، قێزەونترین عەیبە.

**شنار** کاری شەرم هێنەر، ڕسوایی وبەدناوی.

**شناعة** بەدی، دوژمنی، قێزەونی.

**شناق** گوریسێکە سەری وشتری پێ ڕادەکێشرێت، هەر تاڵە دەزوو یان حەبلێك شتێکی پێوە هەڵواسرابێت.

**شنان** دوژمنی، ناکۆکی.

**شنان** هەور، ئاوی سارد.

**شناءة** دوژمنیی سەخت و ڕق لەتەك بەدڕەوشتیدا.

•**شنا، شناوشنانا ۱/الرجل:** بوغزاندنی و دژایەتی کرد.

**شنْبَث** شێری بێشە وجەنگەڵ.

**شنَج** وشتری نێر.

**شنِجَ** توشی کوڵنج یان تەشەنوج بوو.

**شنْدَخ** شێری بێشە وجەنگەڵ، بەو خۆراکە دەگوترێت کە کەسێك دروستی دەکات.

**شنَرة** ڕەفتارو کردەوەی پیاوی ساڵح.

•**شنّ ۱/الغارة:** هێرشی کرد، شاڵاوی کرد.

•**شنَعَ ۱/ه:** جنێوی پێداو ڕیسوای کرد.

**شنُعَ** قێزەون بوو.

•**شنّعَ ۱/ه:** ڕیسوای کرد.

**شنِع، شنيع** قێزەون، ترسناك.

**شنْعَفة** درێژیی.

**شنعوف** لوتکەی کێو، بەرزترین خاڵ لە چیادا.

**شَـــنِفْ** هەرچــییەك بــە گوێــچکەوە هەڵبواسرێت وەك گوارە.

**شَـنَفَ، شَـنُفَ ١/الیـه:** بـە قنگـە چـاو سەیری کرد.

**شَـنِقَ** ئـارەزووی شـتێکی کـردو پێیــەوە هۆگربوو.

**شَنَق** گوریس، حەبل.

•**شَنَقَ ١/البعیرَ:** بـە جڵەوەکەی ڕایکێشا لەکاتێکدا سواریشی ببوو. **٢/الشیءَ:** هەڵی واسی.

•**شَنَّقَ ١/الشیءَ:** بڕیی.

**شَنق** لە سێدارەدان، بەپەتدا کردنی ملی تاوانبار تاکو دەخنکێت و دەمرێت.

**شَنقاء** وشتری سەر درێژ.

**شُنُون** لاواز، لەڕ، برسی، قەڵەو، گۆشتن.

**شَوَاش** ئاکۆکی وپشێوی.

**شَوَّاف** پیاوی چاو تیژ.

**شَوَّان** کۆکەرەوەی کرێی خانوو وسودی زەوی.

**شِوَاة** پارچە گۆشتێکی برژاو.

**شِوَایة** برژاندن.

**شَوب** هەنگوین، پارچەیەك هەویر.

**شَوبَة** فڕوفێڵ.

•**شَوَّذَ ١/ت الشمسُ:** بەرەو ئاوابوون چوو.

•**شَوِرَ ١/بە:** خەجاڵەتبار وشەرمەندە بوو پێی.

**شَور** شێوەی جلو بەرگ، ڕاوێژ.

**شُورَة** شانەی هەنگ.

**شُورَة** شەرمەندەیی، خەجاڵەتباریی.

**شُورَی** ڕاوێژ، پرس و ڕا، ئامۆژگاری.

**شُوزَب** ئاماژە ونیشان.

**شَـــوِسَ** بــە قنگەچــاو ڕوانـــی لەبـــەر فیزکردن یان ڕق لێ بـوون، چاوی بچوك کردەوە بۆ سەیر کردن.

**شَوس** سیواك کردنی ددان.

•**شَوَّشَ ١/الأمرَ:** تێکەڵ وپێکەڵی کرد.

•**شَـوَّصَ ١/الرجـلُ:** سـیواکی بـە دەمیـدا هێنا.

•**شَـــوِصَ ١/ت عینـــە:** چـاوی زل بـــوو بــــەجۆرێك پێڵووەکــانی نەدەنیــشتنە سەریەکتر.

**شَوصَـة** سـك پەشـە، ژانەسـك، ئـازارێکی ئاوسـکە بـەهۆی (بـا) یەکـەوە دروسـت دەبێت کە لەناو سکدا دەگەڕێت.

**شَوط** ئامـانج، بـە یـەکجار ڕۆشـتن بـەرەو مەبەست وئامانج.

•**شَـــوَّطَ ١/**سـەفەرەکەی درێـژەی کێـشا. **٢/القِدرَ:** کوڵاندی، هێنایە کوڵ.

**شَوَع** پەراکەندە ولێك جیابوونەوەی قژی سەر بەهۆی زبریەوە، ئاڵۆسکان.

•**شَوَّعَ ١/القوم**: کۆی کردنەوە، گردی کردنەوە.

•**شَوَّفَ ١/الجارية**: ڕازاندیەوە، ئارایشتیدا.

**شَوف** ئامێرێکی سادەیە زەوی کێڵراوی پێ تەخت دەکرێت.

**شَوِق** ئارەزوومەند بوو.

**شَوق** حەزی دڵ، ئارەزووی دەروون.

**شُوق** ئاشقان، دڵداران.

**شَوقَب** پیاوی باڵا بەرز.

•**شَوَّكَ ١/الشجر**: دڕکی لێ دەرهات. ٢/**الفرخ**: چوزی پەڕەکانی دەرهات.

**شَوك** دڕك، خار، هەر ڕوەکێك تلی وردیلەی وەك دەرزی پێوە بێت.

•**شَوكَة ١**/هێز وتوانا، چەك، دڕك، چزوی دووپشك، ئازایەتی. ٢/**الكلب**: چنگاڵ. ٣/**السمك**: دڕکی ماسیی. ٤/**العقرب**: چزی دووپشك، چزوی دووپشك.

**شَوِك** دڕکدار، دڕکاوی.

**شَوْل** سوك، پاشماوەی ئاو لەدۆڵچە یان مەشکە یان هەر شتێکی تردا.

**شَوِل** زرنگ، چالاك.

**شَوَلَة** دووپشك.

**شُوم، شُؤم** بەدبەختی.

**شَومَة** ڤێزمونی.

**شَوِنَة** ژنی کەم فام وگەمژە.

**شُونَة** کەشتی گەڵ ئامادەکراو بۆ جیهاد لەدەریادا.

•**شَوَّهَ ١/هُ**: ناشیرین و ڤێزمونی کرد، تێکیدا.

•**شَوِهَ ١/الوجه**: ناشرین بوو، ڤێزمون بوو.

**شَوَه** درێژی مل، ڤێزمونی.

**شَوى** پێستی سەر، کاری ئاسان، کەم لەهەر شتێك.

**شَويّ** گۆشتی برژاو، بریانی.

**شُوَيّة** کەم، پێچەوانەی زۆر.

•**شَهَا ١/الشيء**: ئارەزووی کردو زۆر حەزی لێی بوو.

**شِهاب** هەرچی شتێك بریسکەو ڕووناکی لێوە دەرچێت، ئەستێرە بەگشتی.

**شَهاب** شیرێك دوو لەسەرسێی ئاو بێت، شیرێك ٢/٢ ی ئاو بێت.

**شَهَادَة** گەواهی دان، دان پێدانان وشایەتیدان.

**شَهامَة** دلاوەریی، پیاوەتی و وشیاری، چالاکی.

**شَهَب** شاخێك لوتکەکانی بەفر گرتبێتی.

**شُهُب** ئەستێرەی درەخشاو.

**شَهباء** نازناوی شاری حەلەبی سوریایە، سالّی بێ باران وبێ سەوزی، سالّێ بەفری زۆر بێت.

•**شَهَبَ ١/ه الحرُ** گەرما ڕەنگی گۆڕی.

•**شَهِدَ ١/شهادة** گەواهی دا. **٢/المجلس** ئامادەی بوو. **٣/الجمعة** پیایدا گەیی. **٤/الشئ** بینی، ئەو شتەی بینی.

•**شَهَرَ ١/ه** ئاشکرای کرد. **٢/السیف** دای هێنایەوەو بەرزی کردەوە، ڕای تەکاند.

**شَهْر** مانگ، بەشێك لە دوانزە بەشەکەی سالّ.

**شُهرَة** ناوبانگ، ئاشکراو ڕون بونەوەی هەر مەسەلەیەك، ڕیسوایی.

**شَهریّ** مانگی، مانگانە، مانگ بەمانگ.

**شَهریَّة** مانگانە، کرێی مانگانە یان هەرشتێکی تری مانگانە.

**شَهَقَ** بەرز بوو، بلّند بوو.

**شَهقَة** بانگ وفریاد.

**شَهلاء** پێداویستی، پێویستی.

•**شَهَلَ ١/ثوبَهُ** کراسەکەیی قارس کرد.

**شَهل** درۆ، قسەی ناڕاست.

**شَهَل** بەوە دەگوترێت ڕەشایی و شینایی تێکەل ببێت.

**شَهِل** چابك، چالاك.

**شَهلَة** ژنی پیر، پیرە ژن، ژنی بە سالّدا چوو.

•**شَهَمَ ١/الرجلَ** ترساندی، سلّەمایەوە.

**شَهم** بەهۆش وزیرەك.

**شَهوَة** ئارەزووی دەروون بۆ چێژو لەزەت، ئارەزوو، هەوەس، هەوەسی سێکسی.

•**شَهِیَ ١/الشئ** حەزی لێکردو زۆر ئارەزووی لێ بوو.

**شَهید** ڕاستگۆ لە شایەتیداندا، گەواه، کوژراو لەڕێگەی خوادا.

**شَهیر** ناسراو، هەر شتێك لەلای خەلّکی بەناوبانگ بێت، ڕیسوا، بەدناو.

**شِیاح** بێ بارانی وگرانی، وشکایی و پارێز.

**شیاص** بەدخوویی، بەد ڕەوشتی.

**شیاط** بۆنی پەموو وخوری سوتاو.

**شِیاف** دەرمانێکە بۆ چاو بەکار دەهێنرێت.

**شَیّال** باربەر، بارهەلّگر.

**شِیالَة** کرێی باربەری.

**شِیام** خۆلّ، زەوی نەرم.

**شَیّام** خۆلّ، مشك.

**شِیاة** خواست، ویست.

**شَیب** سپێتی موی سەرو پیریی.

**شِيب** ڕۆژێك هەورو بەفری تێدا بێت (وشەکە جەمعە).

•**شَيَّب ١/الحزن فلانا:** خەفەت ودڵتەنگی فلان کەسی پیرکرد.

•**شَيَّحَ ١/ه:** ئاگاداری کردەوە، حەزەری پێدا.

**شِيح** پیاوی پارێزکار، پیاوی جدی لەکاردا.

•**شَيَّخَ ١/**پیر بوو. **٢/ه:** بە (یاشیخ) بانگی کرد بۆ ڕێزلێگرتنی.

**شَيخ** سەرۆك هۆز، زانا، خاوەن ڕا، پیری بە تەمەندا چووگ.

**شَيخوخة** پیری، پیرێتی، بەساڵاچوون.

**شَيخَة** پیرە ژن.

•**شَيَّدَ ١/البناء:** دروستی کرد، بەرپای کرد.

**شِيد** گەچ یان هەرشتێکی تر دیواری پێ سیواق بدرێت.

**شيشه** شوشەیەکە نارگەلەی تێدا دەکێشن.

**شيش** سیخی کەباب، سیخی گۆشت برژاندن.

•**شَيَّصَ ١/القوم:** ئازارو ئەشکەنجەی دان.

**شِيص** جۆرێکە لەخورما.

•**شَيَّطَ ١/الدواءُ الجرحَ:** سوتاندی.

**شَيطان** مار، هەر یاخی وسەرکەشێك ج مرۆڤ بێت یان پەری یان ئاژەڵ، ئیبلیس.

•**شَيَّعَ ١/ه:** چوە دەرێ لەگەڵیدا بۆ وەی خوا حافیزی لێ بکات. **٢/الرجلَ:** پڕو پاگەندەی شیعەگەری کرد. **٣/النارَ:** داری خستە سەری بۆ وەی زیاتر کڵپە بسەنێت. **٤/الشيءَ بالنار:** سوتاندی. **٥/شهر رمضان:** لە دوای مانگی ڕەمەزان شەشەلانی گرت، لە دوای ڕەمەزان شەش ڕۆژ بە ڕۆژوو بوو.

**شَيع** بڕ، ئەندازە، نمونە ووێنە.

**شيعَة** پەیڕەوان و لایەنگرانی پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تاڵب، مەزەبێکی ئیسلامیە.

**شَيق** لوتکەی چیا، سەخت ترین شوێنی کێو، موی کلکی ئاژەڵ.

**شِيمَة** سروشت، خوو، نەریت.

**شيُوع** بڵاوبونەوە، پەخش بوون.

**شَيئ** شت، کەم.

**شُوْم** پێچەوانەی بەرەکەت، شومی.

**شؤمی** چەپ، لای چەپ.

**شُؤُون** کاروبار، پێداویستیەکان (وشەکە جەمعە).

++●**صَنِكَ** ١/ ئارەقى كردو بۆنى ناخۆشى لێوەهات. ٢/**بە**: پێوەی چەسپا.
**صائِب** دروست، ڕاست، دروستكار، پێچەوانەی هەڵە.
**صائِد** ڕاوچی، ڕاوكەر، نێچیرڤان.
**صائِغ** زەڕەنگەر، ئاڵتونچی، كەسێك بەئاڵتون سازیەوە سەرقاڵ بێت.
**صائِف** گەرم، پێچەوانەی سارد.
**صائِم** پیاوی ڕۆژووەوان، بەڕۆژوو، كەسێك خۆی لەخواردن و خواردنەوەو جیماع كردن گرتبێتەوە لەماوەیەكی دیاری كراودا.
**صائِمَةَ** ژنی ڕۆژودار، چەقۆی كول.
**صائِن** نیگابان، ئاگادار.
●**صاب، صَوبا** ١/**المطرُ**: داباری وهاتە خوارێ. ٢/**الشيءُ**: لەبەرزیەوە هاتە خوارێ. ٣/**السهمُ**: نیشانەی پێكا.
**صابِلَة** ئاینی پەیرەو كراوی ئیدریس پێغەمبەر.
**صابِر** ئارام گر، بەئارام.
●**صابَرَ** ١/**هُ**: لەسەبرو ئارام گرتندا لەوزیاتر بوو.
**صابون** سابون، پاك كەرەوەیەكی تایبەتە.
**صابَة** لاوازی وسستی ئەقڵ، موسیبەت.

**صاح** بێداربەهۆش، وشیار، شەوبەئاگا.
●**صاحَ** ١/هاواری كرد، بانگەبانگی كرد. ٢/**هُ**: لەمتی كرد، قڵیشاندی. ٣/**الديكةَ**: كەڵەشێرەكە قوقاندی، خوێندی. ٤/**بِهِ**: بانگی كرد. ٥/**عليهِ**: دلگرانی كرد.
**صاحِب** هاوەڵ، هاوڕێ، یار، یاوەر، دۆست، خاوەن.
**صاحِبَة** هاوسەری پیاو.
**صاحَرَ** ئاشكرای كرد.
**صاحَة** زەویەك هیچی لێ نەڕوێت.
**صاحِي** هۆشیار،وشیار.
●**صاخَ** ١/**في الأرضِ**: چوە ناویەوە، پێی تێنا.
**صاخِدَةَ** نیوەڕۆ، قرچەی نیوەڕۆ.
**صاخِر** تەقەی كەوتنی ئاسنێك بەسەر ئاسنێكی تردا، دەنگی بەسەر یەكدا كەوتنی دووئاسن.
**صاخَّة** قیامەت، بەلاو سەختی، ناڕەحەتی.
**صاخَة** ئاسەواری زەربێك لەسەر ئێسقان، ئاسەواری شكاوی ئێسقان، سەختی وناڕەحەتی.
**صادُ** شێری بێشەو جەنگەڵ، نەخۆشیەكی وشترە.

●**صـــادَ ١/الطـير:** ڕاوی کـرد، کـردی بەداوەوە.

**صادَرَ** دەستی بەسەرداگرت، موسادەرەی کرد.

**صادِع** فەرماندار، دادوەری نێوان خەڵك.

●**صـــادَفَ ١/ه:** بەمەبەست یـان بـەبێ مەبەست چاوی پێی کەوت.

**صادِق** ڕاستگۆ، پێچەوانەی درۆزن.

●**صـــادَقَ ١/علـى الـشيء:** ڕەزامەنـدی لەسـەر دەربـڕی و مۆڵەتیـدا. ٢/ه: بویـە هاوڕێی.

●**صادَمَ ١/ه:** لێیدا، پیایدا کێشا.

**صـــادي** زۆر تینـــو، کەســـێك زۆری تینوبێت.

●**صارَ ١/الشيء:** لاری کـردەوە. ٢/صيراء: گەڕایە دواوە. ٣/ه: بڕیی.

**صارِخة** فریاکەوتن.

**صارِخ** کەڵەشێر، هات و هاوارکەر، ڕون وئاشکرا.

●**صـــارَعَ ١/ه:** زۆرانـــی لەگەڵـداگرت، هەولیدا بیدات بەئەرزدا.

**صارِم** بڕندە، شیمشێر،پیاوی ئازاشێری بێشەو جەنگەڵ.

**صاروخ** موشەك، ڕۆکێت.

**صارّة** تینوێتی.

**صـــاري** کەشـــتیەوان، ســـتونێکە لەناوەڕاسـتی کەشـتیدا چارۆکەی پێـوە هەڵدەواسن.

●**صاعَ ١/الصَّبا:** دەغڵەکەی بەساع پێوا. ٢/الشيء: پرزوبڵاوی کردەوە.

**صـاع** یەکەیـەکی پێوانەیـە، جێگەیـەك گسك بدرێت ودواتر یاری تێدابکرێت.

**صاعِب** زەوی پڕلەبەردو درەخت.

**صاعِد** بەرەو سەر ڕۆشتوو.

**صـــاعِقة** بروســـکەو چـــەخماخەی هەورەگرمە، مردن، هەر ئەشکەنجەیەکی لەناوبەر.

●**صـــاغَ ١/الكلمــة:** وشـــەی داڕشــت. ٢/الـشيء: لەســـەر شـێوەیەکی ڕاســت ئامـــادەی کـــرد. ٣/الـذهب: ئـــاڵتونی داڕشتەکرد.

**صـــاغَة** زەڕەنگـەر، هەرکـەس پیـشەی ئاڵتوسازی بێت (وشەکەجەمعە).

**صـــاغِر** هەرکەســـێکی قایـل بەســـتەم وسەرشـۆڕی، کەسـێك ملکـەچ بێـت بـۆ ستەمێك کەلێی دەکرێت.

●**صافَ ١/الكبش:** خوریەکـەی زۆر بـوو. ٢/عن كذا: لایدا لێی.

●صافَحَ ١/هُ: تەوقەی لەگەڵدا کرد، لەپی دەستی خستە ناولەپی دەستی ئەوەوە.

صافِد کەسێك هەردوو قاچی لەنێو پێوەند دابێت.

●صافَقَ ١/الرجلان: لەکاتی کڕین وفرۆشتندا دەستیان خستە ناودەستی یەکتری.

صاقِعة هەورە بروسکەو هەورەگرمە.

صاقِع درۆزن.

صاقُود زمان، پیکی بەرد شکاندن، قولنگی دووسەر، پاچ.

●صاكَ ١/بِهِ المسك: پێوەی چەسپا.

صالّ بارانی لێزمەی دنکۆڵە گەورە.

●صالَ ١/ عليه: چەوساندیەوەو بەسەریدا زاڵ بوو.

صالِح چاك، چاکەکار، بۆ خوا سوڵحاو، ناوی پێغەمبەرێکە.

صالَحَ ئاشتەوایی کرد.

صالِحَة زنی چاکەکار.

صالِخ ڕەش مار.

صالِد بەردی چەخماخ کەپزیسکەی لێوە دەردەچێت.

صالَّة ناڕەحەتی وسەختی، بەلا.

●صامَ ١/ڕۆژوی گرت، بەڕۆژو بوو، خۆی گرتەوە لەخواردن وخواردنەوەو جیماع کردن. ٢/صَوما وصياما: خۆی گرتەوە لەخواردن و خواردنەوەو ڕۆشتن وقسەکردن. ٣/النعام: ڕیقنەی کردپاشەڕۆی فڕێدا.

●صامتَ ١/بێ دەنگ، خامۆش، کپ، شێری خەو توو. ٢/من المال: ئاڵتون وزیو دەگرێتەوە.

صامِد پاشماوەی هەرشتێکی ڕۆشتوو، خۆڕاگر.

صامِر ڕژد، چاوچنۆك.

صامِل، صميل وشك، پێچەوانەی تەڕ.

●صانَ ١/هُ: پاراستی، ئاگاداری کرد، ڕێکوپێکی کرد، قایمو قوڵی کرد.

صانِع دروستکەر، دەست ڕەنگین، کەسێك بەدەستی کاربکات وشت دروست بکات.

صايِع دەست بەتاڵ، بێکارە.

●صأی ١/الفرخ: جوجکەکە جوکەجوکی کرد.

●صبَّ ١/الشئ: ڕۆشی، لەبەری کرد.

صبّ ئاشق، دڵدارێکی زۆر سوتاو بەئەشقەوە.

**صَبا** مەیلی نادانی کرد، مەیلی نەفامی مندالانەی کرد.

**صَـبابَة** ئارەزوی زۆر، زۆر سوتاوی بۆدلداری.

**صَباح** بەیانی، سەرلەبەیانی.

**صَبّار** زۆر ئارام گر، فرە بەئارام.

**صَبّاغ** درۆزن، بۆیاخچی، بۆیەچی.

**صِباغ، صِبغ** رەنگ، بۆیەبۆیاخ، بۆیاغ.

**صِباغَة** پیشەی بۆیاخچێتی.

**صَبّان** سابون دروست کەر، سابون فرۆش.

**صَبَأَ** لەئاینی خۆی لایداو چوەناو ئاینێکی ترەوە.

**صَبَب** سەرەولێژ، هەر زەوی یەك یان رێگەیەك سەربەرەوخواربێت، هەڵدێر.

**صُبح** بەیانی، سەرلەبەیانی، سەرەتای رۆژ.

**صبحاء** ژنی موو رەشی سورباو، ژنێك موەکانی رەشی سورباو بێت.

●**صَبِحَ ١/الحدیث:** بریسکایەوە، بریکەی لێوە هات.

**صَبَح، صُبحَة** موی رەشی سورباو.

●**صَبَرَ ١/**ئارامی گرت. **٢/الدابة:** بەبێ ئالف بەستیەوە.

●**صَبَّرَ ١/ه:** داوای لێکرد ئارام بگرێت.

**صَبر** ئارام گرتن و شکایەت نەکردن لەئازارو بەلا.

**صَبَر** بەفر، سەهۆڵ.

**صَبَعَ** بەپەنجە ئاماژەی کرد.

**صَبع** خۆبەزل زانین، لوت بەرزی.

●**صَبَغَ ١/الثوب:** رەنگی کرد، بۆیاخی کرد. **٢/یَدَهُ في الماء:** دەستی نقوم کرد لەئاودا.

**صِبغَة** ئاین، رەنگ، شێوە، جۆر.

**صَبَّن** بەسابون شۆردی.

**صَـبُور** بەئارام، زۆر بەئارام، ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە.

**صَـبوَة** نەفامیی سەردەمی لاوێتی، هەرزەکارێتی.

**صُبُوّ، صَبوَة** ئارەزومەندیی.

**صَبِيَ** ئیشی مندالانەی کرد.

**صَـبِيّ** مندال، منال، مندار، تیژیی شمشێر.

**صَبَی** لەنوێ جوان بویەوە، سەرلەنوێ مندال بویەوە.

**صَبِیح** گەش، درەخشان، نورانی.

**صَبِیَّة** کچ لەتەمەنی مندالیدا.

**صِبیانيّ** مندالانە.

●**صَتَّ ١/ه:** بەدەستی لێیدا.

**صَــتّ، صِتّ، صُــتَّة** كۆمــەڵ، دەســتە، گرۆهی خەڵك.

●**صَــتَعَ ١/ه**: دای بەنــەرزدا، كێــشای بەزەویدا، خستیە سەر عەرد.

**صَــتَع**: گــەنجی بــەهێز، لاوی بــەتوانا، كەری كێوی، گوێدرێژی كێفی.

●**صَــتَّمَ ١/الـشيءَ**: تــەواوی كــرد، كــامڵی كرد.

**صَتم، صَتَم**: هەرشتێكی تۆكمەو تــەواو، قایم و قۆڵ.

**صَتيمَة** تاوێری سەخت، بەردی فرە ڕەق و سەخت.

**صَحّ** ئاسنێكی كێشا بەئاسنێكی تــردا و تەقەیان لێوەهات.

●**صَحّ**: ١/نەخۆشیەكەی لـەكۆڵ بویـەوە، تەنــدروســتی بــۆ گەڕایــەوە، لەنەخۆشــین چــاك بویـــەوە. ٢/**الـــشيءُ**: لەهـــەر ناتەواویەك قوتار بوو.

●**صَحا ١/اليومُ**: سایەقە بوو، هیچ جۆرە تەمو مژ و هەورێك بەئاسمانەوە نــەبوو. ٢/**السكرانُ**: بێدار بویەوە، هۆشی هاتەوە، ڕابوو.

**صَــحابَة** یــاوەرانی پێغەمبــەری خــوا (د. خ).

**صَحَا، صَحواً، صَحِيَ** بێــدار بویــەوە، لەخەو ڕابوو، وەئاگاهاتەوە.

**صَحّاف** كەسێك لەخوێندنەوەی پــەرتوك یان هەرنوسراوێكدا هەڵەبكات، ڕۆژنامــە فرۆش، كتێب فرۆش.

**صِــحافَة** ڕۆژنامەنوســین، نوســینی ڕۆژنامــە، ڕۆژنامــەڤانی، ڕۆژنامەگــەری، پیشەی ڕۆژنامەنوسی.

●**صَــحِبَ ١/ه**: هاوڕێیــەتی كردبویــە هاوەڵی، هاودەمی كرد.

**صَحب** هاو نشین، هاودەم.

●**صَــحَبَ ١/الــمذبوحَ**: قــەڵخی كــرد، پێستەكەی لێكردەوە.

●**صَحَّحَ ١/** چاكی كــرد، ڕاســتی كــردەوە. ٢/**المريضَ**: نەخۆشــیەكەی لابرد،چــاكی كردەوە.

**صَحِر** سوری تێكەڵاوی سپی بوو.

**صَحراء** بیابان، دەشتایی پان و بۆڕی بێ گژو گیا، ماكەری سوری بەسپی تێكەڵ.

●**صَــحَّ ١/الخبرُ**: ڕاســت بــوو، ســەلمێنراو ڕاست و دروست بوو.

●**صَــحَّفَ ١/الكلمـــةَ**: هەڵــەی كــرد لەگێڕانەوەو خوێندنەوەیدا.

**صَحْفَة** سینی، دەوری.

**صَحَفي** ڕۆژنامەنوس، ڕۆژنامەڤان.

●صَــحَنَ ١/ه: لێیــدا، پیایــدا کێــشا. ٢/بیــنهم: ســوڵح وئاشــتەوایی کــرد لەنێوانیاندا.

صَحْن دەفر، حەوشەی ماڵ.

صحو وشیاری، هۆشیاری.

صِـحَّة تەندروسـتی، سـاغڵەمی، دوچـار نـەبونی لـەش بـەهیچ جـۆرە دەردێـك، پێچەوانەی نەخۆشی.

صَـحِیح ڕاسـت، دروسـت، تەندروسـت، تـەواو، کامـڵ، هەرچـیەك پـشتی پـێ ببەسـترێت، هەرشـتێکی بـێ لەکـەو ناتەواوی.

صَـحِیرة شـیر دەکوڵێنرێـت و پاشـان دەکرێـت بەسـەر ڕۆن و ئـارددا، شـیری کـوڵاو ڕۆبکرێـت بەسـەر ئـاردو ڕۆنـدا، جۆرەخواردنێکە.

صَحِیفَة نامەو پەرتوك، پەڕە، ڕۆژنامە.

صَخَب تێکەڵاو بوونی دەنـگ، قـرە قـرو غەڵبە غەڵب.

صَخِب پیـاوی دەنگە دەنـگ کـەر، پیـاوی قرە قرکەر.

صَخِبَ بەتوندی قیراندی.

●صَــخَدَ ١/تــه الـشمس: خـۆر لێیـدا وگـەرمی کـرد، خـۆر هـەڵی کوروزانـدو سوتاندی. ٢/الیه: گوێی بۆ گـرت، گوێی بۆ ڕادێرا.

●صَـخِدَ ١/الیـوم: گەرمیەکـەی تـاوی سەند.

صَخرة، صَخَرَة گابەردی ڕەق وسەخت.

صَخِر هەرجێگەیەك بەردی زۆر بێت، جێگەی بەردەڵان.

صَخّ، صَـخَّة دەنگـی ئاسـن یـان بـەرد لەکاتێکدا بەشتێکی تردا بکێشرێت.

صَخُوب زۆر قرەقرکەر، دەنگ ڕەق.

صُخُور تەختە بەرد. (وشەکە جەمعە).

●صُخُور ١/المتحولة: گابەردی بلوری.

صَخِیخ دەنگی قەڵە ڕەشـەکە لەکاتێکدا لەشتێك بترسێت وبسڵەمێتەوە.

●صَـدَّ ١/ه عـن کـذا: قەدەغـەی کـرد. ٢/عنه: لێی یاخی بوو، لێی لادا.

صَدّ، صُدّ شاخ، چیا، کەژ، کێو، هـەوری بەرز کەوەك شاخ دێتە بەرچاو.

صَـدَأ ژەنـگ، چڵکی سـەرکانزامادەیەکی سوری ڕەش باویان مەیلەو قاوەیی تۆخـە بەهۆی (شێ)وە لەسەر ئاسن دەنیشێت.

صُدأة ڕەنگی ژەنگی ئاسن، ڕەنگی سـوری ڕەش باو یان قاوەیی باو.

صَـدّاح ئـاواز خـوێن، ئـاواز یـان گـۆرانی بێژ.

**صِداد** پەردە.
**صُدّاد** مار، ڕێگەی بەرەو ئاو، ڕێگە بۆ سەر چاوگی ئاو.
**صَدارة** پۆستی وەزارەت لەسەردەمی عوسمانیەکاندا.
**صُداع** سەریەشە، ژانەسەر.
**صُداغ** دەردی شەقیقە، سەراسێی زۆر توند.
**صِداق** مارەیی ژن.
**صَداقة** دۆستایەتی، هاوڕێیەتی، خۆشەویستی بەڕاستی ولەدڵەوەو بەدڵ.
● **صَدَحَ ١/الرجلُ:** دەنگی بەرزکردەوە بۆ گۆرانی وتن وئاواز خوێندن.
**صَدَح** هەرجێگەیەکی چۆڵ وخاڵی.
**صَدَد** ئامانج، مەبەست.
● **صَدَرَ ١/عن المكانِ:** گەڕایە دواوە لێی. **٢/عنه:** لێیەوە دەرچوو ودروست بوو. **٣/الرجلَ:** گەڕاندیەوە. **٤/الأمرُ:** ڕویدا.
**صَدر** سینگ، بەرۆك، سینە، سنگ، مەمکی ژن‌سەرەتای هەرشتێك وەك ڕۆژو کتێب.
● **صَدرُ ١/الثوبِ:** سینگ و بەرۆکی پۆشاك. **٢/الأعظم:** سەرۆك وەزیران، یەکەم شالیاری دەوڵەت. **٣/القوم:** سەرۆك هۆز، ڕیش سپی ودەم ڕاستی هۆز. **٤/الكتاب:** پێشەکی پەڕاو، پێشدەستی پەرتوك. **٥/النهار:** سەرەتای ڕۆژسەلە بەیانی.
● **صَدَّرَ/الكتابَ:** دەست پێکی بۆ نوسی، پێشەکی بۆ نوسی.
**صَدريّة** سەدریە، مەمکەوانە، مەمکە هەڵبەست.
**صَديرة** بەرزاییەکانی سنگ وبەشی پێشەوەیان.
● **صَدَعَ ١/القومَ:** پەردەوازەی کردن. **٢/الأمرَ:** ڕونی کردەوە. **٣/بالحقِ:** بەئاشکرا باسی لێوە کردو دانی پێدانا.
**صَدع** درز لەشتی ڕەقدا، کەلێن و شکاوی لەشتی ڕەقدا.
**صِدع** کۆمەڵێك لەخەڵك، بەشێك لەهەرشتێك کەکرابێت بەدوو لەتەوە.
**صَدع** لاوی بەهێز، گەنجی بەتوانا.
● **صَدَعُ ١/الحديدُ:** ژەنگی ئاسن.
**صِدعة** ڕانێك مەڕ، ڕانێك مێگەل، بەشێك لەهەرشتێکی دوو لەت کراو.
**صُدِعَ** توشی ژانەسەر بوو، دوچاری سەر یەشە بوو.
● **صَدُغَ ١/الرَّجلُ:** لاواز بوو، سست بوو.
● **صَدَغَ ١/النملةَ:** کوشتی، مێرولەکەی کوشت.

**صُــدغ** نێـوانی چـاوو گوێـچکە، ئـەو جێگەیەی موی قەنافسی لێ دەروێت.

**صَدَغ** لاریی، خواریی، کەچیی.

**صدغ** گوستاخ، بێ ئابرو و شەرم.

**صَدَفَ** لایداو پشتی هەڵکرد.

**صَدَف** سەدەف، بەرگی مراوی.

**صُدفَة** ڕێکەوت.

**صَدَقَ** ڕاستی کرد، ڕاستی گوت.

**صَــدق** ڕاسـت ودروسـت، کامـڵ وتـەواو لەهەرشتێك.

**صِدق** ڕاستی، دروستی، سپاردە، دڵسۆزی، ڕەقی وتوندی.

**صَدَّقَ** باوەڕی کرد، بڕوای کرد، وەڕاستی گێڕا، بەڕاستی زانی.

**صدقًا** بەڕاستی.

**صَــدَقَة** بەخـشینێکە مەبەسـت لێـی پاداشتی خوایە نەك کرێی خەڵك، خێـر، چاکە.

●**صَدَمَ ١/ە:** خۆی پێداکێشا.

**صَدمَة** موسیبەت، خورپە.

**صَــدُوف** دەمـی بۆگـەن، دەمـێ بـۆنی ناخۆش بێت.

**صَدُوق** زۆر ڕاستگۆ، هەمیشە ڕاستگۆ.

●**صَدِیءَ ١/الشیءُ:** درێژ بوو. **٢/الحدیدُ:** ژەنگـی لەسـەر نیـشت، ژەنگـی هـەڵهێنا. **٣/الشیءُ:** ڕەنگی لەڕەنگی ژەنگ چوو.

**صَدِئ** ژەنگ لێ نیشتوو.

**صَدَی** تینوێتی زۆر، دەنگ دانەوە، لەشی مرۆڤ لەدوای مردنی.

**صَــدِی** پیـاوی زۆر تیـنـگ، پیاگـێ زۆری تینوبێت.

**صَــدید** زەرد داوی زام، خـوێن، ئـارەق، ناڵەو هاوار.

**صَدید** چڵکی زام، کێم و زوخی برین.

**صَدیق** هاوەڵی میهرەبان.

**صِدِّیق** چاکەکار، ئەمەکدار، پیاوی ڕاسـت گوفتارو دروست کار.

**صَرّ** پێچای، بەستی.

**صَرَّة** توندوتیژی شەڕ یان گەرما.

**صِرّ** سەرمای سەخت.

**صِرابَة، صَراحَ** پاڵفتە لەهەر شتێك.

**صَراحَة** ڕاشکاوی، ئاشکرایەتی، ڕونی.

**صَرّاخ** زۆرهاوارکەر، تاوس.

**صَرّاخ، صـارِخ** نـەعرەکێش، هاوارکـەر، هەرشتێکی ڕوون و بێ تەمومژ.

**صِراط** ڕێگە، ڕێ.

**صِراع** ململانێ، کێشمەکێش.

**صراف** سندوق دار، کەسێك پارە بەپارە بگۆڕێتەوە، کەسێك پیشەو کەسابەتی بریتی بێت لەئاڵ و گۆڕ کردنی دراوە جیا جیاکان.

●**صَرَبَ** ١/بڕیی. ٢/**الصبيُ:** چەند ڕۆژێك مایەوەو قسەی نەکرد.

**صَرب** شیری زۆر ترشەڵۆك.

**صَرُحَ** ئاشکرابوو، ڕۆشن بویەوە.

●**صَرّحَ** ١/**الأمرَ:** رونی کردەوە. ٢/**الأمرُ:** ڕون بویەوە. ٣/**النهارُ:** هەورەکەی ڕۆشت و خۆرەکەی دەرکەوت. ٤/**الرامي:** هاویشتی ومەبەستەکەی نەپێکا.

**صَرح** کۆشك، تەلار، هەر ئەپارتمانێکی بەرز.

**صَرحَة** حەوشی ماڵ.

●**صَرَخَ** ١/بەتوندی هاواری کرد. ٢/**القوم:** بەفریایانەوە چوو ویارمەتیدان.

**صَرخَة** هاوار.

●**صَرَدَ** ١/**الشيءَ:** بڕیی. ٢/**العطاءَ:** کەمی کردەوە.

●**صَرِدَ** ١/**من الايام:** ڕۆژی زۆر ساردوسۆڵە.

**صَرد** سەرما، ساردی و سۆڵەی سەخت، لوتکەی شاخ، پاڵفتە لەهەر شتێك.

**صُرَدان** دوو ڕەگی ژێر زمان.

**صَرَد** سوپایەکی گەورە، لەشکرێکی مەزن.

**صَرصَر** کەڵەشێر، ڕەشەبا یاخود بایەك زۆر بەهێز هەڵبکات یان ساردی وسۆڵەی زۆری لەگەڵدا بێت.

●**صَرصَرَ** ١/**الشيءَ:** کۆی کردەوە.

**صُرصُر** سیسرك، سفرەبڕە، سیسۆك، سیسرە.

**صُر صُور** کەشتی.

●**صَرَعَ** ١/**هُ:** دای بەزەویدا، کێشای بەئەرزدا.

●**صُرِعَ** ١/**المجنونُ:** بڕراو لادرا.

**صُرَعَة** بەئارامی لەکاتی توڕەبودا.

**صَرع** نمونە.

**صَرعَة** حاڵەت.

**صَرف** زانستێکە لەمقاڵب وئەحواڵی وشەعەرەبیەکان دەکۆڵێتەوە.

●**صَرَّفَ** ١/**اللهُ الرياحَ:** ڕێڕەوەکەی گۆڕی لەلایەکەوە بۆ لایەکی تر.

●**صَرفَ** ١/**الباب:** لەکاتی داخستن یان کردنەوەی داجیرەو دەنگی لێوەهات.

**صِرف** پوخت، پاك، ساف لەساف.

**صَرف** خەرج کردن، گۆڕینەوەی دراو.

●**صَرَفَ ١/الأمرَ:** تەمەنی سەرف کرد. **٢/المالَ:** ماڵ وسامانی خەرج کرد. **٣/النظرَ:** چاوی پۆشی، چاوپۆشی کرد، گرنگی نەدا. **٤/الشرابَ:** تێکەڵی نەکرد یان بەتێکەڵ نەکراوی خواردیەوە.

●**صَرَّفَ ١/النقودَ:** پارەی ئاڵو گۆڕ کرد، دراوی گۆڕیەوە.

●**صُرُوفُ ١/الدهرِ:** پێشهاتەکانی ڕۆژگار، ڕوداوەکانی ڕۆژگار.

**صَرُمَ** ئازاو چاو نەترس بوو.

●**صَرَمَ ١/الحبلَ:** قرتا. **٢/الشيءَ:** بڕیی.

**صَرم** پێستە، پێست.

**صِرم** کۆمەڵ، کۆمەڵێك ماڵ.

**صِرم، صَرمَة** کەوش.

**صَرُورَ** پیاوی ڕەبەن، پیاوێك ژنی نەهێنابێت یان حەجی نەکردبێت.

**صُرَّة** کیفی دراو تێکردن.

●**صَرِیَ ١/الماءُ:** زۆر مایەوەو ڕەنگ وتامی گۆڕا. **٢/اللبنُ:** تامی گۆڕا.

**صَرِیب** شیری ترش، شیری ترشەڵۆك.

**صَرِیح** ئاشکرا، ڕون، ڕوناك، بێ پەردە، پاك پاڵفتە، ڕاشکاو.

**صَرِید** سەرما، ساردی وسۆڵە.

**صَرى، صِرىَ** ئاوی ڕاوەستاوی ڕەنگ و بۆن گۆڕاو.

**صَطَرَ** نوسی.

**صَطر، صَطَر** نوسین.

**صَعَّار** خۆبەزل زان و لوت بەرزێك خەڵکی بەکەم سەیربکات.

●**صَعُبَ ١/علیه الأمرُ:** ناڕەحەت بوو.

●**صَعَّبَ ١/هُ:** ناڕەحەتی کرد.

**صَعب** هەرکارێکی ناڕەحەت و دژوارپێچەوانەی ئاسان، شێری بێشەو جەنگەڵ.

**صَعِدَ** بەرز بویەوە، بەرەو بڵندی چوو.

**صُعُد** خۆڵ، گۆڕ، ڕێگە (وشەکەجەمعە).

**صُعُدُ، صُعَداء** ناڕەحەتی وسەختی، پێچەوانەی ئاسانی.

**صُعُد** بەرزایی، بڵندایی.

**صَعَرَ** خوار بویەوە.

**صَعَّرَ** خواری کرد بەهۆی لوت بەرزیەوە.

**صَعَطَ** دەرمانی کردە لوتیەوە.

**صُعِفَ** لەرزی، لەرزی لێهات.

**صَعْفَة** لەرزین بەهۆی ترس یان سەرماوە.

**صَعِق** کەسێك بەهۆی بیستنی دەنگێکەوە لەهۆشی خۆی چوبێت.

●**صَعَقَ ١/تِ السماءُ:** هەورە بڕیسکەی لێدا.

**صَفَق** مردن، مەرگ،کۆچی دوایی، توندی دەنگ.

**صَعقة** پزیسکەی هەور، ئەو چەخماخەی لەئەنجامی بەریەك کەوتنی جەمسەرەکانی (سالب و موجەب) ی هەورەکانەوە دروست دەبێت.

**صَعِلَ** سەرو مل باریك و بچوك بوو.

**صَعل** گوێدرێژێك توکی لەشی لێ بوبێتەوە، مرۆڤی سەرومل بچوك، درێژ لەهەرشتێك.

**صَعُود** بەرەو بەرزی چوون، دژی دابەزین.

**صَعید** زەوی بەرزوبڵند، گۆڕ، خۆڵ، ڕێگە، ڕێ.

**صَغَّ** زۆری خوارد.

●**صَغا ١/ت النجوم** بەرەو ئاوابون لاربونەوە.

**صُغَار** بچوك، بچکۆلە، چکۆلە، بچۆڵە، بچکۆك، بچکەڵە، بچکەلانە، بچکۆلانە، گچکە، بیچك.

**صَغُرَ** بچکۆلانە بوو، کەم و بچکۆل بوو، دژی گەورە بوو.

●**صَغَّرَ ١/ه** بچوکی کرد، بەنرخ وبەهای کەم کردەوەو دایبەزاند.

**صِغرة** بچوکترین منداڵی دایك و باوکێك، دوایەمین منداڵی دایك وباوکێك.

**صِغَر** بچوکی، بچکۆلانەیی، گچکەیی.

**صِغو** لاپاڵی بیر.

**صَفواء** خۆرلەکاتی بەرەو ئاوابون چونیدا، هەتاو لەکاتێکدا بەرەو ئاوابون دەچێت.

**صَغیر** بچوك،بچکۆلە، چکۆلە، کەم تەمەن.

●**صَفَّ ١/القوم** ڕیزی کردن، یەك لەدوای یەك لەباری درێژی دانان.

**صَفّ** ڕیز، ڕیزی دەستە سەربازیان درەخت، پۆل، پۆلی کۆمەڵێك قوتابی لەیەك ئاستی خوێندندا.

**صَفَا** ساف وڕوناك بوو، پێچەوانەی لێڵ بوو.

**صَفّاح** بەخشندە، لێبوردە.

**صِفاد** ئەوشتەی دیلێك یان گرتویەکی پێ دەبەسترێتەوە وەك زنجیر یان پێوەبەندو کەلەپچە. هتد.

**صُفَار** کرمی ناوسك.

●**صَفّارة ١/** فیقەنە، دەستگایەکی بچکۆلانەی سادەیەو فوی پێدا دەکرێت ودەنگێکی ڕەقی لێدەر دەچێت.

۲/الإنذار: ئاژێری ورياكردنەوە، ئاژێری ڕاگەیاندنی مەترسی.

**صِــفَاق** پێــستی ژێــرەوەی سـك، ئــەو پێـستەی کەنەگـەر بـدرێت فتقــی لێ دروست دەبێت.

**صَــفَاء** ڕۆشــنیی، دۆســتی وهــاوەڵیی دڵسۆزانە.

●**صَــفَحَ** ۱/**الـشيءَ**: پـانی کـرد، پـانی کــردەوە. ۲/ه **بالـسيفِ**: لـەباری پـانی شمـشێرەکە پیایـدا کێـشا نـەك لـەباری تیژیەکەی.

●**صَــفح** ۱/لا، لاپـاڵ. ۲/**مــن الإنــسان**: ڕوخسار، دەم وچاو. ۳/**من السيف**: پانایی شمشێر نەك تیژاییەکەی. ٤/**من الوجه**: ڕومەت، گۆنا.

●**صَفَّحَ** ۱/**بيديه**: چەپڵەی لێدا.

**صُفْح** لـەپی هـەردوو دەسـت یـان پانـایی هەرشیتك، پانایی شمشێر.

●**صَــفحَة** ۱/لاپـەڕە. ۲/**الرجـل**: پانـایی سنگی پیاو.

●**صَــفَدَ** ۱/ه: بەناســن یــان لەئاســندا بەستیەوەو کۆتی کرد.

**صَفَد، صِفَاد** پێوەند، کەلەبچە.

**صُفِرَ** زەرداو لەسکیدا کۆبویەوە.

●**صَــفَّرَ** ۱/**للبهـائم**: فیکـەی بـۆ لێـدان، فیقەی بۆ کردن.

**صُفر** ئاڵتون، زێڕ، مسی زەرد.

**صِــفر** سـفر،خاڵێکە دەخرێتـە بـەردەم ژمارەکان وپلەی ژمارەکان دیـاری دەکـات بەڵام بۆ خۆی هیچ سەنگێکی نیە، هیچ.

**صفراء** ڕەنگ زەرد، ئاڵتون.

**صَفَر** برسـێتی، مـانگی دووەمـی سـاڵی (مـانگی) یـەو ژمـارەی ڕۆژەکـانی بیـست ونۆ ڕۆژە، ژیریی، ئاوەز.

**صُفرة** زەردیی، ڕەنگی زەرد.

●**صَفِرَ** ۱/**الإناءُ**: خاڵی بوو.

●**صَفَعَ** ۱/ه: زللەی لێدا،چەپازلەی لێـدا، شەقازلەی لێدا.

●**صَفَقَ** ۱/**الرجلُ**: ڕۆشت، چەپڵەی لێدا. ۲/**عينهُ**: چاوی داخست. ۳/**الطائرُ**: پـڕی کرد.

**صَفْق** لاپاڵ، ڕوی کێو وشاخ.

**صَفَق** کۆتایی دەماخ ومێشك.

●**صَفَّقَ** ۱/**الشرابَ**: لەدەفرێکەوە کردیە دەفرێکـی تـر بـۆ وەی ڕۆشـن بێتـەوە وپاڵفتەبێت.

**صَفقَة** دەست دان بەسەر دەستدا لەکاتی مامەڵەدا، بەستنی مامەڵە.

● **صفقا ٢/الفرس:** هەردوو ڕومەتی ئەسپ.

● **صَفَنَ ١/الفرسُ:** لەسەر سێ لاق ولاتەنیشتی سمی چوارەمی هەستایەوە.

**صَفن، صَفَن** تورەکە گون، تورەکەی هێلکەگون.

**صَفَنَة** تورەکە گون.

**صَفنة** هەگبەی شوان، کۆڵەپشتی شڤان هەرچی پێویست بێت تێی دەخات، توێشوی شوان.

**صَفوان** تەختەبەردی ساف.

**صَفواء** تەختەبەردی ساف وخز.

**صَفو، صُفُوَ** دڵسۆزی لەهاوەڵایەتی ودۆستایەتیدا، ڕۆشنی.

**صَفُوق** کێوی بڵند، کەژی بەرز، کەوانی نەرم.

**صِفوة** هاوڕێی دڵسۆز، ئاوێکی کەم، پاڵفتەو کرۆکی هەرشتێك.

**صُفَّة** خانویەکی هاوینەیەو بەپەلکی دارخورما سەری دەگیرێت، خانویەکە سەقفەکەی بریتیەلە پەلکی دارخورما.

**صِفَة** سیفەت، خەسڵەت.

**صَفِي** دۆستی دڵسۆز، هاوەڵی باش، ئەودەستکەوتەی شەڕکەسەرۆك بۆخۆی هەڵی دەبژێرێت ودەیبات.

**صَفِيَّة** وشترێك شیری زۆر بێت، دارخورمایەك بەری زۆر گرتبێت.

**صَفيح** ڕوی هەرشتێکی پان، ئاسمان.

**صَفير** فیکەفیقە، هەردەنگێك لەدەمەوە بەهۆی هەردو لێوەوە دەربچێت وخاڵی بێت لە(پیت).

**صَفيق** بێ ئابڕوو، بێ حەیا.

**صِفِّين** ئەو جێگەیەی کەتیایدا شەڕ ڕویدا لەنێوان سوپاکەی ئەمیری ئیمانداران عەلی کوڕی ئەبی تاڵب (کرم اللە وجە) وسوپای یاخی بوی شام بەسەرکردایەتی بنەماڵەی ئەمەویەکان کە(معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان) ڕابەرایەتی دەکردن.

**صَقَّار** کەسێك زۆر نەعلەت بکات لەکەسانێك کەشیاوی نەعلەتەکە نەبن، کافر، دۆشاو فرۆش، دۆشاو دروست کەر.

**صِقاع** ڕوبەندشتێکە لوتی وشتری پێ دەبەسترێت.

**صِقال** سك، ورگ، زگ.

**صِقَالَة** بریتیەلەو تەختە بەنیەی ئەندازیارەکان دروستی دەکەن بۆ وەی پیایدا سەربکەون بۆجێگە بەرزەکان، ئەسکەلە.

● **صَقَبَ ١/ه:** بۆکزی لێدا، بۆکسی لێدا، مشتەکۆڵەی لێدا. **٢/الشيءَ:** کۆی کردەوە.

**صَـقَب** لێـدان بـەبۆکس، بەمـشتەکۆڵە لێدان.

**صَقَب، صَقِب** نزیك، پێچەوانەی دوور.

**صَقَب** کۆڵەکەی هەرە درێـژ لەناوەڕاسـتی ماڵـدا، درێـژ لەهەرشـتێك، هەرشـتێکی درێژ.

**صَقَر** هـەڵۆ، باڵندەیـەکی ڕاویـەو ڕەنگـی مەیلەو ڕەشـە لەنێـچیر گرتنـدا بـەهێزە، ئەیلۆ، ئەیلوە، هەڵوو، شێری زۆرترش.

**صَقَّر** ناوێکی تری دۆزەخە.

**صُقَّر** درۆ، قسەی ناڕاست.

**صَقِر** خورمـا یـان مێوژێك لـەباربێت بـۆ وەی بکرێتە دۆشاو.

**صَقَرَة** ئاوێك لەحەوزدا بمێنێتەوە.

**صُـقرة** تێکـەڵاو بـونی ڕەنـگ سـەوز یـان ڕەشی باڵندە بەڕەنگی سور یان زەرد.

●**صَقَعَ ١/ه** کێشای بەسەری ئەودا. **٢/به الأرض** دای بەزەویـــــدا. **٢/الـــــديك** قوقاندی، خوێندی.

**صُقِعَ** سەرمای بوو.

●**صَـقَّعَ ١/الماء اوغيره** بەسـتی، بویـە سەهۆڵ، وەك سـەهۆڵی لێهات. **٢/لفلان** سوێندی بۆ خوارد لەسەرشتێك.

**صَقَع** کەمی موی سـەر، هـەڵوەرینی مـوی سەر.

**صَـقِع** کەسـێکی نادیـاری دوور، کەسـێك شوێنی نەزانرێت.

**صَقعة** ساردی وسەرمای زۆر تونـد.

**صقيع** سەهۆڵ بەندان.

●**صَقَلَ ١/ه بالعصا** لێیـدا، پیایدا کێشا.

**صَقِل** ئەسـپی کـەم گۆشـت، ئەسـپی لـەڕو لاواز.

**صَقِيل** شمشێر.

●**صَكَّ ١/ه** بەتونـدی لێیدا. **٢/الباب** دای خست، پێکیوەدا.

**صَك** چەکی بانکی، سەنەد.

**صَکَّاك** سەنەدنوس، چەك نوس.

●**صکَمَ ١/ه** لێیدا.

**صَـكَّة** قرچـەی نیـوەڕۆ، سـەخت تـرین گەرمای ناوەڕاستی ڕۆژ، گەرمی نیڤرۆ.

**صکيك** لاواز وسست، بێ توانا.

**صلا** ناوەڕاستی پشتی مرۆڤ وچوارپێ.

**صلابَة** ڕەقی، بێ ڕەحمی.

**صَلاَح** چاکە، چاکەکاری، دژی خراپە.

**صَلاحِيَّة** لەبارێتی، حاڵەتێکە تیایدا شت لەباروگونجاو دەبێت، تواناو دەستەڵات.

**صِلاع** گەرمی خۆر، گەرمی هەتاو.

**صِلاَء، صَـلا** ئاگریـان ئـاگری گـەورە، سوتەمەنی ئاگر.

●**صَلَّ ١/السمارُ** پیایدا کێشراو زۆری لێکرا تابچێت بەشتێکدا. **٢/السقاءُ** وشك بویەوە. **٣/اللحمُ** بۆگەنی کرد. **٤/الشرابُ** پاکژو پاڵفتەی کرد.

**صَلّ** بارانی کەم وپرژو بلاو.

**صِلّ** شمشێری برند، تمونەو وێنە، بەلا، مار یان ماری باریك وبچوك کە زۆر ژەهراوی وپیسن.

**صُلّ** گۆشت یان هەرشتێکی تری بۆگەن کردوو.

**صُلَّة** پاشماوەی ئاو، بۆنی ناخۆش.

**صَلّة** پێستەی بۆ گەن کردو، پێستەی وشکەوە بوو بەرلەخۆشەکردن، نەعل، کەوش، بارانی کەمی ئاوبەئاو، لێزمە بارانی بەربلاو.

●**صَلَبَ ١/هُ** لەداریدا، لەخاچیدا. **١/اللحمَ** برژاندی.

●**صَلَّبَ ١/المسیحيُّ** ئامازەی خاچی بەدەست لەسەرخۆی دانا.

**صَلُبَ** ڕەق بوو.

**صُلب** ستونی بربڕەی پشت، ئێسقانە درێژەکەی ناوە ڕاستی پشت کەپێك هاتوە لەبربڕەبالْندە.

●**صَلّب ١/الحجرَ** بەرزی کردەوە.

**صَلَب** هەرزەویەك ڕەق بوبێت وماوەیەك نەکێڵرابێت.

**صُلت** چەقۆی گەورە، کاردی گەورە.

**صِلت** دز.

**صَلت** نێوچاوانی پان، پیاوی ئازا، شمشێری برندە.

**صَلَج** ئەندامی نێرێتی، کێر.

●**صَلَجَ ١/الفضةَ** زیوی تواندەوە.

**صُلَّجَة** پارچەی ئاوریشم.

**صَلَحَ** چاك بوو، لەبار بوو،خراپی تێدا نەما.

●**صَلَّحَ ١/هُ** چاکی کرد، ڕاستی کردەوە،نوێی کردەوە.

**صُلح** ئاشتی، ئارامی، هێمنایەتی، ئاسودەیی، لای سیاسەتمەداران بریتیە لەهەڵگرتنی باری جەنگ لەسەر بنەمای چەند مەرجێکی دیاری کراو.

**صَلِخَ** کەڕ بوو، هەستی بیستنی نەما.

**صَلَخ** کەڕیی سەخت، گەڕیی.

●**صَلَدَ ١/الزندُ** چەخماخەو دەنگی لێوەهات وئاگری نەکردەوە.

**صَلُدَ** زۆر چاوچنۆك وبەخیل بوو.

**صَلد، صِلد** ئەسپێك عارەق نەکاتەوە، سەری بێ موو، پیاوی ڕژدو بەخیل وچاوچنۆك، زەویەك هیچی لێ نەڕوێت.

**صَلَّدَ** چاوچنۆك وبەخیل بوو.
**صَلِع** پێشەسەری قژی پێوە نەما، موی پێشەسەری هەڵوەری.
**صَلَع** هەڵوەرین وڕوتانەوەی تاڵە موەکانی پێشەوەی سەر بەجۆرێك پێشەسەر سفت و سوڵ بێت وقژی پێوە نەمێنێت وببریکێتەوە.
**صُلَّع** هەرجێگەیەك هیچی لێ نەڕوێت.
**صَلعاء** ژنێك مووی پێشەسەری ڕوتابێتەوە، سەختی وبەلاّو نارەحەتی.
**صَلَفَ** لاف وگەزافی لێدا.
**صَلِف** پیاوی لاف وگەزاف لێدەر، خۆراکی بێ چێژ، خواردنی بێ تام، دەفری قورس.
**صَلَف** خود پەسەندیی،لاف وگەزاف لێدان.
●**صَلَفَ ١/السحاب،** گرمەو بریسکەی زۆرو ئاو وبارانی کەم بوو.
●**صَلَقَ ١/الرجل،** لەکاتی نارەحەتی وتەنگانەدا دەنگی بەرزکردەوە، هاواری کرد. **٢/ه بالعصا،** لێیدا، پیایدا کێشا.
**صَلَق** زەوی تەخت.
**صَلق** هاواری سەخت ناڵەی بەرز.
**صِلقام** شێری بێشەوجەنگەڵ.

●**صَلقَعَ ١/**ئیفلاسی کرد، بویە موفلیس. **٢/رأسَهُ،** تاشی، چاکی کرد.
**صَلقَع** دەشتی بێ ئاو وگیا، دەشتی چۆڵ وهۆڵی بێ گژوگیاو ئاو.
**صلقم** پیری بەساڵا چووگ.
**صَلَمَ، صَلَّم** لەبێخەوە بڕی، لوت وگوێی لەبنەوە بڕی.
**صَلَم،صَلَمة** پیاو و ژنی دامەزراو وتوند.
**صَلمَعَ** ئیفلاسی کردو هەژارکەوت.
**صَلَّى** نوێژی کرد، درودی نارد.
●**صَلَى ١/اللحمَ،** برژاندی.
**صليب** خاچ، دوداری لەسەریەك دانراوە بەم شێوەیە(+).
**صليد** تاك، تەنها.
**صليف** خواردنی بێ تام وچێژ.
**صَليق** درەخشاوو تابان لەهەر شتێك.
**صَمّ** کەڕ بوو، هەستی بیستنی نەما.
**صِمّ** بەلاّی سەخت، شێری بێشەوجەنگەڵ.
**صُمّ** مرۆڤانی کەڕ، کەسانێك هەستی بیستنیان نەماوە. (وشەکە جەمعە).
**صُمَات** بێدەنگی، بێدەنگ بوون.
**صُمَاح** پیوی تەواوە دەخرێتە سەر قڵیشی قاچ بۆ چارەسەر، عارەقی بۆگەنی بۆن ناخۆش.

**صُماخ** بیری کەم ئاو، چاڵە ئاوێك کەمی ئاو تێدابێت.

**صِماخ** گوێی ناوەڕاست، ئەندامی بیستنی ناوەوە کەڕاستەو خۆ دەکەوێتە ناوسەرەوە.

**ضَماخة** ژنی زیرەك.

**صَمّاء** ژنی کەڕ، ئافرەتێك هەستی بیستنی نەمابێت.

**صَمَتَ** بێدەنگ بوو، لەقسەکردن وەستا.

●**صَمَّتَ** ١/ بێدەنگ بوو. ٢/هـ بێدەنگی کرد.

**صَمت** بێدەنگی، خامۆشی درێژخایەن.

**صَمَخَ** گەرمای سەخت مێشکی برد.

●**صَمَخَ** ١/هـ بەقامچی لێیدا.

**صَمَد** بەرز، گەورەو بەدەستەڵات، هەمیشە، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە، پیاوێك لەشەڕدا نەتینوی ببێت ونەبرسی، سەقامگیر.

●**صَمَدَ** ١/هـ بەگۆچان لێیدا.

**صَمد** هەرجێگەیەکی بەرزو بڵند.

●**صَمَّرَ** ١/المتاع: کۆی کردەوە.

**صَمر** بۆگەن.

●**صَمَرَ** ١/اللبن: ترشاو هیچ تامێکی شیرینی تێدانەما.

**صَمرَة** شیری ترشاو کەهیچ تامێکی شیرینی تێدا نەمابێت.

**صَمر، صَمَر** بۆنی بەدی گشت وماسی تازە.

●**صَمَعَ** ١/هـ بەگۆچان یان بەشمشێر لێیدا. ٢/الظبي: ڕۆشت بەزەوییدا.

**صَمِعَ** خۆبەسمر وبێباکانە ڕۆشت.

**صَمَعَ** ئازارو چاونەترس.

●**صَمِعَ** ١/في الكلام: هەڵەی کرد. ٢/ت الأذنة: گوێچکەی بچکۆلە بوو لکابوبەسەریەوە.

**صَمعاء** ئافرەتێك گوێچکەی بچکۆلەبێت ولکابێت بەسەریەوە.

●**صَمَّغَ** ١/الشيء: کەتیرەی تێکردبەکەتیرە لکاندی.

**صَمغ، صَمَغ** کەتیرە، جۆرەشیلەیەکە لەدرەختی تایبەت دێتەدەرو بۆ چەسپاندن و لکاندنی دوشت پێکەوە زۆر لەبارە.

**صَمَقَة** شیری خراپ بوو، شیرێك خراپ بوبێت وچیتر بۆ خواردن دەست نەدات.

●**صَمقَرَ** ١/اللبن: ڕادەی ترشاویەکەی زیادی کرد.

**●صَمَلَ ١/الشيءُ:** رەق بوو، وشك بوو. **٢/الرجلُ عن الطعام:** دەستی لەخواردن هەلگرت. **٣/ەُ بالعصا:** لێیدا.

**صِمَّة** پیاوی ئازاو چاونەترس، شێری بێشەوجەنگەڵ، ماری نێر، زیرکی مێچکە.

**●صَمَی ١/الصيدُ:** بەبەرچاوتەوە مرد.

**صميان** پیاوی ئازاو چاونەترس.

**صميم** پاڵفتە ونەسڵی.

**صِنّ** مێزی ئاژەڵێکە پێ دەڵێن (وبر) کەزۆر بۆگەنە.

**صَنَّة** بۆنی میز.

**صَنّ** زەمیلەی گەورە.

**صِنَّة** بۆنی بن باڵ، بۆنی ناخۆش بەگشتی.

**صَنَاجة** شەوی ڕوناک، مانگاشەو، شەوێك مانگ تیایدا دنیا ڕوناك بکاتەوە.

**صَنَادیدُ** بەلاو نارەحەتیەکان، کۆمەڵی سەرواز ولەشکر.

**صنار** درەختی چنار.

**صِنَارة** پارچە ئاسنێکی چەماوەی بچوکە بەسەری تەشی یەوە، قولاپی ماسی گرتن.

**صِنا** خۆڵەمێش.

**صناعة، صَناعَة** پیشە، پیشەسازی.

**صَنَاعة** پارچە تەختەیەکە دەخرێتە نێو ڕێڕەوی ئاوەوە تاکو بۆ ماوەیەك ئاوەکە بوەستێنێت.

**صُنَان** بۆنی ناخۆش.

**صَنَان** پیاوی ئازاو نەترس، دلێر، دلاوەر، چابوك.

**صَنج** دووپارچە تەختە مسەدەکێشرێت بەیەکدا ودەنگی لێوە دێت بۆ کاروباری سوپاو هەندێك شتی تر بەکاردێت.

**●صَنَجَ ١/ەُ بالعصا:** بەگۆچان لێیدا.

**صَنَّجَ ١/بِهِ:** دای بەزەویدا، دای بەئەرزدا.

**●صَنلقَ ١/البضاعة:** خستیە سندوقەوە.

**صَندَل** جۆرە درەختێکی بەرگەمز هندیەو تەختەکەی بۆنێکی زۆرخۆشی هەیە.

**صُندوق** سندوق، سنوق، جانتای دارینی زل بۆ کەل وپەلی ناومال.

**●صندوق ١/البريد:** سندوقی پۆست.

**صُندوقة** سندوقی گچکە، سندوقچە.

**صِندید** گەورە وبەدەستەلاتی ئازاو بوێر، بای توند، سەرمای سەخت، بارانێك دنکۆڵەو تنۆکەکانی گەورەو زەلام بن.

**صَنَعَ** دروستی کرد، چاکی کرد.

**صِنع** پۆشاك، شاشك، حەوز.
**صَنعَة** كارو پيشه، هونەرلەكاردا.
**صُنع** كار، چاكە، ڕۆزی.
● **صَنَعَ ١/اليدين،** دەست ڕەنگين، پياوێك زۆر لێزان ودەست ڕەنگين بێت لەكاردا.
● **صَنَّفَ ١/الشيء،** ڕێكوپێكی كرد، جۆری كرد، دەستەبەندی كرد، پۆلێنی كرد. **٢/الكتاب،** پەڕاوی داناو ڕێكوپێكی كرد، بەش بەشی كرد.
**صِنف** جۆری هەرشتێكە، خەسڵەت.
**صَنف** دەستەو گرۆه، جۆرو بەش.
**صَنَق** بۆنی ناخۆشی لێهات.
**صَنَق** تيژی وتوندی بۆنی بن باڵ.
**صَنَق** بۆگەن.
**صَنَقَة** بۆگەنێك كەزۆر بۆنەكەی ناخۆش بێت.
**صَنَم** بت، خودای دەستكردی لەبەرد تاشراوی هاوبەش پەرستان، هەرچی شتێك لەبری خوای گەورەیان شان بەشانی وی بپەرسترێت.
**صَنَمَة** سەختی وبەلا، ناڕەحەتی ودەردەسەریی.
**صَنو** برای باوكی ودايكی، برای لەباوك و دايكەوە، وەچەی نێرينەی پياو.
**صَنوة** خوشكی باوكی ودايكی، خوشكی لەباوك ودايكەوە، كچ، وەچەی مێينەی پياو.
**صُنو** ئەگەر دوو خەڵفە درەختی خورما يان زياتر لەسەريەك ڕيشەو بنچينە دەربێن ئەوا بەهەريەكێك لەو ئەمامەتازە دەرهاتوانە دەگوترێت، (صِنو).
**صنوبر** سنەوبەر، درەختێكی هەميشە سەوزە، دارێكی گەلا دەرزيە بەرێكی لەبيچمی دڵی مرۆ دەگرێ.
**صَنيع** چاكەكاری، خۆراك وچێشت، دروستكراوی، تير.
**صَنيعَة** چاكەكاری.
**صَواب** دژی هەڵە، شايستە، شياو، ڕاستی وڕاست، خەڵكی بەگشتی بەواتای ئەقڵ وئاوەز وەكاری دێنن.
**صُواح** ئارەقی ئەسپ، شكۆفەی خورما، شيرێك ئاوی زياتربێت.
**صُوار** بۆنی خۆش، دەفری ميسك.
**صوارد** بای سارد.
**صَوّاغ** درۆزنێك قسەو درۆكانی خۆی ئارايشت بدات، درۆزن.
**صَوّاف** خوری فرۆش، بازرگانی پارچە قوماشی لەخوری دروستكراو.

● **صَوَام ١/مـن الأراضـي**: زەویـەکی وشـك کەهیچ ئاوی تێدا نەبێت.
**صَوّام** کەسێك زۆر بـەڕۆژوبێت، کەسێك زۆری حەز لەڕۆژوبێت و ڕۆژوگربێت.
**صَوب** پێچەوانەی هەڵە، ڕاست.
**صَوْتَ** دەنگیدا، ڕەنیدا.
**صَنوت** هـەرجۆرە دەنگێکـی وەك گـۆرانی وئاواز، دەنگی ئاژەڵان بەگشتی.
**صَوت، صات، صِـیت، صِـیتَة** دەنگـۆ، دەنگۆی باش.
**صُوّة** زەوی بڵند.
**صَوتي** دەنگدار.
● **صَـوَّحَ ١/**وشـك بـوو. **٢/تـە الـشمس اوالریح**: وشکی کردەوە.
**صَوح** دامێنی چیا، بنکی شاخ.
**صُـودیوم** سـۆد یـۆم، مادەیـەکی سـاکاری ڕەنـگ سـپی زیویـە، کاریگەریـەکی زۆر بـەهێزی کیمیـاوی هەیـە، لەتێکەڵـەکانی خـوێی چێـشت و(کـاربۆ نـاتی سـۆدیۆم) کەلـەبواری مـادە پـاك کەرەوەکانـدا بەکاردەهێنرێت هەروەها (بیکـار بۆنـاتی سۆدیۆم ونیتراتی سۆدیۆم) یـش کەئـەمی دوەمیان پەینێکی بـەناو بانگە تێکەڵـەی ئەو مادەن.
● **صَوَّرَ ١/ە** وێنەی کردو شێوەی بۆدانا.
**صَوَر** درەختی خورمای بچکۆلە.
**صُـور** شـاخێکی چـەماوەیە فـوی پێـدا دەکرێت ودەنگ دەردەکات.
**صَوَر** لاریی،خواریی، چەماوەیی، نارێکی.
**صَورة** خورانی سەر، ئاڵۆشی سەر.
**صُـورة** شـێوە، وێنە،خەسـڵەت، جـۆر، هەرچیەك وێنە بگرێت.
**صُـــوص** ناچـــیزە، چاوچـــنۆك کەبەپەنامـەکی نـان دەخـوات بـۆ وەی میـوان نـەی بێنێت،جوجەڵـەی مریـشك لەسـاتەوەختی دەرچـونیدا لەهێلکـە، جوچکەمریـشکی تـازە سـەرلەهێلکە جوقاو.
● **صَـوَّعَ ١/الـشيء**: نوکەکـەیی تیـژکرد. **٢/تـ الریح النبات**: کردی بەبادا.
**صُوع** پێوەر.
**صُـوف** خـوریی، پارچـەی لـەخوری دروستکراو، هری، کوڵکەی پەز.
● **صَوَّفَ ١/ە** کردیە سۆفی.
**صُـوفي** نیـسبەت دراو بـەلای(صـوف)دا، کوڵکی، سۆفی، کەسێك پـەیرەوی ڕێبـازی تەسەوف بکات.
**صوفیّة** پەیرەوانی ڕێبازی تەسەوف.
**صَوقَر** تەوەری گەورە، بیور، بەڵتە.

**صُــوق وسُــوق** بــازاڕ، شـوێنی سـەوداو مامەڵە، سوك.

●**صَوَّل ١/الشيءَ:** خاوێنی کردەوە،پاکژی کردەوە.

**صَــولَة** گــەورەیی، توانــاداریی، شــاڵاو لەجەنگدا.

●**صَوَّمَ ١/ه** ڕۆژوی پێگرت.

**صَوم** ڕۆژوو، خۆگرتنەوە لەجیماعکردن، نەخواردنی نان وئاو وهەرجۆرە خواردن وخواردنەوەیــەکی ترلــە کــاتی دیــاری کراوی بەڕۆژو بوندا.

●**صَوَمُ ١/النعام:** پاشەڕۆی وشترمر.

●**صَومَعَ ١/الشيءَ:** کۆی کردەوە. ٢/**البناءَ:** بەرزی کردەوە.

**صَــومَع** دێــر، شــاخ یــان هــەر جێگەیــەکی بــەرزە کەقەشــەتیایدا بەمەبەســتی تــاك بونــەوە بــۆ خواپەرســتی دادەنیــشێت، پەرستگای گاورەکان.

●**صَــومَلَ ١/الرجـلُ:** لەبــەر برســێتی پێستی وشکەوە بوو.

**صَون** ئاگاداری لێکردن، پاراستن.

**صُهال، صَــهيل** حیلــەی ئەســپ، دەنگــی ئەسپ.

●**صَهَبَ ١/شعرهُ** ڕەنگی قژی سور بوو.

**صَهَب** سوری یان سوروسپێتی موو.

**صــهباء** شــەرابی تــرێ، ئــاوی گوشــراوی ترێ.

**صُهبَة** سوری وسپێتی.

●**صَهَدَ ١/ته الشمسُ:** خۆر سوتاندی.

**صــهدان** تاوســەندنی گــەرما، قرچــەی گەرما.

●**صَــهَرَ ١/الـشيءَ:** تواندیــەوە، بــەپیوی تواوە چەوری کردنزیکی کردەوە.

**صَهر** گەرم لەهەرشتێك.

**صِهر** خزمایەتی، مێردی خوشك یان کچ، زاوا.

**صِهرة** دایکی ژن، خەسوو.

**صِــهريج** حــەوزی گــەورە، تەنکــەری گواستنەوەی ئاو ونەوت وشلەمەنیەکانی تر.

●**صَهَلَ ١/الفرسُ:** حیلانــدی، حیلــەحیلی کرد.

**صَهَل** تیژی وتوندی دەنگ.

**صَــهوَة** سەرپشتی ئەسـپ، بورج لەســەر لوتکەی کێو، زەویەکی تەخت ئــاوی تێدا کۆببێتەوە.

**صَهی** پیربوو، بەساڵدا چوو.

**صَهيد** قرچەی گەرما، گەرمای سوتێنەر.

**صَهير** تواوە، هەرچی شتێك توابێتەوە.

**صُیّاب، صُیّابَة** پاڵفتەی بیٚ تێکەڵە، هەڵبژاردە لەهەرشتێك.

**صَیّابَة** سەرۆکی دەستە، سەردەستە.

**صَیّاح** زۆر هاوارکەر، زۆر ناڵەکێش.

**صَیّاد** ڕاوچی، ڕاوکەر، ماسیگر، نێچیرڤان، شێری بێشەوجەنگەڵ.

**صیاغَة** زەرگەری، ئاڵتون چێتی، زەڕەنگەر.

**صِیام** ڕۆژوو، بەڕۆژوبوون، ڕۆژووگرتن.

**صِیانَة** پاراستن وئاگاداری.

**صَیت** ناوبانگ، ناوداریی، ناوی چاك.

**صیت** شۆرەت، ناوبانگ، ناوبانگی باش لەناوخەڵکدا.

**صَیحَة** هاوار، ئەشکەنجە، ئازار.

**صَید** ڕاو، شکار، داو.

**صَیَد** ملی لاربوو.

**صَیدان** ئاڵتون، نوقرە، مس.

**صَیدلَة** فرۆشتنی عەتر ودەرمان، دەرمانسازی، دەرماناسی.

**صَیدَلِيّ** دەرمانفرۆش، دەرمانشوناس.

**صَیدلِیّة** دەرمانخانە، شوێنی دەرمان فرۆشتن.

● **صَیّرَ ٨/ه** گۆڕی، لەبارێکەوە گۆڕی بۆ بارێکی تر، لەشێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر.

**صَیّر** گۆڕ، ئارامگا، گڵکۆ، قەور، کۆمەڵ، دەستە.

**صِیر** درزی درگا، ماسی ساردین، حاخامی جولەکە.

**صَیِّر** چارەنوس وکۆتایی کار، بەرەنجامی کار.

**صَیع** پەراکەندە.

**صَیِّغ** درۆزنێك درۆکانی ئاراشیت بکات وبیان ڕازێنێتەوە.

**صیغَة** جۆر، قاڵب،خشڵی لەزیوو زێڕ دروستکراو.

**صَیف** هاوین، تاوسان، هامن، هاڤین، یەکێکە لەچوار وەرزەکەی ساڵ ولە(٦/٢١) ی هەموو ساڵێك دەست پێ دەکات ولە(٩/٢١) کۆتایی دێت وتیایدا گەرما تاودەسێنێت.

● **صَیّفَ ٨/المکان** هاوین تیایدا مایەوە.

**صَیِّف** گژوگیایەك بەهاویندا دەردێت.

**صَیِّفَة** بارانی لەهاویندا باراو.

**صَیفی** بەروبومێك لەهاویندا بچنرێتەوە وەك ترێ وهەنجیرو. هتدبەرو بومی هاوینە.

**صَیِّفَة** پەزێك خوری زۆربێت.

**صِیق** ئارەقی لەش، بۆنی ناخۆش، دەنگ وهاوار، چۆڵەکە، چێشکە، پاساری.

**صَــیقَل** تیزکــەری شمــشێر،کەسێك دەمەزەردی شمشێربکاتەوە.

**صَیلَم** کـاری نارەحەت،بـەڵای گـەورە، شمـشێر، یـەکجار نـان خـواردن لەشـەوو رۆژێکدا.

**صِیّن** چین، وڵاتێکی ئاساییەو ژمـارەی دانیشتوانەکەی لەدووملیارکەس تێپـەڕی کردوە لەڕوی دیموگرافیەوە پلەی یەکـەم وڵاتی جیهان داگیردەکات.

**صِیّنیّة** سـینی، دەفرێکـی پانکەلەیـە خۆراکی لەسەردادەنرێت، چینی، هەرچی شـتێك نیـسبەتی بـدرێت بـەلای وڵاتـی چیندا.

**ضَئِيل** بچوك، چكۆله، لاوازوسيس، كەم وبێ ئەرزش، بێ قەدر.

**ضائِع** ون، بزر، گوم.

**ضائِق** تەسك، تەنگ، پێچەوانەی فراوان.

**ضائِقَة** پەرێشانی، تەنگانە.

**ضائِم** ستەمكار، زاڵم.

**ضائِن** لاواز، پیاوی كەم خۆر.

**ضَابِط** ئەفسەر، بەهێز، شێری بێشەوجەنگەڵ، فەرماندەوكاربەدەست، ڕێكخەر، خۆڕاگر،

●**ضَاجَ ١/الوادي:** فراوان بوو، پێچەوانەی تەسك بویەوە.

**ضَاجِع** پیاوی تەمەڵوتەوەزەل، پیاوی كەمژەی گێل كەنەتوانێت لەجێگەی خۆی بەرزبێتەوە، ئاژەڵێك خێری تێدا نەبێت، ئەستێرەیەك بەرەوئاوابوون لاربوبێتەوە.

**ضَاحِك** پیاوی دەم بەخەندە، بەردی زۆرسپی لەشاخدا دەربكەوێت.

**ضَاحِكَة** هەرددانێك لەكاتی پێكەنیندا دەربكەوێت.

●**ضَاحى ١/الرجلَ:** لەچێشتەنگاودا هات بۆلای.

**ضَاحِيَة** لاپاڵی حەوز، گەڕەك لەشاردا، ئاشكراولەبەرچاو، ئەولاتەنیشتەی هەرشتێك كەبەبەرچاوەوەیە.

●**ضَادَّ ١/ه:** پێچەوانەی كرد، پێچەوانەی جولایەوە، دژیجولایەوە.

**ضَارّ** زیانبەخش، زەرەرومەند.

**ضَارِي** درندە، وەحشی.

●**ضَارَّ ١/ه:** زیانی پێگەیاند، زەرەری لێدا.

**ضَارِب** لێدەر، شەوی تاریك، هەرجێگەیەك پڕدرەخت.

●**ضَارَحَ ١/ه** لێی نزیك كەوتەوەوچوەبەرانبەری.

●**ضَارَعَ ١/ت الشمس:** نزیك كەوتەوە لەئاوابوون.

**ضَارِع** لاواز، چەق وزەعیف، كەم گۆشت، بچوك لەهەرشتێك.

●**ضَاحَ ١/اللبن:** تێكەڵی ئاوی كرد.

**ضَاسَ** چێشتی خوارد.

**ضَاطَ** چەناكەی لاربوو، چەناكەی خواربوو.

●**ضَاعَ ١/** ون بوو، بزربوو، گوم بوو، سەرگەردان بوو، لەناوچوو. **٢/ه** بزواندی، جوڵانی وخرۆشاندی،

ترسـاندى. ٢/المسك: بـۆن وبـەرامى بلاوبويەوە.

●ضـاعَفَ ١/هـ كرديـه دووبەرامبـەر، كرديه دوو چەندان، كرديه دووقات.

ضاغِط چاودێر، ئەميندار لەسەرشتێك، فشار هێنەر.

●ضـاغَطَ ١/هـ توشـى نارەحـەتى كـرد، فشارى خستە سەر، گوشارى خستە سەر.

ضاغِن ئەسپێك بەلێدان نەبێت نـەڕوات بـەڕێوە، هەركەسـێكى ڕقـاوى وكينـە لەدڵ.

●ضَـافَ ١/ت الـشمس: بـەرەوئاوابون لاربويـــەوە. ٢/هـ بويـــەميوانى، داواى ميوانـدارى لێكـرد. ٣/الرجـل: ترسـا، سڵەميەوە.

ضاقَ هاتەوە يەك، تەسك بويەوە.

ضـالّ تاوانكـار، سـەرگەردان، گـومڕا، هەڵگەڕاوەوياخى، ئاوارە.

●ضَـالَّة وون بـووگ پێغەمبـەرى مـەزن دەفەرمێت: ( الحكمةضالة المؤمن- دانايى وحيكمەت وون بوى باوەڕدارە).

●ضَـامَ ١/هـ سـتەمى لێكـرد، زوڵمـى لێكرد.

ضامِر لاواز، كەم گۆشت، چەق ولەڕ.

ضامِن كەفيل، كەسێك ئـەركى پاراسـتنى شتێكى لـە ئەسـتۆ گرتبێـت، بەرپرسـيار، بيمەدەر، دابينكەر.

ضَـانَ منـداڵى زۆرى بـوو، ژمـارەى منداڵەكانى زيادى كرد.

ضَاوِى پياوێك بەشەو بگەڕێت.

ضَاوِيّ سست ولاواز، لەش باريك بەهۆى لاوازيەوە يان بەهۆى سروشتى خۆيەوە.

ضـايَقَ سـەختگيرى كـرد، بـەدڕەفتارى كرد، تەنگى هەڵچنى.

●ضاءَ ١/ڕوناك بويـەوە، ڕۆشـن بويـەوە. ٢/ضَوءً، ضياءً: درەخشايەوە.

ضَـأدَ توشـى هەلامـەت بـوو، توشـى ئەلامەت بوو.

ضَأُلَ لاواز بوو، بچوك بويەوە.

ضَأَلَة لاوازى لەڕ.

●ضَأَنَ ١/الضأن: جياى كردەوە لەبزن.

ضَأن پەز، مەڕ، مەە، مەها، مێ.

ضَبَّ بێـدەنگ بـوو، لەقسەكردن ودەنـگ لێهاتن ڕاوەستا.

ضَبَ، ضِب بوغزوكينە، ڕق لەدڵدا.

ضَـبّ نەخۆشـيەكە لەلـچدا دەبێتـەهۆى خوێن لێتكانى.

ضَبّ گياندارێكـە لـە گروپـى خـشۆكەكان لـەڕوى لەشـەوە وەك شـەوگەردو قۆڕيـە

ورەنگی خۆی دەگۆرێت بەگوێرەی ئەو ژینگەیەی تیایدادەژی وکلکی گرێی زۆری تێدایە، سوسمار.

●**ضَبَأَ ١/الرجلُ:** لکابەزەویەوە، فنگی داسەپاندبەئەرزدا. **٢/ه بالأرضِ:** لکاندی بەزەویەوە. **٣/الصائدُ:** بەفێڵ خۆی حەشاردا. **٤/الیه:** پەنای بۆبرد. **٥/منه:** شەرمی کرد.

**ضَبَابَة** هەورێکە زەوی دادەپۆشێت، تەم، هەڵم.

**ضُبَاث** چنگاڵی شێر.

**ضَبَاث** شێری بێشەوجەنگەڵ.

**ضَبَث** توندگرتن.

**ضِبح** خۆڵەمێش، خۆڵەکەوە.

●**ضَبَّرَ/١الشیءَ:** کۆی کردەوە.

**ضَبْر** هەژاری، دەست کورتی وکەم دەرامەتی، نەداریی.

**ضِبْر** بن باڵ، جومگەی پێکەوە لچکانی باڵبەشانەوە، بن هەنگڵ، بن باخەڵ، بن کەوش.

●**ضَبَطَ ١/ه:** بەچاکی پاراستی. **٢/العملَ:** رێکوپێکی کرد.

**ضَبِطَ** بەهەردوو دەستی کاری کرد.

●**ضَبْط ١/**راگرتن وبەستنەوەی شت، رێکوپێککردنی کاروبار، جڵەوگرتنی مەسەلەو رەوشەکان، رێکهێنان‌ودابین کردن. **٢/النفس:** دان بەخۆداگرتن، ئارام گرتن، کۆنترۆڵی خۆکردن لەهەندێك مەسەلەداکەزیاتر مرۆڤ توشی هەڵچون دەکات.

●**ضَبَعَ ١/البعیرُ:** پەلەی کرد، خێرای کرد لەرۆشتندا ودەستەکانی درێژکرد. **٢/القومُ:** ئارەزویان لەسوڵح بوو. **٣/ه:** دەستی درێژکرد بۆ لێدانی. **٤/الرجلَ:** ستەمی کرد، زوڵمی کرد، بێدادی لێ وەشایەوە.

**ضَبُع** ساڵی بێ باران، وشکەساڵ.

**ضَبْع** کەمتیار، فەمتار، ئاژەڵێکی گۆشت خۆری درندەیە، بنباڵ، باڵ.

**ضِبْن** کەلەکە، خالیگە، برك.

**ضَبْن** ئاوێکی کەم، ئاوی کەم.

**ضَبْن** بارهەلگرتن لەسەرخاڵیگە (کەلەکە).

●**ضَبَنَ ١/المکانُ:** هاتەوەیەك، تەسك بویەوە.

**ضِبنَة** ماڵومنداڵی پیاو، هاوسەری پیاو.

**ضَبُور** شێری بێشەوجەنگەڵ.

**ضَبَّة** سوسماری مێچکە.

**ضَجَّ** هاواری کرد لەتاوشتێك کەلێی ترسا، شڵەژا.

**ضَجَّاج** كەسێك زۆربقیژێنێت وهاواربكات، ژاوەژاوكەر، پەشۆكاو.

**ضَجَاج** ددانی فیل، عاج.

●**ضَجِرَ ١/منه وبه:** نیگەران ودوودڵ بوو، نارەحەت وقەڵس بوو، بەهۆی خەم وخەفەتەوەدڵتەنگ بوو.

**ضَجَر** دلگرانی ونیگەرانی و دوودڵی بەهۆی خەم وخەفەتەوە.

**ضَجِر** تەسك وتروسك، هەرجێگەیەكی تەنگ.

**ضَجَعَ ١/**پاڵكەوت، هەلاژیا، ڕاكشا. ٢/**النجم:** بەرەوئاوابون لاربویەوە.

●**ضَجَّعَ ١/في الأمر:** تەمبەڵی تێداكرد وهەڵنەستا بەجێبەجێ كردنی. ٢/**ت الشمس:** بەرەوئاوابوون لاربویەوە.

**ضَجِع** ئارەزوو، حەزوهیوا.

**ضَجِعَة** تەمبەڵی وتەوەزەلی.

**ضُجَعَة** تەمبەڵ، تەوەزەل، تەمەڵ، قنگ قورس.

**ضَجِمَ** دەمی یان ملی لاربویەوە.

**ضَجَم** لاری دەم، كەچی وخواری دەم.

**ضَجُوج** وشتری مێینەی قیژەهوڕكەرلەكاتی دۆشین وباركردندا.

**ضَجَّة، ضَجِيج** هاواروناڵە، قیژەهوڕ، ژاوەژاو، شڵەژان.

**ضَجِيج** تەنگ وچەڵەمەو دەردەسەری وترس.

**ضِح** خۆر، هەتاو، تیشكی خۆر.

●**ضَحَا ١/الشيء:** خۆری بەركەوت، خۆرلێیدا. ٢/**الطريق:** دەركەوت وئاشكرابوو.

**ضَحَّاك** كەسێك زۆر پێ بكەنێت، ناوەڕاستی ڕێگە.

●**ضَحِكَ ١/**پێكەنی. ٢/**الطريق:** ئاشكرا بوو.

**ضَحْك** پێكەنین، بەور، بەفر، كەرێ، نفیشك، هەنگوین، ددانی سپی، ناوەڕاستی ڕێگە.

**ضِحك** شۆخی، سوعبەت.

**ضَحْك** سەرسامی.

**ضُحُك** ناوەڕاستی ڕێگە ( وشەكە جەمعە ).

**ضُحُكَة** كەسێك زۆر پێ بكەنێت.

**ضُحى** چێشتنگاو، گزنگ.

**ضَحَى** خۆر، هەتاو، كاتێك خۆرهەڵدێت، چێشتەنگاو، گزنگ.

**ضَحَّى** قوربانی كرد، سەری بڕی.

**ضَحِيَّة** قوربانی، هەرگیاندارێك كرابێتە قوربانی، كەسێك تاوانێك لەدژی كرابێت وستەمی دەرهەق كرابێت.

● **ضَخَّ ١/الماءَ** رژاندی، ئاوی بەگوژم هەڵدا. **٢/ت العینَ** فرمێسکی ڕشت.
**ضُخام** گەورەوزل لەهەرشتێك، هەڵی هێنا.
**ضَخامَة** زلی وگەورەیی لەش.
**ضَخُمَ** قەڵەووزل بوو.
**ضَخم** ڕێگەی فراوان، گەورە، زل، قەڵەو.
**ضَدَّ** پڕی کرد.
**ضِدّ** دژ، دوژمن، دژمن، هاوتا.
**ضَدِید** دژ، هاوتا.
● **ضَرَّ ٢/فلاناوبفلانٍ** زیانی لێدا، زەرەری لێ خست.
**ضُرَّ** کوێربوو، بینایی لەچاویدا نەما.
**ضَرّ، ضُرّ** زیان، زەرەر، پێچەوانەی سود، بەدحاڵی.
**ضَرّاط** ترکەر، زۆرترکەر، ترن.
**ضُرّاك** شێری بێشەو جەنگەڵ.
**ضِرام** زەوی پان وپۆڕ، هارپراوی تەختەودار.
**ضَرّاء** بەدبەختی، نارەحەتی و تەنگانە، ڕۆژگاری نارەحەت.
● **ضَرَبَ ١/** ژمارەی لێکدا، کرداری لێکدانی ژمارەکانی جێبەجێ کرد. **٢/ه** لێیدا، پیای داکێشا. **٣/ت العقربُ** پێوەی دا. **٤/الشيءُ** جولا، بزوا، بزوت. **٥/في الماءِ** مەلەی کرد. **٦/بیدهِ** ئاماژەیدا. **٧/الجرحُ** ئازارەکەی زیادی کرد. **٨/في البوقِ** فوی پێدا کرد. **٩/الخیمةَ** هەڵیداو دای چەقاند. **١٠/اللیلُ** درێژبویەوە، درێژەی کێشا. **١١/الصلاةَ** نوێژی‌کرد، نوێژی دابەست. **١٢/الزمانُ** گوزەری‌کرد، تێپەری، ڕابورد. **١٣/الجزیةَ علیهم** سەرانەی لەسەردانان. **١٤/بیتهمْ** ئاژاوەوپشێوی خستە ناویانەوە. **١٥/الدهرُبیننا** لێکی جیاکردینەوە. **١٦/الباب** دای لەدەرگا، لەدەرگای دا. **١٧/النقودَ** سکەی لێدا. **١٨/بالمدفعِ** بەتۆپ بۆردومانی کرد. **١٩/عُنقَهُ** دای لەملی، سەری بڕی. **٢٠/عنهُ صفحاً** چاوپۆشی لێکرد. **٢١/في الأرضِ** بەدوی ڕۆزیدا زەمینی تەی کرد. **٢٢/المثلَ** نمونەی هاوردەوە، نمونەی هێنایەوە.
**ضَرب** لێدان، هاووێنەوهاوشێوە، هاوتا، چالاك، تەنگ وتەسك وتروسك لەهەرشتێك، لێکدانی ژمارەکان، هەنگوینی سپی خەست.
**ضَرِب** ڕێگەی دوور، ڕێڕەوی ئاو.
● **ضَرَّبَ ١/الشيءَ بالشيءِ** تێکەڵاوی کرد، ئاوێتەی کرد. **٢/ه في العربیهِ** هانیدا.

●**ضَرَجَ ١/الثوبَ بالدم:** كراسەکەی دا لەخوێنەوە. ٢/**الشيء:** لەتی کرد.
●**ضَرَّجَ ١/هُ:** چڵکنی کرد، پیسی کرد.
●**ضَرَحَ ١/الشيءَ:** لەتی کرد، گۆڕی هەڵکەند.
**ضَرَح** پیاوی خراپەکار.
**ضَرْح** پێست، پێستە، تەنیایی ودووریی.
**ضَرَر** زیان، زەرەر، پێچەوانەی سودوقازانج، بەدحاڵی.
●**ضَرَسَ ١/الشيءَ:** بەکاکیلەکانی بەتوندی گەستی.
**ضِرْس** ددان، کاکیلە، بارانێکی کەم.
**ضَرِس** کەسێك لە برساندا تورە ببێت.
**ضَرَطَ** تڕی لێدا، تڕی کەند.
**ضَرِطَ** ڕیشی کەم وبرۆی باریك بوویەوە.
**ضَرطاء** ژنی برۆ باریك.
●**ضَرَعَ ١/من الشيء:** لێی نزیك کەوتەوە. ٢/**ت الشمس:** ئاوابوو یان نزیك کەوتەوە لەئاوابوون.
**ضَرْع** گوان، جێگەی شیری ئاژەڵی شیردەروەك مەمك وایە لەژندا.
**ضِرع** هاوشێوە وهاووەك.
**ضَرَع** لاواز، سست، بێتوانا، ترسنۆك.
**ضَرُعَ** لاوازبوو، کەم تواناوسست بوو.
**ضَرِمَ** برسێتی یان تورەییەکەی زیادی کرد، زۆربرسیی بوو.
**ضَرِم** برسیی، پێچەوانەی تێر.
**ضَرَم** توێتەڵاشەدار کەتورەدرێتە ناو ئاگرەوە، برسێتی سەخت.
●**ضَرِمَ ١/ت النار:** هەڵیگیرسا.
**ضَرَمَة** ئاگر، پشکۆ، سکڵ.
**ضِرو** سەگی ڕاو، سەگێك ڕاوی پێ بکرێت.
**ضَرُورة** پێویستی، بەناچار، زەروری.
**ضَرُوريّ** پێویستی، هەرچیەك مرۆڤ تیایدا ناچاربێت وخواست وئارەزوی وەرگرتن ووازلێ هێنانی نەبێت.
**ضَروريّات** پێداویستیە سەرەکیەکانی ژیان.
●**ضَرَّة ١/المرأة:** هەوێی ژن، ژنی سەربەهەوێ شوی کردبێ. ٢/گوان وسەری گوانی وشتری مێ. ٣/ماڵو سامانی زۆر. ٤/ بنجی مەمکە، بناغەی مەمك.
**ضَرِيَ** ئارەزومەندبوو.
**ضَرِيب** سەهۆڵ، بەفر، شیری زۆرترش، شێوەووێنە.

**ضــریبة** سروشــت وخــوو، جێگــەزامی شمشێرلەلەشدا، لێدراوبەشمشێر، تیژایی شمشێر، پارچەیەك خوری شی كراوە.

●**ضَـرِیبة** ١/سـەرانە، بـاج. ٢/**العقارِیـة:** باجی خانووبەرە.

**ضَریح** ڕەنگ كراوبەسورێكی كاڵ.

**ضَریح** گۆڕ، قەور، قەبر، گڵكۆ، دوور.

**ضِــرْیَم** كــەتیرەی درەخــت، شــیلەی درەخت.

**ضَــــزْ** لێومكــــانی بەســــەریەكدا چەسپاندلەكاتی قسەكردندا بـەجۆرێك قسەی بەچاكی دەرنەدەبڕی.

●**ضَعَطَ** ١/**ه:** سەری بڕی.

**ضَعَفَ** لاوازوسست بوو، توانای لەبەربڕا.

**ضُعْف، ضَعف** بێ توانایی، لاوازیی.

**ضَــعَف** لاوازیــی وبێتوانــایی، لاوازی لەناومزوهۆشدا.

**ضِــعف** دووبەرابــەر، دوئەوەنــدەی هەرشتێك.

**ضعیف** لاواز، سست، بێهێز، گەمـزە، بـێ ئیرادە.

**ضَـغَبَ** لورانـدی وەكوگـورگ، لورانـدی، ترسا.

●**ضَـغَثَ** ١/**الحـدیث:** تێكـەڵاوی كـرد. ٢/**الشيءَ:** كۆی كردەوە. ٣/**الثوبَ:** شۆردی بەڵام جوان پاكی نەكردبویـەوە هـەروەك تەڕوبــــەلی كردبێــــت ودەســــتی لــــێ هەڵگرتبێت.

**ضِــغْث** چــەپكێك گیــای تەڕووشــك پێكەوەنراوێتە.

**ضَغْث** هەرقسەیەكی بێ خێر.

●**ضَـغَطَ** ١/**ه:** فشاری لەسـەردانا، گوشی، گوشاردی، ناڕەحەتی كرد.

**ضَغط** فشار، پەستان، تۆبزی، زۆرلێكردن، سەخت گیری، پاڵە پەستۆ، تەوژم.

**ضَغْطة** ناچاری، تەنگی وسەختی.

●**ضَـغَمَ** ١/**الـشيءَ وبـە:** پڕبـەدەم گـازی لێگرت، پڕبەدەم قەپی پیاكرد.

●**ضَـغِنَ** ١/**علیـە:** ڕقـی لـێ كێـشا، سـۆی لێكێشا، كینەی لەدڵ گرت بەرانبەری.

**ضِغن** كینەلەدڵ، ڕقـاوی، شـوێنی لار، داری خوار.

**ضِغن** كینە، ڕق، باوەش، ئامێز، ئارەزوو.

**ضَغِینَة** كینەوڕقی سەخت.

●**ضَـفَّ** ١/**القـوم:** ئاپۆڕەیانـدا لـەدەوری خواردن یان ئاو. ٢/**الشيءَ:** كۆی كردەوە.

**ضَفار** گوریسی باربەستن.

**ضَـفّاز** درۆهەڵبەسـت، كەسـێك قـسەی خەڵكی بهێنێت وبیبات.

**ضَفّاط** قەڵەو، ورگن، ورگی زل.

●ضَفَدَ ١/هُ: بەزللە لێیدا، بەچەپازلە لێیدا، بەلەپی دەست لێیدا.

ضِفدِع، ضَفدَع بۆق، قرپۆق، قرپۆك، قورواق، بەق، گیاندارێکە لەشکانی وئاودا دەژیو هەندێك جانەوەری بچوکی وەك پێشکەومێش دەخوات.

●ضَفَرَ ١/البناءَ: بەوشکە کەڵەك هەڵەچنی. ٢/الدابةَ: جڵەوی کردە دەمی.

●ضَفَزَ ١/فلاناً: بەدەست یان بەلەقە لێیدا.

●ضَفَطَ ١/هُ: بەگوریس بەستی.

ضَفُطَ ورگی زل وشۆڕبوو، ڕای لاوازبوو.

●ضَفَنَ ١/الیهِ: هات بۆلای ولەتەکیدا دانیشت.

ضِفن نادان، گەمزە، گێل، گەوج، حەپۆلە.

ضَفَّة گرۆ، کۆمەڵ، دەستە، پێڕ، ڕۆخی دەریا.

ضِفَّة کەناری دەریا، ڕۆخی ڕوبار، ڕۆخی دەریا.

ضَفیر پەلکەی قژ یان هەرمویەکی تر.

ضَفیط قەڵەوی ورگن، ورگی زل، نادان وگەمزە وگەلحۆ.

ضَلال گومڕایی، گومڕاهی، سەرلێشێواوی، نەدۆزینەوە یان لادان لەڕێگەی ڕاست، تیاچون، لەناوچون.

ضَلالة گومڕابوون، سەرلێ شێوان، سەرگەردانی.

●ضَلَّ ١/الرجلُ: مرد، گومڕابوو، لەڕێی ڕاست لایدا. ٢/الطریقَ: ڕێگەی ون کرد، ڕێی بزرکرد. ٣/سَعیُهُ: کۆشش وکاری نەوبەفیڕۆ ڕۆشت، ڕەنج بەخەساربوو.

ضَلّ گومڕایی، سەرلێ شێوان، لەڕێ لادان، لادان لەڕێی ڕاست.

●ضَلِعَ ١/الرجلُ: تێربوو لەخواردن یان لەناو بەجۆرێك گەشتە قەفەزی سنگی.

ضَلَع هێز، توانا.

ضِلْع ئێسقانی چەماوەی قەفەزی سنگ، پەراسوو.

ضِلَع ئێسقانی چەماوەیقەفەزی سنگ، برۆچونکە چەماوەیەوەك ئێسقانی قەفەزی سنگ، داو، تەڵە.

ضَلَع لاری وخواری.

ضَلَل ئاوێك لەبەری بڕوات لەنێوان درەختەومیان لەژێر بەردەوە بەجۆرێك خۆرلێی نەدات.

ضَلول گومڕا، سەرلێ شێواو.

ضَلّة سەراسیمەیی، گومڕایی.

**ضِلَّة** گومرایی، سەرلێ شێوان.

**ضَلِيع** پیاوی سنگ پان وبەهێزوپتەو، بەهێز، کەوانێك دارەکەی لاربێت یان لاری تێدابێت.

●**ضَمَّ ١/الشيءَ:** کۆی کردەوە. **٢/الحرفَ:** نیشانەی زەممەی لەسەردانا.

**ضَمّ** کۆکردنەوە، گرد کردنەوە، نیشانەی زەممەکە لەسەرپیتەکانی زمانی عەرەبی دادەنرێت بەگوێرەی پێویست.

**ضِماد** لەفاق برین پێچان، پارچە پەرۆیەکی پزیشکیی نەرم ونۆلی درێژکۆلەیە برینی پێ دەپێچرێت، موشەممای سەر برین.

**ضِمَار** قەرزێك ماوە بۆدانەوەکەی دیاری نەکرابێت.

●**ضَمَّ ١/ه الى صدره:** ئەوی گوشی بەسنگی خۆیەوە.

**ضِمام** هەر چیەك دوشتی پێبلکێنرێت پێکەوە.

**ضَمان** گرەنتی، کەفالەت، برێتی لەگرەنتی دان بەگەڕاندنەوەی هەرشتێك تیا بچێت یان بە قەرەبوکردنەوەی بەپارە گەرنرخدار بوو یان بەشتێکی لەهەمان شێوەی خۆی، مسۆگەرکردن، بیمە.

●**ضَمانة ١/الدولية:** بریتیە لەوەی دەوڵەتێکی گەورە گرەنتی سەربەخۆبونی دەوڵەتێك دەوڵەتە لە بچکەڵەکان بکات.

**ضُمَاضِم** شێری بێشەوجەنگەڵ، ئازاوبوێر.

●**ضَمَجَ ١/بالأرض:** چەسپا بەزەویەوە.

**ضَمَج** بەڵایە توشی مرۆدەبێت، چەسپان ولکان بە زەویەوە.

●**ضَمَدَ ١/الجرح:** پێچای، برینەکەی بەست، سارێژی کرد.

●**ضَمِدَ ١/**وشك بوو، وشك هەڵات، وشکەوەبوو، ئیشك بوو. ٢/ زۆرتورە بوو. **٢/عليه:** رقی لێ کێشا، کینەی لێکێشا.

**ضَمْد** باشترین مەڕ، خرابترین ولەڕترین مەڕ، درەختی تەڕ، درەختی وشك،

**ضَمَد** کینە، ڕق، قین، ستەم، زوڵم.

**ضَمَرَ، ضَمُرَ** لاوازبوو، گۆشتی کەم بوویەوە، لەڕبوو.

**ضُمر** لاوازیی، لەڕیی، لکانی سك بەپشتەوە بەهۆی لاوازیەوە.

**ضَمْرة** ژنی لەڕولاواز.

**ضَمَرَ** بێدەنگ بوو، لەقسەکردن ڕاوەستا، خامۆش بوو.

**ضَمر** شاخێك بەدەم زنجیرە شاخی ترەوەنەبێت وتەنها بێت.

●**ضَمِنَ ١/الشيءَ**: زەمانەتی کرد، گرەنتی دا لەسەری. **٢/الرجلُ**: توشی نەخۆشینی درێژخایەن بوو.

**ضَمَن** نەخۆشی درێژ خایەن.

**ضِمْن** ناوەوەی شت، بەشی ناوەوەی هەرشتێك، چوارچێوە.

**ضَمِن** عاشق، ئاشق.

**ضَمیر** ترێی خراپ بوگ، ویژدان، ڕاناوی بەکارهاتو لەڕستەدا وەك: (**هوَ، هيَ**. . . هتد).

●**ضَنَّ ١/بالشيء**: بەغیلی پێ برد، ڕژدی پێ برد.

**ضُناك** هەلامەت، ئەلامەت.

**ضَنَأ** خۆی شاردەوە، پەنهان بوو، خۆی حەشاردا.

**ضِنْأ** وەچە، ڕۆڵە و زارۆی پیاو.

**ضَنَط** چالاکی، بەز، پیو.

**ضَنْط** تەنگی، تەسکی وتروسکی.

**ضَنُكَ** لەشی یان هۆش وئاوازی لاواز بوو.

**ضَنْك** تەنگ، تەسك وتروسك لەهەرشتێك.

**ضُنِكَ** توشی هەلامەت بوو.

**ضَنَن** پیاوی ئازاوچەلەنگ، چاونەترس وبوێر.

**ضَنو، ضِنو** وەچە وڕۆڵە، زارۆ.

**ضَنِيَ** نەخۆش کەوت ولاوازی زاڵ بوبەسەریدا.

**ضَنَى** نەخۆشین ولاوازی، بەدحاڵی.

**ضَنِين** ڕژد، بەغیل، چرووك.

**ضَواحي** دەوروبەر(وشەکە جەمعە).

**ضَواء** ڕۆشنایی، ڕوناکی.

**ضَواة** هاواروقیژوهوڕوقرەقڕی خەڵك.

**ضَوجان** وشك ورەق لەهەرشتێك، چوارپێ ومرۆی زۆرلاواز.

**ضَور** برسێتی سەخت.

**ضُور** هەوری ڕەش.

**ضُوَرَة** پیاوی سوك وبێنرخ.

**ضَوْنَة** کیژۆڵەی بچکەڵە، کچۆڵەی بچوك.

●**ضَوَى ١/اليه**: پەنای بۆبرد، پەنای پێبرد. **٢/الرجلُ**: بەشەوداهات.

**ضَوء، ضُوء** ڕۆشنایی، ڕوناکی، تیشك وڕوناکی خۆر.

●**ضَهَدَ ١/ه**: چەوساندیەوە، سەرکوتی کرد.

**ضَهْر** کیسەڵ.

●**ضَهَزَ ١/ه**: بەتوندی پێی پێدانا.

●**ضَهَلَ ١/اللبن**: کەم کەم کۆبویەوە.

**ضَهَل** ئاوی کەم.

**ضَـــهول** وشـــترێك شـــیری کـــەم بێـــت، وشترمری سپی.

●**ضَهيَ ١/ت المرأة**: مەمك وشیری نەبوو.

**ضَهِیَ** هاوشێوە، هاوشان، هاوتا.

**ضِیاء** ڕوناکی، ڕۆشنایی.

**ضِیاع** وون بوو، لەناوچون، بزربوون.

**ضِیافة** میوانی، میوانداریی.

●**ضَـیّحَ ١/اللبن**: تێکـەڵاوی کـرد لەگـەڵ ئاودا.

**ضَیح** همنگوین.

●**ضَیَّعَ ١/الـشيء**: فەرامۆشـی کـرد، پـشت گوێی خست، لەناوی برد، وونی کرد.

**ضَیف** میوان، میڤان.

**ضِیف** بازو.

**ضَـــیفَن** مـــشەخۆر، کەســـێك خـــۆی بەمیوانـدا هەڵپەسـێرێت و بۆسـەرداوەت بێت.

**ضَیفة** ژنێ میوان بێت.

**ضَیَق** گومان، دودڵی.

**ضِیقة** دەست تەنگی وهەژاریی.

**ضَیق** تەنگ، تەنگی، تەسك.

**ضَیم** ستەم وزوڵم.

**ضِیم** کەنارولاپاڵی شاخ.

● **طَأطَأَ** ١/**رأسَهُ**: سەری لەقاند، سەری دانەواند. ٢/**الحفرةَ**: قوڵی کرد.
**طَأطَاء** وشتری کورتەڵە، وشتری کورت.
**طـائر** پەلەوەر،باڵندە، هەرگیاندارێك باڵی هەبێت وبفرێت، بەخت، شانس، ڕۆژی مرۆڤدەماخ، ئەستێرە.
**طـائِرة** فڕۆکە، هۆکارێکی هەوایی گواستنەوەو جەنگە.
**طائِش** نادان، گەمژە، گەلحۆ.
**طائِع** فەرمانبەردار، گوێڕایەڵ وملکەچ.
**طـائِف** کەسێك بەشەودا بگەڕێت وپاسەوانی خەڵکی بکات.
**طائِفة** گرۆیەك لەهەرجۆرە شتێ، پێرو دەستە، پەیڕوانی هەرڕێبازێك، کۆمەڵێك خەڵکی، پارچەیەك لە هەرشتێ، هۆز، تایەفە.
● **طـابَ** ١/حەڵاڵو بەلەزەت بوو. ٢/**الشيءَ**: بەچێژو حەلاڵی کرد.
**طابِع** مارەیی ژن، نیشانە، مۆرێ بنرێت بەکاغەزی مامەلات وبەڵێندەرایەتیدا.
**طـابِق** نهۆم، قات (دەگوترێت: فلان کۆشك ئەوەندە قاتەیان نهۆمە).
**طـابَق** دەفرێکە چێشتی تێدا دەکوڵێنرێت.
● **طـابَقَ** ١/**هُ**: لەگەڵیدا هاوڕابوو. ٢/**بين الشيئين**: خستنیە بەرانبەری یەکترو موتابیقی کردن.
● **طاحَ** ١/ سەرگەردان وئاوارە بوو، نزیك کەوتەوە لەتیا چون، تیاچوو. ٢/**الشيءَ**: ونی کرد، بزری کرد.
**طاحِنَة** کاکیلە، ئەو ددانانەی ئەرکیان هاڕین و وردکردنی خواردنە، جەنگی ماڵوێرانکەر.
**طاحون، طاحونة** ئاش، ئاسیاو، ئاساو، جێگەی باراش هاڕین.
**طـاخَ** ئالودەو گیرۆدە بوو بەکاری قێزەون وخراپەوە.
**طاخِيَـة** تاریکیەکی زۆر، تاریکی ئەنگوستەچاو، دەیجوور.
**طادَ** سەقامگیربوو، ئۆقرەی گرت.
● **طـارَ، طواً** ١/**بفلان**: لێی نزیك کەوتەوە، نزیك بویەوەلێی. ٢/**طوراً**: فڕی، هەڵفڕی. ٣/**الشعرُ**: درێژ بوو. ٤/**عقلهُ**: ئاوەزی لەسەردا نەما. ٥/**صيتهُ**: ناوبانگی بڵاوبویەوە. ٦/**اليه**: پەلەو هەڵپەی کرد بۆی.
**طارِئَـة** کتوپڕ، بەڵای ناگەهان، ڕەوەند(دانیشتوانی وڵاتێك کەلەبنەڕەتدا خەڵکی وڵاتێکی ترن).

**طارُ، طـــــارَة** تـــار، ئـــاميْريْكى مۆسيقيەلە(دەف) دەچيْت.

●**طـارَة ١/النخل،** ئـەو تەختـە چەماوە بازنەيـيـەى كەبيْـزنگ و هيْلّـەكى پـێ دروسـت دەكريْـت وتــەلى هيْلّــەكى لێ دەبەستريْت.

**طـــارِق** كەسـيْك بەشـەودا بيْـت بـۆ جيْگەيـەك (بۆيـە وانـاونراوە چـونكە كەسيْك بەشەودا بگەريْت ناچار دەبيْت لـەدرگا بـدات) ئەسـتيْرە، ئەسـتيْرەى دەمەوبەيان، ميوانى شەو.

**طارِقـــة** بـەلاّ، نارەحـەتى، نـويْنيْكى بچوكى لەسەرنوستن، خزم وهۆزى پياو.

**طازِج** تازە.

●**طاسَ ١/الشيءُ** زۆر بوو، زيادى كرد.

**طاس** قاپى ئاوخواردنەوە، دەفرى ئاوپـێ خواردنەوە، جام.

**طـاس، طاسـة** دەفـرى دەسـت شـۆرى سەرسفرە، جام.

●**طـــاشَ ١/** ئــاوەزى لەســـەردا نـــەما.

**٢/الـــسهمُ** لــەئامانجى نــەدا، نيــشانەى نەپيْكا.

**طـاع، طـوع** فەرمانبـەر، ملكـەچ وگـوێ رايەلّ.

**طاعِن** پير، بەسالاّچوگ.

**طاعــة** گـوێ رايـەلّيى، فەرمانبـەردارى، گوێ گريى.

**طاغِ** ستەمكار، گەردنكەش.

**طـــــاغوت** زۆر ســــتەمكار، كەســـيْك زۆرلەســـنور دەرچـــوبيْت وســـتەمكارى بەرپاكردبيْت.

**طاغي** ستەمكار، ناگويْرايەلّ.

**طاغِيَـة** بەهـەمان مانـاى **(طـاغي)**ديْـت لەبارى تەئنيسدا، سـتەمكار، خۆبـەزلزان، نادان، گەمژە.

●**طافَ ١/بالمكان،** بەدەوريـدا سـورايەوە.

**٢/في البلاد،** تيايدا گەڕا، پيايدا گەڕا.

**طافحَة** وشك لەهەر شتيْك، ئيشك.

**طافَّة** نيْوانى كەژ ودەشت، داميْنى چيا.

**طــافي** هەرشــتيْك ســەرئاو كــەوتبيْت، ماسى مرداربووەوەى سەرئاوكەوتگ.

**طافِيء** كوژيْنەرەوە، خامۆشكەر.

●**طاقَ ١/الشيءَ** توانى، تواناى بەسەريدا هەبوو، بەرگەيى گرت.

**طـــاق** تـــاق، كـــەوان، پەنجـــەرە، جـــۆرە پۆشاكيْكى بێ گيرفانە.

**طاقَــة** وزە، توانـا، ئەنـەرزى، پەنجـەرە، چەپكيْك موو يان هەرشتيْكى تر.

**طاقِيَة** كلاّو، ئارەخچن، پۆشاكى سەر.

**طالَ** درێژ بوو، باڵای کرد، پێچەوانەی کورتەوە بوو.

**طالَبَ** داوای هەقی خۆیی کرد، پروپاگەندەی هەقی بۆ خۆی کرد.

**طالِب** خوێندکار، قوتابی، داواکەری زانست.

**طالِح** خراپەکار، شەڕانگێز، خراپ، بەد.

●**طالَعَ ٨/الكتاب** بەوردی خوێندیەوە، ورد سەرنجیدا، موتالایکرد.

**طالِع** یەکەمین سپی بونەوەی ئاسۆلەدەمەوبەیان دا کەبە. (فەجری درۆزن) ناودەبرێت ودواتر ئاسۆ تاریک دەبێتەوەو پاش ماوەیەکی تر بەڕاستی ڕۆژدەبێتەوە، مانگ.

**طالِق** ژنی تەلاق دراو.

**طالِم** نان پەز، نانکەر، نانەوا.

**طامَّة** بەلاوسەختیەك کەلەهەموو بەلاو سەختیەکانی ترنارەحەت تربێت، قیامەت چونکە لەهەموو بەلاکانی ترو سەختیەکانی دیکە سەخترە.

**طامِر** پێشکە، مێشولە، پەخشە، پێشی.

**طامِع** چاوچنۆك، تەماکار، چاوتێ بڕ.

**طامِل** پیاوی جنێودەری بێباك لەوەی کەدەیڵێت ودەیکات.

●**طانَ ٨/الحائطَ** بەقوڕ سیواغیدا، سیواقیدا، ڕوکەشی کرد بەقوڕ.

**طانَ** هەرجێگەیەك قوڕی زۆر بێت.

**طاني** زیناکەر، داوێن پیس.

●**طاوَعَ ٨/ه عليه،** هاوڕاو قایل بوو لەگەڵیدا لەسەر فلان شت.

**طاولَة** مێز یان سفرەیەکی لەتەختە دروستکراو.

**طاوی** برسیی.

**طاهي** چێشت لێنەر، چێشت پەز، گۆشت برژێن، نانەوا، نانکەر.

●**طَبَّ ٨/ه** دەرمانی کرد، چارەسەری کرد.

**طَبّ** پزیشك، نۆژدار، دوختەر، دوکتۆر، هەرکەسێك لەکاری خۆیدا لێزان و بیرتیژبێت.

**طِبّ** شەهوەت وئارەزوو، خواست وویست، خوونەریت، جادوو، فێڵ وچاوبەست، چارەسەری لەش ودەرون، نۆژداری.

**طِبَابَة** پیشەی پزیشك، پزیشکایەتی، نۆژداریی.

**طَبّاخ** چێشت لێنەر، چێشت پەز.

**طِباخَة** پیشەی چێشت لێنان.

**طباشیر** دەباشیر، تەباشیر، پارچەگەچی بچوك بۆ نوسین.

**طَبـاع** چاپكەر، چاپـچی، كەسـێك بەچاپكردنەوە سەرقاڵ بێت.
**طِباع** سروشت.
**طِباق** موتابیق وگونجاو.
**طَبّال** تەپڵ لێدەر، خاوەنی تەپڵ، تەپڵ ژەن، دەهۆڵ لێدەر.
**طِبالَـة** پیـشەی تـەپڵ لێـدان، دەهـۆڵ كوتان.
● **طَبَّبَ** ۱/**ە:** چارەسـەری كـرد، دەرمـانی كرد.
● **طَبِجَ** ۱/**الرجل:** گەمژەو بێ ئەقڵ بـوو، هۆش وگۆشی نەماو گەلحۆ دەرچوو.
**طَبَخَ، طَبَّخَ** لێینا، پێی گەیاند.
**طَبَرَ** بازیدا وخۆی حەشاردا.
**طَبَر** تەور، بیور، بەڵتە.
**طَبَـرزِین** تـەور زیـن، بیورۆكـەی چـەكی شەڕكەران وسەرشانی دەروێشان.
● **طَبَزَ** ۱/**ە:** پری كرد.
**طِبز** وشتری جوت گردۆڵكە پشت، جۆرە وشـترێكە دوو گردۆڵكـە بەسـەر پـشتی یەوە هەیە.
**طَبس** ڕەش لەهەمووشتێك.
**طِبس** گورگ، گور، شێنۆ.
**طَبْش** خەڵك.

● **طَبَعَ** ۱/**علیه:** مۆری كـرد. ۲/**الدرهم:** نەخـشی كردوسـكەی لێـدا. ۳/**الكتـاب:** چاپی كرد. ٤/**الدلو:** پری كرد.
**طُبِعَ** چاپ بوو، چاپ كرا.
**طَبـع** سروشـتی مـرۆڤ نمونـە وشـێوە، خوو، چاپ.
**طَبَع** گونـاه، عەیبـەو هۆكـارێكی خراپـە، ژەنگ.
**طَبِع** شمشێری ژەنگ كردوو.
● **طَبِقَ** ۱/**ت یده:** دەستی بەسترا، دەستی لكابەلەشـیەوەو نـەی تـوانی درێـژی كاتەوە.
**طَبق** داوی ڕاوكردن، ڕۆژگارێكی درێژ.
**طَبَـق** سـفرە چـونكە خـواردنی لەسـەر دەخورێـت، كۆمـەڵێك خـەڵك، سـەرپۆش، سینی.
● **طَبَّقَ** ۱/**الغیم:** بەگشتگیری بڵاوبویەوە. ۲/**الماء وجه الأرض:** دای پۆشی.
**طَبَقـة** پلـە، چـین (دەگوترێـت چـینی كرێكار- **طبقة العمال**. . . هتد).
**طَبَلَ** تەپڵی لێدا.
**طَبل** دەهۆڵ، تەپڵ.
**طَبَنَ** زیرەك بوو داناو لێزان بوو.
**طُبن** تـەنبوریان عـود هـەرتكیان ئـامێری مۆسیقین.

**طَبَن** کۆمەڵێکی زۆر.

**طُبنَة** دەنگی تەنبور.

**طبنَة** زیرەکی ودانایی.

**طَبیـب** پزیـشکی دانـا لـەکاری خۆیـدا، نۆژداری زانا.

**طَبیخ** گەچ، خشت.

**طَبیعـی** سروشـتی، وابەسـتە بەسروشتەوە.

**طبیعیات** زانستە سروشتیەکان.

●**طَثّ ١/الشیءَ:** بەقاچ یان بەلەپی دەست لێیدا بۆ وەی لەجێگەی خۆی لایبدات.

**طَثـرة** قـەوزە، خـۆش گـوزەرانی، خـوری پەز.

**طَجَنَ** برژاندی، سوری کردەوە.

●**طَحّ ١/ه:** رایخست.

**طَحَا** زەوی راخراوی پان.

●**طَحَـا ١/**راکـشا، هـەڵزیا، پاڵکـەوت، پاڵکـەفت، دورکەوتـەوە، تیاچـوو، لـەناو چوو. **٢/الشیءَ:** درێژی کردەوەو رایخست.

**طحـال** سـپڵ، رژێنێکـە لەبەشـی لای چەپی هەناودایە.

**طَحّان** ئاشـەوان، ئـارد دروسـتکەر، ئـارد فرۆش.

**طحانـة** ئاشـەفانی، ئاشـەوانی، پیـشەی ئاشەوان.

●**طَحَرَ ١/ت الریحُ السحابَ:** پـرژوبڵاوی کردەوە، با هەورەکەی پرژوبڵاو کردەوە.

**طَحر** هەوری تەنکی پرژوبڵاو.

●**طَحَلَ ١/الإناءَ:** پری کرد.

**طَحِـل** دەفـری پـڕ، مرۆڤـی تـورە، ئـاوی قەوزە گرتوو.

●**طَحِلَ ١/اللهُ:** پیس بوو، بۆگەنی کرد.

**طُحَمَـة** پیاوێـك زۆر بەسـەختی شـەڕ بکات، وشتر گەلێکی زۆر.

**طُحَـن** شـێری بێـشەوجەنگەڵ، پیـاوی باڵاکورت.

●**طَحَنَ ١/البُرَّ:** کردی بەئارد، هاڕی.

**طحن، طحین** ئارد، ئار، دەغڵی هاڕیاو.

●**طَحَـى ١/الـشیءَ:** رایخـست. **٢/الرجـلُ:** هەڵزیا، راکشا.

●**طَخّ ١/الشیءَ:** توڕیدا ودوری خـستەوە، برکیدا، فرێیدا، فرەیدا.

**طَخـاء** هـەوری بـەرز، هـەوری بڵنـد، خەفەت وغەم.

**طَخَمَ** لوت بەرزی نواند، خۆی بەزلزانی.

**طَخمَة** رانێك بزن، رانە گەلێك بزن.

**طُخـوم** سـنوری جیاکـەرەوەی نێـوان دوو پارچە زەوی.

**طَخوَة** هەوری تەنك وناسك.

**طَخيَة** نادان، گەمژە، گێل، گەلحۆ، گێژ، کەم ئەقڵ.

●**طَرَّ** ۸/**الشیئَ**: بەتوندی لێی خوڕین. ۲/**فلاناً**: دەری کرد. ۳/**الشیئَ**: بڕیی، لەتی کرد. ٤/**المالَ**: دزی، داگیری کرد. ۵/**السکینَ**: تیژی کرد. ٦/**الحوضَ**: بەقوڕ سیواقیدا. ۷/**الرجلُ من السطحِ**: کەوتە خوارەوە. ۸/**الشاربُ**: دەرهات.

**طَرّ** خوری تازە، پەشمی نوێ.

**طُرّان** هەرکارێکی خراپ، ڕێگەی ڕێ.

**طَرّاح** هەرجێگەیەکی دوور.

**طَرّاد** کەشتی جەنگی، جۆرە کەشتیەکی جەنگی تیژڕەوە، جێگەو شوێنی پان وفراوان.

**طِراد** ڕمی کورت، نێزەی کورت.

**طَرّار** گیرفان بڕ.

**طِراز** نەخش ونیگار ومۆدیلی پۆشاکو شمەك، ئەو جێگەیەی پۆشاکی تێدا دەچنرێت، شێوە، شێواز.

**طَراوَة** تازەیی، نەرمی وشێداریی.

**طَرِبَ** جموجوڵ ولەرزەلەرزی کرد بەهۆی خۆشحاڵی یان خەفەتبارییەوە.

**طَرَب** شادومانی وخۆشحاڵی.

●**طَرَّبَ** ۸/گۆرانی گوت، سترانی بێژا، دەنگی خۆی پڕلە ئاواز وخۆشکرد. ۲/**عن الطریقِ**: لایدا، لەڕێ لایدا.

**طَرِحَ** خوو ڕەوشتی خراپ بوو، ئاکاری بەد بوو، گوزەرانی خۆش بوو.

●**طَرَّحَ** ۸/**البناءَ**: بیناکەی زۆر بەرز کردەوە، زۆری بڵند کرد.

**طِرح** ئەو کۆرپەلەیەی کەبەر لە وادەی کامڵ بوونی لەبار دەچێت یان لەدایك دەبێت، کۆرپەی ناکامڵ.

●**طَرَحَ** ۸/ژمارەیەکی لە ژمارەیەکی تر دەرکرد، کرداری لێدەرکردنی ئەنجامدا. ۲/**علیه مسألةً**: پرسێکی خستەبەر دەمی، پرسیاری لێکرد.

**طَرحة** سەرپۆش.

●**طَرَدَ** ۸/**ه**: دەری کرد، دوری خستەوە.

●**طَرَّدَ** ۸/**ه**: دوری خستەوە، تەراندی، دەری کرد.

**طَرد** دورخستنەوە، دەرکردن، تەراندن.

**طَرِزَ** ئاکاری جوان بوو پاش ئەوەی خورەوشتی خراپ بوو.

●**طَرَّزَ** ۸/**الثوبَ**: بەسیمی ڕەنگاو ڕەنگ و وێنەوشتی تر پۆشاکەکەی ڕازاندەوە.

**طَرز** شێوەو شلکی شت، شێوە.

●**طَرَّسَ** ١/هـ خراپی کرد، بۆگەنی کرد. ٢/**الكتابَ**: نووسی.
**طَرَسَ** نووسی.
**طَرِشَ** کەڕ بوو، گوێچکەکانی لەکار کەوت، هەستی بیستنی نەما.
●**طَرَّشَ** ١/**البيتَ**: بەکلس یان بەگەچ دیوارەکانی سپی کردەوە.
**طَرش** مانگاوچێڵ، گا، هەر مادەیەك دیواری ماڵی پێ سپی بکرێتەوە.
**طَرَش** گوێ گرانیی، کەڕیی.
**طَرطَرَ** شانازی کردو لوت بەرزی نواند، لافی لێدا.
**طَرَفَ** فرمێسکی ڕشت بەهۆی شتێکەوە کەدای لەچاوی.
●**طَرَّفَ** ١/**الشيءَ**: هەڵی بژارد.
**طَـرف** چاو، چەم، چەعف، کۆتایی هەرشتێك.
**طَـرَف** کۆتایی هەرشتێك، پیاوی دڵگوشادو دەستکراوە، چوار پەل وسەری مرۆڤ لایەن.
**طَرفَسَ** جلکی زۆری لەبەرکرد، پۆشاکی زۆری پۆشی.
**طَرفَة** نیتکەیەکی خوێنینە لەچاودا پەیدا دەبێت، تانە، تانەی سەرچاڤ.

●**طَـرَقَ** ١/هـ بەچەکوش پیایدا کێشا. ٢/**الباب**: تەقولبابی کرد، دای لەدرگا، لەدرگایدا.
**طَرق، طُـرق** جار، کەرەت دەگوترێت: (**أتيته طرقين**= دووجار هاتمەلای یان هاتم بۆ لای).
●**طُـرِقَ** ١/**الرجلُ**: هۆش وفامی کەم بویەوەو لاواز بوو.
●**طَـرِقَ** ١/ئاوی لێڵی خواردەوە، ئاوی لێخنی نۆشی. ٢/**البعيرُ** لەئەژنۆیدا لاوازی هەبوو یان لەلاقیدا لاری هەبوو.
**طُرقَة** تاریکی، کەمڕەیی، کار، خوو نەریت، بەردی کەلەکە بوگ لەسەر یەکتری.
**طَرق، طِرق** داو، دام، تەڵە.
●**طَرِمَ** ١/**بيت النحل**: پورەی هەنگەکە پڕ بوو لەهەنگوین. ٢/**العسلُ**: لە شانەکەی داچۆڕا.
**طَـرم، طِـرم** هەنگوین بە(بەرەمێو)ەکەیەوە، هەنگوینێك لەمادە مۆمیەکەی نەگوشرابێت.
**طَرمَسَ** لەترساندا بێدەگ بوو، ڕای کرد، هەڵات.
**طِرمِساء** تاریکی یەکی زۆر.
**طَرمة** جگەر، جەرگ، کەزەب، جەگەر.

**طَرُوَ** تەڕو تازە بوو.

**طَروب** دڵ زیندوو، پێچەوانەی بێ زەوق ودڵ مردوو، بەشەوق، گۆرانی بێژ.

**طُرَّة** پەراوێزی پەڕاو، پالێمی پۆشاك، کەنارو لێواری هەرشتێك.

● **طَرِّی ١/الشيءَ:** تەڕو تازەی کرد.

**طَرِيّ** نەرم، تەڕو تازە لەهەرشتێك.

**طَرِيد** دەرکراو، تەرێنراو، هەڵاتوو، ڕاکردوو، ڕۆژی درێژ، ئەوخوشکەت یان ئەو برایەت کەلەدوای تۆ لەدایك دەبێت.

**طَرِيدَة** وشتری دزراو.

**طَرِير** نوکەنێزەی تیژ، پیاوی قۆز.

**طَرِيف** تازە، نوێ، دەگمەن، هەرشتێکی نامۆو دەگمەن بەتایبەتی بەروبوم وسەمەر، خۆش.

**طَرِيق** ڕێگە، ڕێ، ڕا، ڕێك، ڕێگا، شوێنی چون وهاتن لەسەر زەوی.

**طَرِيقَة** ڕێباز، ڕێچکە، ڕەوش وشێواز، دارخورمای درێژ، شێواز، شێوە، چۆنێتی.

**طَرِيم** خەشم وتوڕەیی.

● **طَرَءَ ١/عليهم:** لەکاتوپڕدا ولەدورەوە هات بۆ لایان، لەناکاوو لەدورەوە هات بۆ لایان.

**طَسّ** تەشت، دەفرێکە بۆ دەست شۆردن لەمس دروستکراوە.

**طسام** غوبار وتەپوتۆزی زۆر.

**طُشاش** پەتایەکە وەك هەڵامەت وایە.

● **طَشَّ ١/تِ السماءُ:** بارانێکی وردو لاوازی باراند.

**طَشّ، طَشِيش** بارانی وردولاواز.

**طِشَّة** زاڕۆی بچکەڵە، منداڵی گچکە.

**طَعام** خۆراك، خواردەمەنی، هەرچیەك بخورێت، گەنم.

**طَعَامِيّ** خۆراك فرۆش، خواردەمەنی فرۆش.

● **طَعِمَ ١/**چەشتی، تامی کرد. **٢/عليه:** توانای بەسەریدا شکا.

● **طَعَّمَ ١/الغصن:** موتروبەی کرد، لقی دارێکی تری پێوەکرد(وەك موتروبەی درەختی مزرەمەنی).

**طَعم** مەزە، تام، چێژ، تاڵی وشیرینی ترشی وسوێری.

**طُعم** توانادارییی، خۆراك، ئەو گەنم وخۆراکەی توڕدەدرێت بۆ ماسی وباڵندە بۆ ئەوەی بەهۆیەوە ڕاوبکرێت، زەهر، زەهر، بەرتیل،باج، سەرانە، ئاوەز، زیری.

● **طَعَنَ ١/ه:** بەنێزە لێیداو برینداری کرد.

**طَعن** زام، برینی نێزە، ئیفتیراو بەدناوی.

**طَعنَة** ئاسەواری برینی نێزە.

●**طَغَـا** ١/لەسـنور دەر چـوو، بەتـەواوی پێی لێراكێشاو سنوری بەزاند. ٢/**البحرُ**؛ شـەپۆلیدا. ٣/**الكـافرُ**؛ بـەنێوكوفردا ڕۆچـوو. ٤/**الرجـلُ**؛ لەسـتەم وبێدادیـدا زیادەڕەوی كرد.

**طَغَامَة** گێل، گەمژە، گەلحۆ، نادان.

**طَغَم** دەریا، ئاوی زۆر.

**طَغـوَة** هەرجێگەیـەكی بڵنـد، كـەم لەهەرشتێك.

**طُغیـان** لەسـنور دەرچـوون، بێـدادی وستەمی بێ سنور.

**طَغیـة** هەرجێگەیـەكی بـەرز، لوتكـەی چیا، بەرزترین جێگەی شاخ.

●**طَفَّ** ١/**الشيءُ**؛ نزیـك كەوتـەوە، نزیـك بویـەوە. ٢/**ه برجلـه**؛ بـەرزی كـردەوە بەقاچ.

**طَفّ** كەنار، لێوار، ڕۆخ، ئەسپی تیژ ڕەو.

●**طَفَا** ١/**فلانٌ**؛ مرد، كۆچی دوایی كرد. ٢/**طفوا**؛ سەرئاو كەوت و نقوم نەبوو.

**طُفَاحَـة** هەرچـیەك لـەلێواری دەفـری پڕەوە بڕژێت.

**طَفَاف**، **طِفـاف** ڕەشـایی شـەو، تـاریكی وڕەشی شەو.

**طَفّاف** ئەسپی تیژڕەو.

**طُفَافَـة** لێـوی دەفـر، بەشـی سـەرەوەی دەفـر كـەزیادەی پڕوبـونی لێ دەڕژێـت، لێواری دەفر.

●**طَفَـأَ** ١/**النـارُ**؛ ئاگرەكـەی كوژانـدەوە، ئاورەكەی خامۆش كرد.

●**طَفَحَ** ١/**الإناءُ**؛ پڕبوو ولەلێوارەكانیـەوە لێی ڕژا. ٢/**الإناءَ**؛ پڕی كرد تالێی ڕژا.

●**طَفَـحَ** ١/**الرجـلُ**؛ بـێ هـۆش كـەوت، بورایەوە.

●**طَفَـدَ** ١/**الميـتَ**؛ مردوەكـەی خـستە گۆڕەوە.

**طَفَدْ** گۆڕ، قەبر.

**طَفَرَ** بازیدا، بازی هەڵدا.

●**طَفَّـرَ** ١/**الفـرسُ النهـرَ**؛ ئەسـپەكە لـەم بـەری ڕوبارەكـەوە بازیـدا بـۆ ئـەو بـەری ڕوبارەكە.

**طَفِسَ** قێزەون بوو.

**طَفِس** قێزەون.

●**طَفَـسَ** ١/**الرجـلُ**؛ مـرد، كۆچـی دوایـی كرد.

**طَفِقَ** دەستی بەكار كرد.

**طَفِل** نەرم و ناسك لەهەرشتێك.

**طِفـــل** منـــداڵ، زاڕۆ، وردو بـــچوك لەهەرشـتێك، كۆرپـەی هـەرئاژەڵێكی

درنـده، شـەو، خـۆر لـەکاتی ئاوابونیـدا، پێداویستی.

**طَفَل** منداڵێتی، منداڵی، تاریکی.

**طَفل، طُفال** قوڕی وشکەوە بوگ.

● **طَفَـلَ ١/ت الـشمس:** نزیـك کەوتـەوە لەئاوابون.

● **طَفَّلَ ١/ه:** بەزمیی پێداهاتەوە، ڕەحمی پێکرد.

**طَفَّة** کۆمەڵ، دەستە، گروپ، گرۆ، کەم.

**طفولَة** منداڵێتی.

**طَفيَ، طَفِيءَ** خامۆش بوو، کوژایەوە.

**طُفَيلي** مشەخۆر، بەکەسێك دەگوترێت کەبـچێتە سـەر داوەتێـك لەکاتێکـدا بانگهێشت نـەکراوەو لەخۆیـەوە چوە بـۆ وەی پاروی چەور بخوات.

**طُفيَة** جۆرە مارێکی ژەهراوی پیسە.

**طَـق** دەنگـی بـەرد کەبکـەوێت بەسـەر بەردێکی تردا، تەقەی بەرد.

● **طَقطَـقَ ١/ت الـداوبة:** دەنگـی سمیـان هات.

**طَقـس** ڕێبـاز، شـێوازی بـەڕێ کردنـی دروشمە ئاینیـەکان، بارودۆخی کەشوئاو وهەواو ئەو گۆڕانانەی کەبەسەریدا دێت.

**طَلّ** پیاوی پیر، پیاوی بەساڵاچوگ، مـار، بارانی وورد، شەونم، ئاونگ.

**طُلّ** مار.

● **طُـلَّ ١/الـدم:** بـەفیڕۆ ڕۆشـت وتۆڵـەی نەکرایەوە.

**طَلاَ** بێچوی ئاسك کاژێری لەدایك بوونی، بچکەڵە لەهەرشتێك.

**طَلاّب** زۆر داواکەر، برێتی لەکەسێك زۆر داوای شتان بکات.

**طَلاح** کەندەڵیی وخراپە.

**طَلاق** تەڵاقدان، برێتیە لـەجیا بونـەوەی پیاو وژن(دووهاوسەر) بەڕێگەی شەرعی، تەڵاق.

**طَـلاّق** برێتیـە لەکەسـێك زۆر ژن تـەڵاق بـدات، بـەپیاوێك دەگوترێـت ژنـی زۆری تەڵاق دابێت.

**طَلاقة** ڕەهایی، گوشادیی.

**طَلاَلَة** شێوەیەکی جوان، شادومانی.

**طَـلاَوَة** پاشمـاوەی خـۆراك لەناودەمـدا، چاکی وجوانی، فاڵ، چاوبەست وفێڵ.

**طُـلاء** خـوێنی بـەفیڕۆ ڕژراو، خـوێن، برێتیەلـەخوێنی کوژراوێـك کەتۆڵـەی نەکرابێتەوە.

● **طَلَـبَ ١/الـهيء:** هەوڵیـدا بەدەسـتی بێنێت، داوای کرد، ئارەزوی کردو حـەزی لێـی بـوو. **١/فلانـة:** مـارەی کـرد، مـارەی بڕی.

**طَلَب** داوا، داواکردن، خواستن.
**طَلَبَ** دورکەتەوە.
**طَلِبَـة** نوێـژ، نـزا، پاڕانـەوە، دۆعـا، موناجات.
● **طَلَثَ ١/اللهَ،** ڕژاو لەبەری ڕۆشت.
● **طَلَثَ ١/علی کذا،** لێی زیاد کرد.
**طُلثَـة** نـادانی کـەم ئـەقڵ، گەمـژەی کـەم فام.
**طَلَـحَ** هـیلاك بـوو، شـەکەت بـوو، مانـدو بوو.
**طَلِح** چوار پێـی مانـدوو، ئـازەڵی هـیلاك وشەکەت.
**طَلِح** پیاوی برسی، پاشماوەی ئاوی لـێخن لەحەوزدا.
**طَلَح** ناسکی، نیعمەت وفەڕ.
● **طَلَـخَ ١/**ڕەشـی کـردەوە. **٢/الکتـاب،** خراپی کرد.
**طَلِخ** ئاوی بۆ گەن کردوو.
**طَلخاء** ژنی گەمژەو نادان.
● **طَلَسَ ١/الکتاب،** سڕیەوە، کوژاندیەوە.
● **طَلِسَ ١/**ڕەنگی بۆری ڕەشباو بوو. **٢/بە فی السجن،** خرایە زیندانەوە.
**طَلس** چادری ڕەش، تەیلەسانی ڕەش.
**طِلس** بەکاغەز یان نامەیـەك دەگوترێـت کەنوسراوی ڕوپەڕەکـەی کوژێنرابێتـەوە، پۆشـاکی چـڵکن بـەجۆرێك لەتاوچـڵك ڕەنگـی وەك ڕەنگـی گـورگ بـۆر هەڵگەڕابێت، گورگی بێ موو.
**طُلسَة** هەوری تەنگ وناسك.
● **طَلَـعَ ١/الکوکـب،** دەرکـەوت، هـەڵهات. **٢/الجبل،** سەرکەوتە سەری. **٣/علی الأمر،** بەئاگابولێی، ئاگادار بوو لێـی. **٤/عنهم،** لێیان دابڕاو دوو کەوتەوە.
**طِلع** مار.
**طَلعَة** پەیکەر، شێوە، وێنە، دیدار.
**طَلـع** ئەنـدازە، بـڕ، بـەری دارخورمـا لەسـەرەتای بـەرگرتن و دەرکـەوتنی بەرەکەیدا.
**طَلَف** زیادەی هەرشتێك، دیاری، هەدیە.
**طَلف، طَلَف** هەرشتێکی پوچ و باتڵ.
● **طَلَّفَ ١/علیە،** زیادەی خستە سەر، لێی زیاد کرد.
**طَلُقَ** ئـازاد بـوو، لەبەنـدی ڕزگـاری بـوو، ڕوی خۆش و شادومان بوو.
● **طَلَّق ١/قومە،** لێیان دورکەوتەوەو وازی لێ هێنان. ٢/ژنـی خۆی تەڵاقدا.
**طَلَق** ئاسك، ئاهو، مـامز، کـەژاڵ، خـەزاڵ، مامبز، پیـاوی سـەخی ودڵ گوشـاد، زمـان پاراو وقسەزان، ئازاری منـداڵ بوون، ژانـی منداڵ بوون.

**طِلق** ڕەها، حەلاڵ.

**طَلِق** دەم بەخەنــدە، ڕوگەش وزەردەخەنەدار، پێچەوانەی مڕوموچ.

**طلق** بەخت، بەش، نەسیب.

**طَلَم** چڵکی ددان، زەردایی وچڵك کەلەسەر ددان دروست دەبێت.

**طَلَّمَ** ئارەقی لەڕوخساری خۆی سڕی.

**طُلم** خوان، سفرە.

**طِلو** گورگ، گور، شینۆ.

**طَلو** بێچوی کەژاڵ ساتی لەدایك بوونی.

**طُلُوع** دەرکەوتن، هەڵهاتنی خۆرومانگ ونەستێرە. . . هتد.

**طلوة** بێچوی چوارپێ ودڕندە.

**طُلوَة** سپیایی بەرەبەیان، سپێدەی بەیانی، گەردن، مل.

**طلی** قاچی بەستەوە وحەپسی کرد.

**طلَی** چێژ، تام ولەزەت.

**طُلَّی** قومێك شیر.

**طَلِيّ** بەرخ، بێچوی بەز، کۆرپەی مەڕ، بەڕا، زەردیی ددان، زەردایی ددان.

● **طَلَّی ٨/فلانا**: جوێنی پێدا، جنێوی پێدا، حەپسی کرد، بەندی کرد.

**طُلية** مل، گەردن.

● **طَلِيَ ٨/لسانُهُ**: زمانی قورس بوو.

**طَليب** برێتیە لەکەسێك زۆر داوای شت بکات و ودوویدا بگەڕێت.

**طَليح** هیلاك، ماندو، شەکەت.

**طليف** بوچ، هەوانتە.

**طليق** خەندەڕویی، ڕەها لەهەر کۆت وبەندێك.

**طَمَّ** پڕی کرد.

**طِم** ئاو، دەریا، ژمارەیەکی زۆر، وشترمری نێر.

**طماح** خۆبەزلزانین، لوت بەرزی، لاف وگەزاف لێدان، شانازی کردن.

**طماطم** تەماتە، بازاناسۆر، باینجانی سور، تۆماتێز.

**طمأن، طُمَانينة** ئاسودەگی، ئارامی، دڵنیایی، ئاسایش وئارامی دڵ ودەرون وبیرو هۆش.

● **طَمأنَ ٨/ه**: دڵنیایکرد.

● **طَمَثَ ٨/**دەستی لێدا. **٢/ت المرأة**: کەوتە بێ نوێژیەوە.

**طَمث** پیسی وگەندەڵی، گومان ودودڵی، خوێن، خوێنی حەیز.

**طَمَخَ** لوت بەرزی نواند.

● **طَمَرَ ٨/الشيء**: شاردیەوە، حەشاریدا ونەسپەردەی کرد. **٢/الجرح**: ئاوسا، هەڵاوسا.

**طمر** پۆشاکی کۆنە.

**طُمُرَ** نەزانی، نەفامی.

● **طُمُـرَةُ** ١/**الـشباب**، سـەرەتای گـەنجێتی، بەهاری لاوێتی.

● **طَمَسَ** ١/دروکەوتـەوە. ٢/**بعينـه**، دوور روانـی، دوور تەماشـای کـرد. ٣/**الـنجم**، روناکی نەما.

● **طَمَـعَ** ١/**في الـشيء**، چـاوی تـێ بـڕی، تەماحی تێکرد.

**طَمَـع** برێتیـە لـەو شـتەی تـەماحی تـێ بکرێت، ڕۆژی سەربازان.

**طَمَلَ** گونکی نانی پانکردەوە بەتیرۆك.

**طَمل** هەویر، هەفیر.

**طمـل** گەمـزە، گێـل، ناچـیزە، هـەزاری بـەدحاڵی ڕوخـسار ناشـیرین، پیـاوی خراپەکاری جنێودەری گوێ نـەدەر بـەو قسانەی دێنەسەری وپێی دەگوترێن.

**طُمِلَ** بەخوێن یان بەڕۆن پیس بوو.

**طَملَةَ، طَمَلَةَ، طُملَةَ** نـاوی لـێخن، ئـاڤی لێڵ.

**طَمَّنَ** دڵنیای کرد، خاتر جەمی کرد.

**طَمِن** ڕاوەستاوی بێ جموجوڵ.

**طَمُوح** دەریایەك شەپۆلی بەرز بدات.

**طَمُوم** ئەسپی تیژڕەو.

● **طَنَّ** ١/**الذباب**، گیزەگیزی کرد. ٢/**فلان**، مرد، کۆچی دوایـی کـرد، عـەمری خـوای کرد.

**طِنّ** خورمای تازەی سوری زۆر شیرین.

**طُـنّ** ئەندامـەکانی لەشـی مـرۆڤ وئـاژەڵ، یەکەیـەکی پێوانـەی قورسـی بـەو یەکسانەبە. ١٠٠٠کیلۆ، تەن، تۆن.

**طَنَّاز** برێتیەلەکەسێك زۆر گاڵتە بەشت بکات یان گاڵتە بەخەڵکی بکات.

**طَنَّان** زۆربە ناوبانگ، ناودار.

**طَنَأَ** شەرمی کرد، شەرم دایگرت.

● **طَنَّـبَ** ١/چـادرەکەی بـەگوریس قـایم کـرد. ٢/**بالمكان**، تیایـدا نیشتەجێ بـوو. ٣/**الذئب**، گورگەکە لوراندی.

● **طَنِبَ** ١/**السهم**، لاربوویەوە، چەمایەوە.

**طَنَب** کەچایی ڕم، لاری وخواری نێزە.

**طَنِخَ** قەڵەو بوو، گۆشتی گرت.

**طَنِخ** قەڵەو، گۆشتن.

● **طَنَـزَ** ١/**بـه**، گاڵتـەی پێکـرد، پێـی ڕابوارد.

● **طَنَّـفَ** ١/**ه**، تۆمـەتباری کـرد، تۆمـەتی دایەپاڵی. ٢/**الجدار**، بەدرك یان بەتـەلی درکـاوی دیوارەکـەی تـەنی، سـەری دیوارەکـەی بـەدرك یـان بەتـەلی درکـاوی گرت.

**طَنفَسَ** ڕەوشت وخووی خراپ بوو، ئاکاری تێکچوو.

**طَفِيَ** سپڵی یان سیەکانی بەهۆی تینوێتیەوە لکان بەلاپاڵی دیواری سکیەوە، بەردەوام بوو لەسەرخراپەکاری و گەندەڵی.

**طِنيُ** گەندەڵی وخراپەکاری.

**طَنَى** نەخۆشین، پێچەوانەی ساغی وتەندروستی، تۆمەت، برێتیە لە خۆڵەمێشێك بەتەواوی دامرکابێتەوە.

**طُنُي** پیاوی زلەی لەش گەورە، پیاوی کەتەی فیل ئەندام.

**طَنِين** گیزەی مێش، گیزەگیزی مێش.

**طَوّاب** خشت دروستکەر، سورەوەکەری خشت، کەسێك پیشەی خشت دروستکردن بێت.

**طَوار** کۆتایی وسنوری هەر شتێك.

**طُوار** سنوری هەرشتێك.

**طُوَال** درێژ.

**طَوَال** درێژایی ڕۆژگار، درێژیی، درێژایی.

**طُوب** خشتی سورەوەکراو، خشتی سوور.

● **طُوبى** ۱/خۆشی و شادومانی، فەڕو بەرەکەت، بەهەشت، بەخت وشانسی باش. ۲/لَك، خۆشی بەحاڵت.

● **طَوَّحَ** ۱/الشیءَ، ونی کرد، بزری کرد. ۲/بِه، دوری خستەوە وئاوارەی کرد.

**طَوَح** دوور.

**طَوَد** کەژی گەورە، شاخی مەزن، تەپۆلکە، گردۆلکە.

**طَور** سنوری جیاکەرەوەی نێوان دوو شت، حاڵەت، بار.

**طُور** شاخ، چیا، کەژ، کێف، کێو.

**طُوريَ** نامۆ، بێگانە، غەوارە.

● **طَوَّسَ** ۱/ڕازاندیەوە. ۲/الصورة، وێنەی تاوسی کێشا.

**طَوس** مانگ، هەیڤ، ما، مان کە بەعاسمانەوە بەشەو تیشکداوێ.

**طُوط** مار، پیاوی بالآبەرز، دلێرو ئازا.

● **طَوَّعَ** ۱/لَه، وای لێکرد گوێ ڕایەڵ بێت.

**طَوع** فایلمەندی وئارەزو داری لەکردنی هەرکارێك.

**طَوعاً** بەئارەزوکردنی هەرکارێك، بەفایلمەندی کردنی هەرکارێك.

● **طَوَّفَ** ۱/بەوڵاتدا گەڕا. ۲/الناس، وەك لافاو هاتن وزەوی یان پڕکرد(واتە فەرمبالغی یان دروستکرد).

**طَوف** پاسەوانی شەوەدیوار، کەڵەك، جەلك وپیسی.

**طُوفـان** لافاو، زریـان، تاریکایی نوتـەکی شەو، هەرشتێکی زۆر.

**طَـوْق** توانـاداری لـەکردنی هـەرکارێك، گەردن، مل، گەردن.

● **طَـوَّقَ** ۱/**هـ** گەردن بەنـدی لـەمل کـرد، گەمارۆیدا.

**طُول** درێژی.

**طَول** تواناداری، بەخشیش ودیاری.

● **طَوَّلَ** ۱/**هـ** درێژی کرد، درێژی کردەوە.

**طُومار** پەیکی درێژ، پەڕەی درێژ.

● **طویـــل** ۱/درێـــژ. ۲/**الباع**: زرنـــگ، بەتواناو بەدەستەڵات. ۳/**العمر**: تەمـەن درێـژ، بەساڵاچـووگ. ٤/**اللسان**: زمـان درێژ، چەداوە ڕوو.

● **طَـوَى** ۱/ پێچایەوە، دەفـی کـرد، لـولی کرد. ۲/**الرحل**: بەئەنقەست خۆی برسی کرد.

**طَوِيَ** بەشێك لەشەو.

**طُوى** پاك، پاکژ.

**طَوى** برسێتی.

**طَوِي** پیاوی سك برسی.

**طَوِيَ** برسی بوو.

**طَوِيَّة** نیاز، مەبەست، ڕاز.

● **طَهَرَ** ۱/پاك بویەوە، پاکەوە بـوو. ۲/**هـ**: دوری خستەوە.

● **طَهَّرَ** ۱/**هـ** پاکی کردەوە، پاکژی کرد.

**طُهـــر** ئـــەو ڕۆژانـــە کـــەژن تیایانـــدا لەحەیزدا نیە.

**طُهرَة** پاکێتی، پاکژیی، خۆشتن بەئاو.

**طَهو، طَهايَة** ئاشپەزی، پیشەی چێشت لێنان.

**طَهُور** پاك کەرەوە، پاکژ کەرەوە.

**طَهَى** ورتکەکا، کای زۆر ورد.

**طُهَى** تاوان وگوناه، پوختەی هەرشتێك، شینۆ.

**طَـيّ** پێـچانەوە، پێـچانەوەی شـت بـۆ بردن.

**طَيَّـاخ** کەمژەیـەك خێـری تێدانـەبێت وچاکەی لێ نەوەشێتەوە.

**طَيَّـــار** فڕۆکـــەوان، لێخـــوڕی فڕۆکـــە، فڕۆکەڤان، خەلەبان، فڕۆکە ئاژۆ، بڕێتیە لەوکەســـەی فڕۆکـــە لێـــدەخوڕێت، هەرشتێك بڵاوبوبێتەوە، پرژوبڵاو.

**طَيَّارَة** فڕۆکە، تەیارە، باڵافڕ.

**طَيَّان** قوڕپەز، گڵ ساز.

**طِيَانَــة** گـڵ کـاری کـردن، قوڕکـاریی کردن.

**طِيـب** بـۆنی خـۆش وعـەتر، چـاکترینی هەرشتێك.

**طَيِّب** حەڵاڵ، پاك، پێچەوانەی پیس.

**طِيبَة** پاك وپوخت، ناوێکه بۆ زمزم.
●**طَيَّحَ ١/الشيءَ** ونی کرد، بزری کرد.
●**طَـيَّخَ ١/ه** لەکـەداری کـرد، قێزەونـی کرد.
**طَيخَـة** ناشـوب، بـەلا، ئـاژاوەو فیتنـە، گەمـژەو گەلحۆیـەك هـیچ خێـرو چـاکە یەکی تێدانەبێت ولێی نەوەشێتەوە.
**طَير** مەل، باڵندە، پەلەوەر.
**طَيَـران** فـڕین، هـەڵفڕین، هـەڵفڕینی باڵدارەکان بەهەوادا.
●**طَيَّرَ ١/المالَ** بەشی کرد، دابەشی کرد.
**طَــــيس** خــــۆڵ، ژمارەیــــەکی زۆر، مێرولەوماسـی چـونکە وەچـەیەکی زۆر وزەوەند دەخەنەوە.
**طَيش** بێ باکی، گەمژەیی، نادانی.
**طَيـــف** شـــێتی، شـــێتێتی، تـــوڕەیی، ئەندێشەوخەیاڵ، دوودڵی ووەسوەسە.
**طِيلَة** تەمەن، عومر، ماوەی ڕۆژگار.
●**طَـيَّنَ ١/الحـائِطَ** بـەقوڕ سـیواغیدا، بەقوڕ سیواقیدا.
**طِين** قوڕ، خۆڵی تەڕکراو، حەڕی.
**طِينَة** سروشت وخوو، قوڕ، حەڕ.
**طَيُوب** عەترو هەرشتێکی بۆنخۆش.
**طَيُّور** چالاك وتیژڕەو.
**طُيُور** باڵندە، مەل (وشەکە جەمعە).

**ظِئر** دایەن، ئافرەتێك شیر بدات بەمناڵی غەیری خۆی.
●**ظـأَبَ** ١/ژنـی هێنـا. ٢/**ە** ژن خوشـكی ئەوی هێنا وبویە ئاوەڵزاوای.
**ظَـــأب** مێـــردی ژن خوشـــك، مێـــردی خوشكی ژن، ئاوەڵزاوا.
**ظَأَرَ** میهرەبانی وسۆزی نیشاندا.
**ظؤرة** دایەن، شیردەر.
**ظارِی** گەزندە، هەرچی یەك بگەزێت.
**ظَـالِع** شـەل، لـەنگ، پیـاوی كۆنـە كـار، تۆمەتبار.
**ظالِم** ستەمكار، زاڵم، كەسێك نادادگەری پیـــشەی بێـــت وســـتەم وجـــەور بـــەكار بێنێت.
**ظاهِر** ئاشكرا، ڕۆشـن، دیـار، پێچەوانەی **(باطن)** ناوێكە لەناوەجوانـەكانی خـوای گەورە.
●**ظاهِرَة** ١/ بەهەمان واتای **(ظاهر)**دێت لەحاڵەتی **(تأنیث)**دا، دیـاردە. ٢/**الجبل،** قولـەی كێـو، لوتكـەی شـاخ، قوتـەی كـەژ، بەرزترین جێگەی كێف وچیاوهەرد.
**ظاهِری** دەرەكی، ڕوا ڵەتیی، ئاشكرابین.
**ظاهِرِیَّة** ڕێبازێكە پێـی وایـە مەعریفـە كـــورت هـــەڵهاتوە لـــەڕوداوە بـــەر هەستەكاندا (فینۆمینیسم).

**ظَبـیٌ** ئاسـك، مـامز، كـەژاڵ، خـەزاڵ، مامبز، ئەسپی قەڵەو.
**ظَبْیَة** ئاسكی مێ، كچی عازەبی گەنج.
**ظِـرٌ** بەردێكـە دەمـی تیـژی هەیـە وەك دەمی چەقۆ.
●**ظَرٌ** ١/بەردی **(ظِرّ)** ی شكاند. ٢/**الناقة،** بە بەردی**(ظِرّ)** سەری بڕی.
●**ظَرِبَ** ١/**بكذا،** پێوەی لچكا، پێوەی لكا، پێوەی چەسپی.
**ظَرِب** گردۆلكەی بچوك.
**ظُرُبّ** پیاوی كورتە باڵای گۆشتن.
**ظَـرُفَ** زیـرەك وچـاو تیـژبوو، هەیئـەتی جوان بوو.
**ظَـرْف** زیرەكـی، زەرف، كیـسی لەكاغـەز دروست كراو.
**ظَــرف، ظَرافَــة** شایــستەیی، هـۆش، زیرەكی.
**ظَروری** هۆشمەندی زیرەك.
**ظُرُف** بارودۆخ.
●**ظَـرَی** ١/**الماء،** لەبـەری ڕۆشـت، جـاری بوو.
**ظَریف** زیرەك وبیرتیژ، بەزەوق.
**ظِعــان، ظَعــون** كـوریس، كوریـسی بەستنەوەی كەژاوە.
**ظَعَنَ** ڕۆشت وكۆچی كرد.

**ظَعن** سەفەر، گەشت.

**ظَعِينَـــة** کـەژاوە، ژنێـك لەناوکـەژاوەدا بێت، کۆچوبار.

●**ظَفَـــرَ ١/ه** نینـۆکی بەڕوخـــساردا چەقاند.

●**ظَفَّرَ ١/الشیء** نینۆکی پێدا چەقاند. ٢//ه داواونزای بـه ئامـانج گەشـتنی بـۆ کرد.

**ظَفِـــرَ** بەدەســـتی هێنـــا، بـــەئامانج ومەبەست گەیشت.

**ظَفِـــر** کەسـێك هەرچـی یـەکی ویـست بەدەســـتی بهێنێـــت، کەســـێك هـــەر ئامانجێکی بوو بەدەستی بهێنێت.

**ظَفَر** زەوی پڕ لەگیا.

**ظُفـــر، ظُفُـــر، ظِفـــر** نـاخون، نینـۆك، ناخو.

●**ظِـــلال ١**/ســـێبەر، ســـایە. ٢/**البحـــر**، شەپۆلی دەریا.

**ظَلّام** زۆر ستەمکار.

**ظَلام** تاریکی، سەرەتای شەو.

●**ظَـــلَّ/** بـــەردەوام بـــوو، مایـــەوەو بەرقەراری وەرگرت. ٢/**الشیء**، درێژ بوو.

**ظِلّ** سێبەر، سەربەرزی، خۆش گـوزەرانی ورەفاهیـەت، سـەرەتای گـەنجی وزسـتان، دامێنی کراس وپۆشاك.

●**ظَلَعَ ١/البعیرُ** لەڕێ ڕۆشتندا لەنگی.

**ظَلع** عەیب وناتەواوی.

●**ظَلَّـفَ ١**/زیـاد بـوو، زۆربـوو. ٢/**ه عـن کذا**، دوری خستەوە.

**ظَلـف** ڕەوا، ڕێگـه پێـدراو، پـوچ وبـاتڵ، گوزەران وژیانی ناڕەحەت.

**ظَلف** سمی مانگاو ئاسك ومەڕ، دووسم.

**ظَلَـف** کـامڵ وتـەواو، هـەر جێگەیـەکی بەرزتر لە ئاووقوڕ، خوێنی بەفیڕۆ ڕژاو.

**ظَلَمَ** ستەمی کرد، بێ دادی کرد.

●**ظَلِمَ ١**/تاریك بوو. ٢/**الله اللیلَ**، تاریکی کرد. ٣/**الرجلُ** چوە تاریکیەوە.

**ظُلم** سـتەم، بـێ دادی، تـاریکی، هاوبـەش پەرستی، دانـانی شـت لەغـەیری جێگـەی خۆیدا.

**ظَلَم** شاخ، چیا، هەرد، کێو، کەژ، کێف.

**ظَلَم** بەفر، بەور، وەور، بەرف، وەفر.

**ظُلْمَة** تاریکی، پێچەوانەی ڕۆشنایی.

**ظَلُوم** زۆر ستەمکار، کەسێك زۆر ستەمی لێ بوەشێتەوە.

**ظُلَّـــة** هەرچـــیەك ســـێبەر بـــدات وەك درەخت، درەختی سێبەردار، سابات.

**ظِلَّـة** هەرچـی یـەك سـێبەر بـدات وەك هەوروشتی تر.

**ظَلِيف** حالْ شڕ، بەدحالْ، سەر شۆڕ، هەرمەسەلەیەکی زۆر سەخت ونارەحەت، جێگەی سەخت ودژوار، بێخی گەردن.
**ظَلِيل** سێبەردار، هەمیشە سێبەردار.
**ظَلِيم** وشترمری نێر.
**ظَلّيم** زۆر ستەمکار.
**ظَمء** ئارەزومەندی، تینوێتی.
**ظَمْئان** ئارەزومەند، تینو.
**ظَمَأ، ظَمَاء** تینوێتی.
**ظَمِیءَ** زۆر تینوی بوو.
**ظَنّ** گومان، شك.
**ظَنَّ** گومانی برد، شکی کرد، مەزەندەی کرد.
**ظَنُّون** گومان بەر، پیاوی کەم فێڵی متمانە پێ نەکراو.
**ظِنَّة** بەد گومانی، کەم لە هەر شتێك، تۆمەت.
**ظَنِين** تۆمەتبار.
●**ظَهَرَ** ١/لەدوای بزر بوون بەدەر کەوتەوە، دەرکەوت، سەری هەڵدا. ٢/ **الفساد**، گەندەڵی تەشەنەی کردو دەرکەوت وبلاوبویەوە. ٣/**ه** کێشای بە پشتیدا.

**ظَهر** پشت، دیوی دواوەی سك، ماڵ وسامانی زۆر.
**ظُهر** نیوەڕۆ، ناوەڕاستی ڕۆژ.
**ظَهَرَة** هەرچی یەك لەماڵدا هەیە وەك جل وبەرگ وکەلو پەل.
**ظِهرَة** کۆمەك، یارمەتی، هاوکاری، هۆز وعەشیرەتی پیاو.
**ظَهِیر** هەرچی ئاژەڵێك پشتی بەهێز بێت وەك ئەسپ ووشتر، پشت گیرو یارمەتیدەر.
**ظَیّ** هەنگوین.
**ظَیّان** هەنگوین.

**عائب** لەکەدار کەر، لەکەدار.

**عائث** شێری بێشەو جەنگەڵ.

**عائد** عیادەکەر، کەسێ سەردانی نەخۆش بکات، کەسێك لە شوێنێك گەڕابێتەوە.

**عائدة** داهات، سود، کەڵك، قازانج.

**عائذ** وشتر وکەژاڵی تازە زاو بۆیە واناونراوە چونکە بێچوەکەی پەنای بۆ دەبات.

**عائر** ...یەك ببێتە هۆی چاو ئێشە، دودڵ وسەرگەردان.

**عائش** زیندوو، ئاسودە، پیاوێ گوزەرانی خۆش بێت.

**عائق** کۆسپ، لەمپەر، هەرچیەك ببێتە هۆی سەرقاڵ کردن و ناڕەحەت کردنی مرۆڤ.

**عائل** ترازوی لار، بێ نەوا.

**عائل** هەژار، کەم دەست.

**عائلة** خێزان، خانەوادە.

**عائن** ناوی ڕەوان.

**عَاب** لەکە، ناتەواوی و عەیب.

● **عابَ ۸/الشيءَ:** لەکەداری کرد، عەیب داری کرد.

**عابث** گاڵتە کەر بەدین وخوڕەوشت، کەسێك ئاین وخوڕەوشت بەگاڵتە بگرێت، عەبەسی.

**عابد** خزمەتکار، پارێزەر، خزمەتکاری مزگەوت، خواپەرست.

**عابر** ڕێ گوزەر، ڕێبوار، سەرنج دەر لەهەر شتێ.

**عابس، عبوس** ترشڕوو، دڵتەنگ، ڕوگرژ.

**عابية** کەنیشك و کەنیزەکی جوان ڕوخسار وخۆشڕوو. .

**عات** بێ بەزەیی، ستەمکەرو دڵڕەق.

**عاتق** شەرابی کۆن، مەێی کۆن بوبێت؟ شان.

**عاتك** سوری زۆر تێر، پیاوی جوانمەرد و بەخشندە، پاڵفتەو بێ خەوش لە هەرشتێ بێ.

**عاتن** توند وتۆڵ.

**عاتي** ستەم کار، شەوێ زۆر تاریك بێت.

● **عاثَ ۸/الشيءَ:** شتەکەی خراپ کرد.

**عاثور** چاڵێکە بۆ شێر هەڵدەکەنرێت، بیری ئاو.

**عاج** ددانی فیل، شەفرەی ئەملاولای دەمی فیل کەوەك چەقۆی تیژ وان.

**عــاجِز** كۆڵـەوار، دەستەوەسـان، نابینـا، کوێر، کەسێك نەتوانێ شتێ بکات.

**عاجِل** پەلە، دەست و بردو خێرا.

**عاجِلاً** بەپەلەو. بێ درەنگ.

**عاجِلة** دونیا، هەرشتێکی بەپەلە.

●**عاجَمَ** ١/**هـ** تاقیکردەوە.

●**عَادَ** ١ گەڕا یەوە. ٢/**هـ** کردیە عـادەت و نـەریت و خـوو. ٣/**المـریضَ** سـەردانی نەخۆشەکەی کرد. ٤/**الى الوعي** هاتـەوە هـۆش خـۆی، گەڕایـەوە سـەرحاڵەتی هۆشیاری.

**عــادِر** زۆر درۆزن، کەسـێك زۆر درۆزن بێت.

●**عادَلَ** ١/**بين الشيئين** یەکسانی کردن، هاوتـای کـردن. ٢/**هـ في المحمل** لەگەڵیـدا سوار بوو.

**عادِل** دادگەر.

**عادة** خوو، نەریت، ڕەوشت و عادەت.

●**عــادَى** ١ **فلانـاً** دوژمنایـەتی لەگەڵدا کرد، بوبە دوژمنی.

**عادِي** دەست درێـژ کـەر، دوژمـن، شێری بێشەو جەنگەڵ. .

**عــادِيّ** ئاسـایی، هـەر شـتێ یـان کارێـك مرۆڤ لای گران و نامۆنەبێت.

**عاذَ** پەنای برد.

**عــاذِب** کەسـێك بـەهۆی تیونێتیـەوە واز لـەخواردن بێنێـت، ئاژەڵێـك بـە پێـوە وەسـتا بێـت و هـیچ نـەخوات و نەخواتەوە. .

**عــاذِل** لۆمـەکار، سـەرکۆنەکەر، نـاوی مانگی شەعبان و شەوال.

**عار** عەیب و عار.

●**عــارَ** ١/ هـات و چـوو بەدودڵیـەوە. ٢/ **فلاناً** عەیب داری کرد.

●**عارَ** ١/**هـ** کوێری کرد.

**عــار** عـەیب، نـەنگی، شـورەیی، جنێـو، ڕیسوایی.

**عارِض** پێچەوانەی ئەصلی و جەوهـەری، شاخ، چیا، هەورێ لە ئاسۆوە دەرکـەوێت، ڕووکەش.

●**عارِضة**١/ددانی پێشەوەی نـاودەم. یـان ئەوددانانـــەی لـــەکاتی پێکـــەنین و زەردەخەنــدا دەردەکــەون، لای ڕومــەت، ڕای جوان، پێداویستی. ٢/**الازياء** نمایش کاری جلوبەرگ، کیژێ پیشەکەی نمایش کردنی جلو بەرگ بێت.

**عارِف** دانا، ئاگا، وەئاگا، خودناس.

**عارِن** شێری بێشەو جەنگەڵ.

**عارة** شتی بەخواسـتن بیدەیتـە کەسـێك بەوەمەرجەی بۆت بگەڕێنێتەوە.

●**عَهِدَ** ۱/پەیمانی بەست، بەڵێنیدا. ۲/**الشیء**: پاراستی و پارێزگاری لێکرد.
**عَهْد** پەیمان، بەڵێن، سوێند، ئەمان، ئامۆژگاری، سەردەم و ڕۆژگار.
**عُهْدَة** بیمەو کەفالەت، لاوازی ئەقڵ.
**عَهْدَة** یەکەم بارانی بەهار.
**عَهَرَ** زینای کرد.
**عِهر** زینا، گانی حەرام.
**عَهِر** زیناکەر.
**عَهِر، عِهارَة** داوێن پیسی، ناموس فرۆشی.
**عَهِنَ** ئامادەبوو.
**عِهْن** خوری، خوری ڕەنگ کراو.
**عَهید** هاوپەیمان، کۆن ودێرین.
**عَيَّ** دەستەوسان بوو.
**عَیَّاب** زۆر عەیبدار کەری خەڵك، کەسێك زۆر خەڵکی عەیبدار بکات.
**عَیَّاث** شێری بێشەو جەنگەڵ.
**عَیَّار** کەسێك زۆر هاتوچۆ بکات.
**عِیار** پێوەر، ئەندازە، عیار، پێوەری بڕی ئاڵتون یان. . . هتد.
**عِیاط** قیژو هوڕ، هات و هاوار.
**عِیالَة** سەرپەرشتی.
**عَیَّال** کەش و فش کەر لەڕۆشتندا.
**عَیام** ڕۆژ.
**عِیان** بینین و تەماشایەك گومان نەبێت تیایدا.
**عَیَّان** ناخۆش گوزەران وکەسێك نەحواڵی خراپ بێت، بیمار.
**عَیب** عەیب وناتەواوی، کەم وکووڕی.
**عَیْبَة** بوخچەو جانتایەك جلی تێ بخرێت.
**عَیَّبَ** عەیب داری کرد.
**عیثَة** زەوی نەرمەڵان.
**عید** جەژن، جێژن، گێژن، جێژنە، ڕۆژی بەتاڵی وخۆشی.
**عَیَّدَ** جەژنی کرد.
**عَیْر** کەری ماڵی یان کەری کێفی، شاخ، گەورەو دەمڕاست، پادشا، تەپڵ.
**عِیْر** کاروانی کەران، کاروان ئیدی هی هەر جۆرە گیانلە بەرێك بێت.
**عَیْساء** کوڵلەی مێینە.
**عِیْس** وشتری سپی بێت و کەمێك ڕەشی تێکەڵاو بێت.
**عیسی** عیسا پێغەمبەر (د. خ)، حەزرەتی مەسیح.
**عَیْش** ژیان وگوزەران، خۆراك، نان.
**عَیْشَم** نانی وشك.
**عَیَّطَ** هاواری کرد.
**عیطاء** گردۆڵکەی بەرز.

**عَیـف، عیفـان** حـەز لـێ نـەکردن، بـێ مەیلی، بێزاریی.

**عیفَة** هەڵبزاردنی باشترین ماڵ وئاژەڵ.

**عَیِّق** ڕێگر، پیاوی ترسنۆك.

**عَیِّل** ماڵ ومنداڵی پیاو.

**عَیْلَة** ماڵ ومنداڵی پیاو و ئەوانـەی ئـەم مەسروفیان دەکێشێت و دەیان ژیەنێت.

**عَـیْلَم، عـیلام** کـەمتیاری نێـر، قرپـۆق، بۆق.

**عَیَّلَ** ماڵ ومنداڵی زۆر بوو.

**عَیْلَة** تەنگ دەستی وهەژاریی.

**عَیمَة** زۆر حەزلەشیرکردن، تینوێتی.

**عِیمَة** باشترینی ماڵ وئاژەڵ.

● **عَیَّنَ** ۱/ مرواری کون کرد. ۲/ە: دەست نیشانی کرد.

**عَیْن** چاو، چاق، ئەنـدامی بیـنین، خـودی هەرشـــتێ، پاڵفتـــەو ڕون، دیـــدەوان و سـیخوڕ، دیمـەنی پیـاو، سـوو، ڕیبـا، مـاڵ وسامان، دینار.

**عَـــیَن** خـــەڵکی وڵات، کەســـایەتیە ناودارەکانی نێو خەڵکی وڵات.

**غائِب** نادیار، نائامادە، هەرشتێك پەنهان بێت.

**غائِص** كەسێك دابەزێتە ناو ئاو و پیایدا رۆبچێت.

**غائِط** زەوی نشێو، تەوالێت، ئاودەست.

**غائِلة** موسیبەت، بەدبەختی، پێشهاتەی خراپ، بەڵا.

**غائِم** تەمومژدار، ئاسمانی هەوردار.

**●غابَ ١/عنه:** دورکەوتەوە لێی. **٢/الشئ عن فلان:** پەنهان بوو. **٣/عن بلاده:** سەفەری کرد. **٤/عن الوعي:** لەهۆش چوو، بێهۆش کەوت. **٥/الشیئ في الشیئ:** تیایدا پەنهان بوو، شاردرایەوە.

**غاب** بێشە، جەنگەڵ، نێزەی درێژ(وشەکەجەمعە).

**غابِر** رابردوو، تێ پەڕیوو، پاشماوە.

**غابِش** خایەن، ناپاك، ستەمكار، فێڵبازو فریودەر.

**غابَة** بێشە، جەنگەڵ، نێزەی درێژ.

**●غاثَ ١/** خودا بارانی باراند. **٢/ه:** فریای كەوت ویارمەتیدا، كۆمەكی پێكرد، پەنایدا.

**●غاجَ ١/الغصن:** پێكئاڵراو خواروخێچ بوو.

**غادِر** بێ ئەمەك، بێ وەفا، ناپاك، خایەن، غەدركەر.

**غادَرَ** بەجێی هێشت، وازی لێهێنا.

**غادة** ژنی نەرم وناسك.

**●غارَ ١/الرجل:** لەنیوەڕۆدا خەوت، لەنیوەڕۆدا نوست. **٢/النهار:** گەرماكەی تاوی سەند. **٣/هم الله:** خودایارمەتیدان بەڕۆزی وخێر. **٤/الشیئ:** داوایكرد. **٥/ه:** سودی پێگەیاند. **٦/غوراً:** هات بۆئەشكەوت.

**غار** ئەشكەوت، كەورگ، ئەشكەفت، هۆڵ و ڕەهۆڵ لەكێودا، تەپو تۆز، سوپایەكی گەورە، لەشكرێكی زل وزەبەلاح.

**غارة** شاڵاو، هێرش، پەلامار.

**غارُوق** مزگەوتی كوفە.

**غاز** گاز لەهەوادا، یەكێكە لەڕەگەزەكانی پێكهاتە و پێكهێنەری ژیان.

**غاز** هێرش بەر، داگیركەر.

**غازي** گازدار، گازی.

**غازِية** ژنی هونەر پیشە.

**غاس** فانی، نابەرقەرار.

**غاسِق** مانگ، هەیف، شەوی زۆرتاریك، ماری ڕەش.

**غاسُول** سابون، شتێكە لە بەزو خۆڵە مێشێكی تایبەتی سازدەكرێ وچەوری پێ

دەشۆرن، هەرشتێك پیسی پێ بشۆردرێت.

**غاش** کەسێك چاوڕاو لەخەڵکی بکات، دەست برو فێڵبازوفریودەر.

**غاشِیَة** پەردەی دڵ، بەڵاو نارەحەتی، قیامەت و ڕۆژی بەرێ، ئازارونەخۆشی سك، میوان و هاوەڵی مرۆڤ.

●**غاصَ** ۱/چومژێرئاوەوە، خۆی نقوم کرد لەئاودا، چوە ناو ئاوەوە. ۲/**علی الشيء**: هێرشی کردە سەری، شاڵاوی بردەسەری، پەلاماریدا.

**غاصِب** داگیرکەر، کەسێك بەتۆبزی دەست بەسەر شتێکدا بگرێت.

●**غاضَ** ۱/**الماءُ**: کەم بویەوە. ۲/**الثمنُ**: کەمی کرد، کەم بویەوە.

**غاضِب** تورە، ڕق هەستاو، قین داهاتوو.

**غاضِر** پێستەیەك بەچاکی خۆشەکرابێت، بەربەست، لەمپەر، ڕێگر.

**غاضِف** حاڵ و گوزەرانی باش، برێتیە لەسەگێك گوێچکەی لەسەرەوە بۆخوارەوە داشکابێت.

**غاط** کۆمەڵ، گروپ، دەستە، پێر.

●**غاطَ** ۱/چاڵی هەڵکەند. ۲/**فيه**: چوەناویەوە.

**غاطِس** تاریك، شەوی تاریك ونوتەك، پێچەوانەی ڕۆشن.

●**غاظَ** ۱/**ه**: تورەی کرد، قینی داهێنا، ڕقی هەستاند.

**غاغ** ڕێحانە، گیایەکی بۆنخۆشە.

**غاغَة** خەڵکی قەرەباڵغی تێکەڵ وپێکەڵ.

●**غافَ** ۱/**ت الشجرةُ**: پەلوپۆکانی بەڕاست وچەپدا ڕاتەکاند.

**غافِر** بەخشندە، هەڵە پۆش، ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە.

**غافِل** بێ ئاگا، بێ خەبەر.

●**غافَلَ** ۱/**ه**: غافلگیری کرد، چویە بۆتەوە تاکو کاتی بێ ئاگایی ئەو بقۆزێتەوە.

**غاقِ** دەنگی قەلەڕەشکە، غاقەی قەلەڕەشکە.

**غاق** قەلە ڕەشکە، قاڵاو.

●**غالَ** ۱/**ه**: دزیی، غافلگیری کرد. ۲/**ت المرأة ولدها**: بە سکپڕی شیریدا بە کۆرپەکەی، بە دووگیانی شیریدا بەمنداڵە کەنۆکەی.

**غال** قوفڵ، شتێ لە ئاسن و پۆڵا دروستکراوە دەرگای پێ قایم دادەخرێت.

**غالِب** بالا دەست، دەست ڕۆیشتگ، زاڵ دەست، زۆربەی کات دەگوترێت: (**هذا ما یحدث غالبا و فی الغالب** - واتە لە زۆربەی کاتدا).

●**غـالَطَ ١/هُ:** خستیە هەڵەوە، تاوان و هەڵەی پێ کرد.

**غالي** گۆشتی قەڵەو، نرخی گران.

**غالِیَة** تێکەڵە بۆنی خۆش، جۆرەها بۆنی خۆش بەتێکەڵ کراوی.

**غام** ڕۆژی گەرم و بەقرچە.

**غامِد** بیرێك ئاوەکەی بە خۆڵ داپۆشرابێت، کەشتی بارکراو، کەشتیەك پڕبێت لە بار.

**غـامَرَ** خۆی خستە ناو گێژاوی مەترسیەوە، سەرەڕۆیی کرد.

**غامِر** زەوی وێرانە، سەر زەوی کاول، زەوی ژێر ئاو کەوتوو، ئاوێکی زۆر.

●**غـامَسَ ١/**خۆی خستە ناو جەرگەی شەڕەوە. **٢/فلانا:** نقومی کرد لەئاودا. **٣/فی الامر:** پەلەی کرد، جرتەجرتی لێکرد.

**غامِض** تەمو مژدار، هەر مەسەلەیەك ڕون نەبێت، سەرشۆڕ، مل کەچ.

**غامِق** ڕەنگ بۆر.

●**غـامَ ١/ت السماء:** ئاسمان تەمو مژاوی بوو. **٢/الهیم:** تینوی بوو و هەناوی گەرم داهات.

**غانَ** تینوی بوو.

**غاوی** گومڕا، سەر لێ شێواو، کۆتر باز.

●**غـایَرَ ١/هُ:** پێچەوانەی ئەو بوو، ئاڵو گۆڕی کرد.

**غایَة** پەرچەم، ئالا، بەیداخ، باڵندە، مەبەست، ئامانج.

**غُبار** تەپو تۆز، خۆڵی بەبادا کراو.

**غَباوة** بێ ئاگایی، نادانی، گەوجی، گێلێتی.

●**غَبَّ ١/**بە میوانی هات لە دوای چەند ڕۆژێ. **٢/الطعام:** بۆگەنی کرد، شەوی بەسەردا هات.

**غَبَّ** برێتیە لەخواردنەوەی ئاو بەبێ وەستان و هەناسەدان، بیننان بە ئاوەوە تاکو تێراو بوون بەبێ وەستان وهەناسەدان.

**غِبَّ** چارە نووس و کۆتایی هەرشتێك.

●**غَبَّـبَ ١/الذئب:** قورگی بەرخەکەی گرت. **٢/الشیء:** خراپ بوو، بۆگەن بوو.

**غُبْثَة** ڕەنگی مەیلەو بۆر.

**غُبْجَة** قوم، فرێ لەئاو.

**غُبر، غُبَّر** پاشماوەی هەرشتێك.

**غَبَر** مانەوە، بەرقەراری، خۆڵ، خاك.

**غِبْر** كینەو ڕق.

**غَبِـر** زامـی پـڕ لـە كـیم و زوخ، برینـی ئینتهاب كردوو.

**غَبْـــرَاء** مێینـــەی كـــەو، زەوی پـــڕ لـــە درەخت.

**غَبَرَة** تەپ و تۆز.

**غَـبَسَ** شـەوتاریك داهـات، شـەو تاریـك بوو.

**غَـــبَس** ڕەنگـــی خۆڵەمێـــشی، تـــاریكی سەرەتای شەو.

●**غَبِشَ ١/اللیلُ:** سـپیایی سـەرەتای ڕۆژ تێكەڵ بەتاریكی كۆتایی شەو بوو.

**غِبش** شەوی تاریك.

**غَبَش** تاریكی كۆتایی شەو.

**غُبشة** پاشماوەی شەو.

●**غَبَطَ ١/** دەستی دا لە پـشتی بەرانەكـە تابزانێـــت قەڵـــەومیان لـــەڕ، بەدەســـت مـەزەنەی گۆشتەكەی كرد. **٢/هُ:** خۆزگەی بە حـاڵی ئـەو خواسـت بـێ ئـەوەی حـەز بكـات نـازو نیعمـەتی ئـەویش نـەمێنێت، حەزی كرد حاڵی خۆی وەك حاڵی ئـەوی لێ بێت بەڵام حاڵی ئەو ناخۆش نەبێت.

**غِبطَة** باشـی گـوزەران، خۆزگـە خواسـتن بە نازو نیعمەتێك بەڵام نەك بە جۆرێك ئەو نازو نیعمـەتە لـە دەسـت خاوەنەكـەی بچێت.

●**غَبَقَ ١/القَمَ:** لـە ئێـوارەدا ئـاوی دا بـە مەڕەكان، پەزەكانی ئێوارە دۆش كرد.

●**غَبَنَ ١/الثوبَ:** جلكەكـەی قـارس كـرد. **٢/الطعامَ:** شاردیەوە بۆ تەنگانە. **٢/هُ:** لـە كڕین وفرۆشتنـدا خەڵەتانـدی.

**غَبْن** لاوازی ڕا، لە بیرچوون.

●**غَـبِنَ ١/الشیءَ:** هەڵەی تێـدا كـرد، لـە بیری چویەوە وهەڵەی تێدا كرد.

**غُبِنَ** فریوی خوارد، هەڵخەڵەتا.

**غَـــبَن** فـێڵ لـەكڕین و فرۆشـتندا، چـاو بەسـت، هەڵخەڵەتانـدن، ئـەو پارچـەیەی لە پالێم و ئەم لاولای كراس دەبڕدرێت و بڕك دەدرێت.

**غُبْنَة** گوزەرانی كەم و كولەمەرگی.

●**غَبّی ١/الشیءَ:** شاردیەوە، حەشـاری دا. **٢/الشعرَ:** هەڵی كێشاو كورتی كردەوە.

**غَبِیَ** نادان و گەمژە بوون.

**غَبِيّ** نـادان، گەمـژە، گـەلحۆ، گێـل، كـەم فـــام، بڕێتیـــە لەكەســـێك هۆشمەنـــدی وناوەزی كەم بێت.

**غبیـــب** لافـاوی بـچوك، زریـانی چـكۆلەو كەم.

●**غَـتَّ** ١/بـه دەسـتی یـان بـه چـەمکی کراسەکەی دەمی خۆی شاردەوە بۆ وەی کەس پێکەنینەکەی نەبینێ. ٢/**الشيءَ**: لە ئاودا نقومی کرد. ٣/**الماءَ**: قوم قوم خواردیەوە بێ ئەوەی دەفرەکە لەدەمی دوور بخاتـەوە. ٤/**الطعامُ**: خـراپ بـوو، بۆگەنی کرد.

●**غَتِلَ** ١/**المكانُ**: دارو درەختی تێدا زۆر بوو.

**غَتم** گەرمیەکی زۆری وا کەمرۆڤ تەنگە نەفەس بکات.

**غَثَّ** لاواز بوو، گۆشتی کەم بوویەوە.

**غَثّ** لاواز، لەڕ، لات، زەعیف، کەم گۆشت.

**غَثاثة** لاوازی، زەعیفی و کەم گۆشتی.

**غُثاء** هەرشتێکی بێ نرخ، کەفی ڕووی دەریـا، هـەر شـتێکی ئـاو بردەڵـەی وەك گەڵادارو شتی بێ نرخ.

**غَثْراء** کەمتیار، قەمتار.

**غَثْرَة** هەرزانی، خۆشی و گوشادی ساڵ.

**غُثْـرَة** ڕەنگـی بـۆری بەسـور ئاوێتـەی مەیلەو سەوز.

**غُثْمَة** ڕەنگی بۆری مەیلەو ڕەش.

**غَثَمَ** برە پارەیەکی باشی پێدا.

**غَثَـوَ، غَثَي** زریانەکـە کـەف و زباڵـەی هاورد.

**غُثَّة** بژێوی ڕۆژانە.

**غَثِيث** کیم و زوخی برین، جەراعەت.

**غَثِيثَة** هەرچی یەك خێری تێدا نەبێت.

●**غَثَى** ١/**الكلامَ**: تێکەڵ و پێکەڵی کرد.

**غَـد** بـەیانی، سـبەینێ، سـوبحەی، سبحەینێ، سوەی، سۆزی.

●**غَـدَّ** ١/**البعيرُ**: توشـی تـاعون بـوو، وشترەکە توشی تاعون هات.

**غدا** بە بەرەبەیاندا ڕۆیشت، بەیانی زوو ڕۆشت.

**غـدّار، غـادِر** خیانـەتکار، زۆر ناپـاك، پەیمان شکێن، بێ بەڵێن.

**غـدَّارة** غـەدارە، پارچـە چـەکێکە بـە باروت فانگ دەدرێت جاران لەکوردسـتان باوی بوو.

**غـدّان** لولـەکێکی تایبەتیـە جلکی پێـدا هەڵدەواسن.

**غَداة** بەیانی، سەرلە بەیانیەکی زوو.

**غَدد** تاعونی وشتر.

**غَدَرَ** پەیمانی شکاند، بێ وەفایی کرد.

**غَدر** بێ ئەمەکی، پەیمان شکێنی، ناپاکی وخیانەت.

**غَدَف** بەخشی.

**غَدَف** هەرزانی وخۆشگوزەرانی، گوشادی ساڵ.

**غِدْف** شێری بێشه وجەنگەڵ.

●**غَدَقَ ١/المكان:** دوچاری ئاوێکی زۆر هات.

**غَدَق** ئاوی زۆر، ئاوی فره.

**غَدَن** خەو وخەومنوچکە، نەرمی وناسکی.

**غَدِنَ** نەرم و ناسك بوو، خەو دایگرت، نوست.

**غُدْنَة** نەرم و نۆڵیی، ناسکی.

**غَدِيَ** نانی بەیانی خوارد.

**غَدِير** ڕوبار، چەم، چەقان، چێم، چۆم، چۆمی گەورە، شەت، ڕوبەرێك ئاو یان گۆلاو کە زریان لە دوای خۆی جێی دێڵێت.

**غَدِّير** کەسێك زۆر پەیمان شکێنێت.

**غَذا** خۆراکی پێدا، چێشتی پێیا.

**غِذاء** خۆراك، خواردەمەنی.

●**غَذَى ١/الرجل:** خواردنی پێدا، خۆراکی پێدا.

**غَذِيّ** بچکەڵەی ئاژەڵ و چوار پێ.

●**غَرَّ ١/ه:** هەڵی خەڵەتاند، چاوبەسی لێکرد بە شتی پوچ. ٢/**الماء:** ڕژاندی.

**غِرّ** گەنجی بێ ئەزمون، برێتی لە لاوێکی هەرزەکار کە هیچ ئەزمون و تاقیکردنەوەی نەبێت، ناشی.

**غَرّ** تیژایی، شمشێر، ڕوبار وچۆمی باریك لەزەویدا، درز لەزەویدا.

**غُراب** قاڵاو، قەلە ڕەشە، قەلە ڕەشکە.

**غَرّار** خەڵەتێنەر، چاوبەستکەر، فێڵباز.

●**غَرَا ١/الرجل:** سەرسام بوو، سەری سوڕما.

**غَرا** جوانی.

**غَراء** حەز لە شتکردن، ئارەزوومەندی.

**غرام** گرام، یەکەیەکی پێوانەی قورسییە(١کیلۆگرام= ١٠٠٠گرام).

**غَرام** دڵداری وخۆشەویستی، حەز لەشتێك کردن، خۆشەویستی یەك دڵ ئازار بدات، ئەشکەنجەو ئازار.

**غرامَة** زیان، پێچەوانەی سوود، ماڵێك بە تۆپزی بدرێت، باج.

●**غَرَبَ ١/**ڕۆشت، دورکەوتەوە، ئاوارەبوو لە زێدو نیشتمانی خۆی. ٢/**النجم:** ئاوابوو.

●**غَرُبَ ١/**دوورکەوتەوە، ئاوارەبوو. ٢/**ه:** دوری خستەوە.

**غَرْب** دووری، ڕۆژئاوا، خۆرئاوا، فرمێسك، ڕۆندك، ئەسرین، قنگی چاو، قنچکی چاو، دۆڵچەی گەورە، سەرەتاو دەسپێکی هەر شتێك، توندو تیژی، چالاکی و بزێوی.

**غَرَب** تنۆكەی ئاوێك لەدۆڵچە دەكەوێتە خوارێ لە نێوان بیری ئاو وحەوزی ئاو تێكردندا، كە ئاو لە بیر هەڵدە كێشرێت تا ئاوەكە دەگەیەنرێتە ناو حەوزی ئاو خەزن كردن هەندێك دڵۆپە ئاو لە دۆڵچەكە دەتكێت بەو دڵپانە دەوترێت(**غَرَب**)، درەخت، ئاڵتون، تەلا، زیو.

**غُرُب** سەفەركەر، موسافیر.

**غَـرُب** ئاوارە، بێگانە ونامۆ، كەسێكی دوورلەنیشتمانی خۆی.

●**غَربَلَ ١/الـحَبَّ**: بـڕی، قرتاندی. ٢/**القـوم**: كوشتنی، قەتلوعامی كردن. ٣/**الحنطـة**: دای لەبێژنگ، گەنمی لەبێژنگدا.

**غِربال** بێژنگ، بێژن، هێڵەك، قەڵبێر، مۆخل، ئامێرێكی سادەی بێژانەوەیە.

**غَرْبَة** دووری.

**غُربَـة** نـامۆیی، دووری لە نیشتمان و زێدی خۆ.

**غربي** ڕۆژئاوایی، كەسێك یان شتێك یان ئاكارو زانیاری و ...هتد ی خۆرئاوایی.

**غَرِثَ** برسی بوو.

●**غَرَّثَ ١/الكلب**، سەگەكەی برسی كرد.

**غَرِث** برسی، پێچەوانەی تێر.

●**غَـرِدَ ١/الطـائر**: دەنگـی هـەڵبڕی وخوێندی.

**غَرَدَ** خوێندی، دەنگی هەڵبڕی وخوێندی.

●**غَرَّرَ ١/ت ثنية الغلام**: ددانی منداڵەكە سەری دەرهێنا. ٢/**الطائر**: باڵە تەپەی كرد بۆ هەڵفڕین.

**غَرِزَ** لە دوای یاخی بوون گوێ ڕایەڵ و فەرمانبەرداربوو.

●**غَرَّزَ ١/القدم**: وازی لە دۆشینی هێنا بۆوەی قەڵەو ببێت.

**غَرَسَ** درەختی چاند، نەمامی ناشت.

**غِـرس** ئاوری منـداڵ، شتێكەوەك چڵم وایە لەگەڵ منالدا لەسكیدایك دێتەدەر، قالاوی بچوك، قەلەڕەشی گچكە.

**غِـرس**، **غِـراس** ئـەوەی لەزەویـدا دەچێنرێت.

**غَرْس** چاندن، ناشتن.

**غِـرش** سكەیەكە یەكسانە بە(٤٠پارە) (وشەكەلەبنەڕەتدا توركیە).

●**غَرِضَ ١/منـه**: لێـی ترسا، سڵەمایەوە. ٢/**الیه**: ئارەزومەندی بوو.

●**غَرَضَ ١/فلاناً**، كردیەئامانج و نیشانە بۆتیر پێومنان، گۆشتی تازەیخوارد، بەرلەكاتی خۆی منداڵی لە شیربڕیەوە، سوعبەتی كرد، شۆخی كرد.

**غَرَض** مەبەست، ئامانج، ئەو نیشانەیەی دادەنرێت و تیریان گوللە یان هەر شتێکی تری بۆ دەهاوێژرێت، ئارەزوو، پێداویستی، بەرژەوەندی.

●**غَرَضَ ١/الشيءَ**: شکاندی بەڵام بە شێوەیەك نا کەدەربکەوێت.

●**غَرَفَ ١/الشئ**: بڕی، لەتی کرد. **٢/ الماءَ بيده**: بە مشت بردی.

**غَرف، غَرَف** هەر ڕووەکێك کە پێستەی پێ خۆش بکرێت.

**غرفَة** نەعل، کەوشی سەرپێکردن.

●**غُرِفَة ١**/ژوور، هۆدە، ئۆدە. **٢/الأكل**: ژووری نان خواردن. **٣/النوم**: ژوری نوستن. **٤/الجلوس**: ژوری دانیشتن. **٥/الضيافة**: ژوری میوان، هۆدەی میوانداری. **٦/التجارة**: ژوری بازرگانی، هۆبەی بازرگانی. **٧/الرياضة**: ژووری وەرزش.

**غُرفَة، غُرافَة** یەك مشت ئاو.

●**غَرَّقَ ١/ه**: نوقمی کرد لەئاودا.

●**غَرِقَ ١**/نوقم بوو. **٢/فلان**: قومێك شیری خواردەوە.

**غُرقَة** قومێك شیر، شەربەیەك شیر یان هەرشتێکی تر.

**غَرِلَ** خەتەنە کرا.

**غَرِل** ڕمی زۆردرێژ، نێزەیەکی زۆردرێژ کە درێژیەکەی لە سنور دەرچوبێ وناشیرین بێت.

**غَرِمَ** قەرزی دایەوە، لەبازرگانیدا زیانی کرد.

**غُرم** زەرەرو زیان، باج وسەرانە.

**غَرِن** لاواز، کەم گۆشت.

**غَرِنَ** وشك بویەوە، وشکهەڵات.

**غَرور** هەر شتێك ببێتە هۆی هەڵخەڵەتاندن، دنیا چونکە مرۆڤ هەڵدەخەڵەتێنێت.

**غُرور** هەر شتێکی پڕو پوچ و بێ هودە، هەوانتە، خۆ لێ بایی بوون.

**غَروَي** حەزکردن لە شتێك، ئارەزوومەندی لە شتێك.

**غُرّة** سپیایی پێشەوەی ئەسپ، ڕوخساری پیاو، سەرەتای هەر شتێك، بەندە، کۆیلە، شەوی یەکەمی مانگ.

**غِرّة** بێ ئاگایی، غەفڵەت، خەفڵەت، ئەو دەستەو کەسانەی هیچ ئەزمونێکیان نیە.

**غَريّ** چاك، جوان، بینای چاك، ئەپارتمانی چاك و جوان.

**غَريب** هەرکەسێکی دوور لە زێدو نیشتمانی خۆی، نامۆ، بێگانە،

سەیروسەمەرە، هەر شتێکی مایەی سەر سوڕمان.

**غرِّيد** مەلی دەنگ خۆش.

**غَرير** گەنجی بێ ئەزمون، خۆ لێ بایی بوو.

**غريزة** غەریزە، سروشت، حەزوخەسڵەتە سروشتی وزگماکیەکانی ئادەمیزادو ئاژەڵ.

**غريزي** سروشتی، هەر هەست و سۆزێ یان هاندەرو پاڵنەرێك کە بەسروشت لەمرۆڤدا هەبێت.

**غَرِيسة** دارخورمالەسەرەتای سەوزبون ودەرهاتنیدا، ئەوتۆوەی دەچێنرێت.

**غَريض** ئاوی باران، هەرشتێکی سپی و تازە.

**غريق** نقومبووگ لەئاودا، گرفتار.

**غَريم** قەرزدەر، قەرزدار، قەرزار، دژ، دژ من.

**غَرِين** ئەوقوڕولیتاوەی زریان دەی هێنێت ودوایی قوڕەکەی بەتەڕی یان بەوشکی لەسەر زەوی دەمێنێتەوە، گەمژەیی، نادانی.

**غُزّ** ڕەگەزێکی تورکن.

**غَزّ** ١/**هـ** دەرزی پێداچەقاند، دەرزی ئاژنی کرد.

●**غَزا** ١/پەلاماردان، هێرشی برد. ٢/**القوم** شاڵاوی کردەسەریان.

**غَزارة** زۆری وزەوەندی.

**غَزّار** قامیشێکە قەڵەمی لێ دروست دەکەن.

**غزال** ئاسك، ئاهو، مامز.

**غزالَة** ئاسکی مێینە.

**غَزَلَ** خوری ڕست، خوری ڕێسا.

**غَزِلَ** ژنی دواند، تاریفی ژنی کرد.

**غَزْل** خوری ڕستن، خوری ڕێسان.

**غَزَل** ڕابواردن لەگەڵ ژناندا، یاری وگاڵتەو دەستبازی لەگەڵ ژناندا.

**غَزِل** کەسێك لەگەڵ ژندا ڕابوێرێت وعەشقبازی بکات.

**غَزْوَة** غەزا، جەنگ وهێرش بردن.

**غَزِير** زۆر لەهەرشتێك.

**غَزِيرَة** چاوی پڕلەفرمێسك، کانی وبیری پڕلە ئاو، وشترێ شیری زۆربێت.

**غُس** پیاوی لاوازو سست.

**غَسَاق، غَسّاق** سارد، بۆگەن.

**غَسّال** مردو شۆر، جلو پۆشاك یان شۆرەری هەر شتێکی تر.

**غَسّالة** ئامێرێکە بۆشۆردنی جلك بەکاردێت، جل شۆر.

**غُسَالة** ئەوپۆشاکەی دەشۆردرێت.

**غَسَّان** هەرِمتی لاویەتی.

**غَسَقْ** تاریکی سەرەتای شەو.

**غَسَلَ** شۆردی، پاکی کردەوە، شوشتی، پاکژی کردەوە.

●**غَسَلَ ١/الشَيء** زیادەرِەوی کرد لەشۆردنیدا.

**غُسْل، غِسل** ئاو وسابون، هەرچیەك شتی پێ بشۆردرێت.

**غَسل** شۆردن، شوشتن، پاکژکردنەوە بە ئاو وسابون و ...هتد.

**غَسَم** تاریکی، رەشایی.

**غُسم** پەڵە هەور لەئاسماندا.

●**غَسَمَ ١/اللیلُ** تاریك داهات، تاریك بوو.

**غَسو** تاریکی.

**غَسوة** کەنار، لێوار.

**غَسیل** شۆردراو، شۆرپاک.

●**غَشَّ ١/هُ** ئەوەی لە دڵیدا بوو لێی شاردەوە وبەزمان شتێکی تری پێ گوت، فریویدا، خەڵەتاندی، غەشی لێکردوو دەستی بری.

**غِشّ** کینە، رِق، دڵ رەشی، ناپاکی وغەش، فێڵ، فریو.

**غُشّ** برێتیە لە کەسێك غەش وناپاکی لەخەڵکی بکات.

**غَشّ** غەش، ساختەچێتی و دەست برِین، حیلەی بازی.

**غِشاء** پەردە، هەرچییەك شتی پێ داپۆشرێت، پێستی ناسك.

**غِشاوة** پەردە.

●**غَشَمَ ١/**ستەمی کرد، بێدادی کرد. **٢/الحاطِبُ** داربرِەکە بە شەو دار کاری کرد و هەردارێك کە توانی بوی بیبرِێت بێ ئەوەی سەیری بکات و بیری لێ بکاتەوە بریبونی، خۆبەسەر کاری کرد.

**غُشوَة** سەرپۆش، پەردە.

●**غَشِيَ ١/هُ** بەقامچی لێیدا. **٢/اللیلُ** سەراسەرتاریك داهات.

**غَشْي** بێ هۆشی، لە کارکەوتنی مرۆڤ و هێزە کاریگەرەکانی جەستەی بەهۆی لاوازی دڵ یان برسێتیەوە.

●**غُشِيَ ١/علیه** لە هۆش خۆی چوو.

●**غَشّی ١/الشيءَ** سەرانسەر داپۆشی، بە تەواوی دای پۆشی.

**غَشیم** بەردێك نوسراو یان نەخشەی لەسەر هەڵنەکەنرابێت، هەرزەکار، برێتی لەکەسێك هیچ ئەزمونێکی نەبێت.

**غَشیَة** بێ هۆشی، ئاگا لەخۆنەمان.

●**غَصَّ ١/**خواردن یان ئاو لە گەرووی گیراو ڕێگەی هەناسەدانی لێگرت.
**٢/الشیءَ:** بڕیی، لەتی کرد.
**غَصَبَ** داگیری کرد، بە تۆپزی دەستی بەسەردا گرت.
**غَصب** داگیر کردن، بە زۆر دەست بەسەردا گرتن، هەرشتێك بەزۆر داگیر کرابێت.
**غَصباً** بە زۆر، بە تۆپزی، بە ناچاری.
**غَصَنَ** پەل و پۆی درەختەکەی بڕی.
**غَصَّنَ** دەنکۆڵەکانی هێشووی ترێ گەورە بوون.
**غُصن** پەل و پۆی دروەخت.
**غُصّة** دڵ تەنگی، خەم و خەفەت.
**غَضَّ** کەمی کرد، چاوی داخست.
**غَضّ** نەرم و نۆڵ، ناسك، چاوپۆشی، گۆڵکی تازە بووگ.
**غضارة** نیعمەت و فەرِو ژیان و خۆشی، گوزەرانی خۆش.
**غَضب** گا، نێرەی چێڵ، شێری بێشەو جەنگەڵ، زۆر سور.
**غَضَب** تورەیی، قین، ڕق و خەشم.
**غَضِب، غضبان** تورە، ڕق هەستاو، قین داهاتوو.
**غَضِبَ** تورەبوو، قینی دا هات، ڕقی هەستا.
●**غَضَرَ ١/الرجلَ:** حەپسی کرد.
**٢/الشیءَ:** بڕیی، لەتی کرد.
**غَضِرَ** ماڵ وسامانی زۆربوو، ژیان و گوزەرانی خۆش بوو.
●**غَضَفَ ١/العودَ:** شکاندی.
●**غَضَفَ ١/اللیلُ:** تاریك داهات، تاریك ونوتەك بوو.
●**غَضَّنَ ١/تِ السماءُ:** بارانەکەی بەردەوام بوو.
●**غَضَنَ ١/تِ الناقةُ:** سکەکەیی بەناکامڵی خست، بەری خست.
**غَضن، غَضَن** زەحمەت، دەردی سەری، نارەحەتی، سەختی، ڕەنج، هیلاکی وئەشکەنجە.
**غَضَنْفَر** شێری بێشە وجەنگەڵ.
**غُضّة** کەمی و ناتەواوی.
●**غَضَی ١/عَضواً:** لە حاڵ وگوزەرانی چاك وخۆشدا بوو.
**غضي** بێشەو جەنگەڵ.
**غَضیر** نەرم و ناسك، سەوز لە هەرشتێك.
**غَطَّ** نقومی کرد لە ئاودا، کردی بە ئاودا.

●**غَطَا ١/الشيءَ:** دای پۆشی. ٢/**الماءُ:** بەرزبویەوە. ٣/**الليلُ:** تاریکاییەکی هەموو شتێکی داپۆشی.

**غَطّاس** بریتیە لەکەسێك خۆی نقوم دەکات بە قوڵایی ئاودا، ناوی باڵندیەکی مل درێژە.

**غُطاش** تاریکی شەو، تاریکایی شەو.

**غُطاط، غَطاط** بەرەبەیان، سەرەتای بەیانی، پاشماوەیتاریکی شەو لە بەرەبەیان دا، تاریکی دەمو بەیان.

**غِطاء** پەردە، سەرپۆش.

●**غَطْرَسَ ١/على فلانٍ:** خۆی بەسەردا بادا، کەش و فشی بەسەردا کرد. ٢/**ه:** تورەی کرد، قینی داهێنا، رقی هەستان.

●**غَطَسَ ١/في الماء:** خۆی نقوم کرد بە ژێر ئاودا.

●**غَطَشَ ١/الليلُ:** تاریك بوو، تاریك داهات.

**غَطِفَ** موی برژانگەکانی درێژ بوون و بەهۆی درێژیيانەوە لول لێی وەستان.

**غِطَمّ** دەریای گەورە، زەریا، ئۆقیانووس، گرۆهـ وکۆمەڵێکی زۆر.

●**غَطَى، غَطَّى ١/الشيءَ:** شاردیەوە، داپۆشی.

●**غَفَّ ١/** غافڵگیری کرد. ٢/**الطائرُ:** کەوت.

**غَفَّ** گەڵای وشك.

**غَفّار** زۆر بەخشندە، ناوێکە لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە.

**غَفا، غَفَى** سەرخەوی شکاند، سوکە خەوی کرد.

●**غَفَرَ ١/له:** گوناه و وتاوانی بۆ پۆشی، لە گوناه و توانی ئەو خۆش بوو و بەخشی. ٢/**الأمرَ:** رێکو پێکی کرد. ٣/**الشيءَ:** داپۆشی، پەردەی بەسەردا دا.

**غَفر** کوێرەکە، گۆلك، بێچوی چێڵ.

**غُفران، غَفير** لێ بوردن، لێ خۆش بوون، داپۆشینی گوناه و تاوان.

●**غَفَّرَ ١/الشيءَ:** داپۆشی، شاردیەوە. ٢/**الرجلَ:** پێی گوت(خوا لێی ببورێت)، داوای لێ بوردنی لەخوا بۆ کرد.

**غَفَّقَ** بە چاو خەوت و بەدڵ وریا بوو، بە چاو خەوتبوو بەڵام گوێی لە قسەکانی کەسانی دەورو پشتی خۆی بوو.

**غَفَق** بارانی سست و وردو لاواز.

●**غَفَقَ ١/عليه:** هێرشی کردە سەری. ٢/**ه:** زۆری لێدا بەشەلاق.

●**غَفَّلَ ١/هـ**: بێ ئاگا وغافڵی کرد.
**٢/الشيءَ**: شاردیەوە ودایپۆشی.
●**غَفَلَ ١/عنه**: فەرامۆشی کرد، وازی لێ هێنا. **٢/الشيءَ**: شاردیەوە ودایپۆشی.
**غُفْل** هۆنراوەیەك نەزانرێت هۆزانڤانەکەی کێ بووە، زەوی یەك بیناو عیمارەی تیا نەبێت، پەرتوکێك ناوی دانەرەکەی لە سەر نەنوسرابێت، نەناسراو، نەزانراو، کەسێکی بێ نەژادو و نەسەب، کاغەزی سپی.
**غَفَل** خۆش گوزەرانی، ژیانی گوشاد، بێ ئاگایی.
**غَفلَة** غەفلەت، بێ ئاگایی.
**غَفوَة** خەوێکی سوك، سەرخەو.
**غُفَّة** بژێوی ڕۆژانە، قوتیڕۆژانە، پاشماوەی ناوقاپ یان پاشماوەی ناو گوان.
**غَفير** موی گەردن، موی ڕوخسار، پاسەوان.
●**غَقَّ ١/الصقرُ**: دەنگی هەڵبڕی، دەنگی لێوە هات.
●**غَلَّ ١/هـ**: کۆتی کردەملی یان دەستی، خیانەت وناپاکی کرد.
**غُلَّ** تینویەتی زۆری بۆهێنا، زۆری تینو بوو.
**غَلا** بڵندبویەوەو گران بوو، نرخ بەرزبویەوە.
**غَلاء** گرانی، بەرز بونەوەی نرخ.
●**غِلاف ١**/پەردە، ڕوپۆشی هەرشتێك.
**٢/الجويّ**: ڕوپۆشی هەوای دەوری گۆی زەمین، بەرگە هەواییەکەی زەوی.
**غُلام** منداڵ، مناڵ، بەندە، کۆیلە، خزمەتکار، نۆکەر، بەکرێ گیراو.
**غُلامَة** کچۆڵە، کەنیزەك.
**غِلّ** کینەو بوغز، ڕق وناپاکی وغەش.
**غُلّ** کۆتی ئاسن، کۆتێ دەکرێتە گەردن یان مل، تینوێتی، دوشمنی، پێوەندی لە ئاسن دروستکریاگ.
**غَلِبَ** ملی ئەستوروبەهێزو زل بوو.
**غَلَبَ** سەرکەوت، زاڵ بوو.
●**غَلَّبَ ١/هـ**: سەری خست، زاڵی کرد.
**غَلَب** سەرکەوتن، زاڵبوون، زاڵێتی.
**غَلَتَ** کڕین یان فرۆشتنی هەڵوەشاندەوەوپوچەڵی کردەوە.
**غَلِتَ** لەحساب کردن و ژمارەدا هەڵەی کرد.
**غُلتَة** هەڵە.
**غَلتَة** سەرەتای شەو، دەستپێکی شەو.
**غَلَثَ** شتێکی تێکەڵاوی شتێکی ترکرد.

**غَلَث** نەوخۆڵ و كاو شتانەی تر كە تێكەڵاوی گەنم دەبن.
**غَلِث** شێت، دێوانە، برێتی لە پیاوێك بەسەختی بجەنگێت.
**غَلَثَ** بە توندو سەختی شەڕی كرد.
● **غَلَجَ ١/الفرس:** بەڕێكوپێكی و یەكسانی ڕۆشت.
**غُلُج** گەنجی قۆز، لاوی جوان.
**غَلَّسَ** لە تاریكی كۆتایی شەودا ڕێی كرد، شەو ڕەویی كرد، بە تاریكی كۆتایی شەودا ڕۆیشت.
**غَلَس** تاریكی كۆتایی شەو.
**غَلِطَ** هەڵەی كرد.
**غَلَط** هەڵە، پێچەوانەی ڕاست و دروست.
**غَلَظَ، غَلُظَ** توندو تۆڵ و قەوی و قۆڵ بوو.
● **غَلَّظَ ١/اليمين:** سوێندەكەی پشتڕاست و دووپات كردەوە.
**غَلَظ** زەوی ڕەقەڵان.
**غِلْظَة** توندو تیژی، دڵ ڕەقێتی.
● **غَلَفَ، غَلَّفَ ١/الشيء:** خستیە ناو پاكەتەوە، پێچایەوە، دایپۆشی.
**غَلِفَ** بەخەتەنە نەكراوی مایەوە.
**غُلْفَة** ئەوپێستەی خەتەنەكەر دەیبڕێت.

**غَلَف** دارێكە پێستەی پێ خۆشەدەكرێت.
**غَلِقَ** خوڕەوشتی تێك چوو، ئاكاری بەدبوو.
**غَلَق** قوفڵ یان هەرشتێك دەرگای پێ دابخرێت، دەرگای گەورە.
● **غَلَّقَ ١/الباب:** بەتوندی دایخست، قایمی كرد.
**غَلَقَ** داخستن، بەستن، قایمكردن.
● **غَلَقَ ١/الباب:** دەرگاكەی داخست.
**غَلِق** هەرقسە ودەستەواژەیەك ناڕەحەت مرۆ لێی بگات.
**غُلُق** دەرگای داخراو.
**غَلِمَ** ئارەزووپەرست بوو، شەهوەتبازبوو.
**غُلْمَة** شەهوەت.
**غُلُو** زیادەڕەوی، زیادڕۆچون.
**غُلُومَة** هەوەس وئارەزووی سێكسی، منداڵێتی.
**غُلَّة** تینوێتی سەخت، تینوێتی.
**غَلَّة** بەروبوم، داهاتی ماڵ.
● **غَلَى ١/**كوڵاندی، قۆری یان قازانی هێنایە كوڵ. **٢/الرجل:** لەدوورەوە سڵاوی كرد.
**غَلِيَ** نرخ گران، پربەها.
**غَلَى** كوڵا، هاتە كوڵ.

**غَلیث** گەنم وجۆ بەتێکەڵی، گەنمێك گلّمتك وكای تێکەڵ بێت.

**غَلیظ** ڕەق، توندوتۆڵ، گەورەوزل، بێبەزەیی، بێ ڕەحم ودڵ ڕەق.

**غلیل** کەسێك زۆرتینوی بێت، تینوێتی سەخت، گەرمی خۆشەویستی یان خەمو پەژارە.

●**غَمَّ ١/ه** خەمو پەژارەی پێدا، خەفەتباریکرد، دایپۆشی.

**غَمارة** نەزانی و نادانی، نەفامی و نەبوونی پسپۆڕی وشارەزایەتی.

**غَمَازة** کیژی بە غەمزەو ناز، کچۆڵەی جوانی بە غەمزەو ناز.

●**غَما ١/البیت** سەری خانووەکەی بە گڵ ودار گرت.

**غَمام** هەور، عەور، مژی زۆر بەرزەوە بوگ کەبارانی لێ دەرژێتە خوار.

**غُمام** نەلامەت، هەلامەت.

**غُمامَة** دەم بەند، لغاو، برێتیە لە دەمبەسێك کە دەمی ئەسپ و سەگ و هتد.. پێ شەتەك دەدەن بۆ وەی شت نەخوات یان نەگەزێت.

**غَمامَة** پەڵەیەك عەور، هەوری سپی.

**غِماء** سەقفی خانوو، بانی ماڵ.

●**غَمَتَ ١/**خواردنەکە لە سەردڵی گران بوو وەك سەرخۆشی لێکرد. **٢/الشيء**، دایپۆشی.

**غَمَجَ** قوم قوم ئاوی خواردەوە.

●**غَمَدَ ١/**شمشێری خستە ناو کێلانەوە. **٢/الشيء**، دایپۆشی. **٢/الأمر**، ڕێکو پێکی کرد، چاکی کرد.

**غِمد** کێلانی شمشێر، کالانی شمشێر، کافلان، بەرگی شمشێرو کارد.

**غَمُرَ** زۆربوو، کەمژەو نادان بوو.

**غِمر** قین، کینە ورق.

**غَمر** چەور، بەزدار، پیودار، برێتی لەهەر شتێکی چەور.

**غَمر** ئاوێکی زۆر، پۆشاکی درێژ، فراوان، پیاوی دڵ فراوانی بە ڕەوشت.

**غَمَر** نادان، نەفام، کەسێك شتێك تاقی نەکاتەوە، کینەو ڕق.

**غُمر** زەعفەران، نادان، نەفام، کەسێك شت تاقی نەکاتەوە، بێ ئەزموون.

●**غَمَرَ ١/ت یده** چەوری گۆشتی پێوەلکا، چەوری گۆشتی تێوەچوو.

**غَمْرَة** سەختی، نارەحەتی و ڕەنج، زەعفەران.

**غَمَزَ** بەچاو یان بەبرۆ ئیشارەتی کرد.

**غَمَـز** پیاوی لاوازو سست، ماڵی خراپ، چوارپێ وئاژەڵی لەڕوبێ فەڕ.

**غَمز** ئیشارەت بەچاو وبرۆ.

**غَمس** نقوم بوون.

●**غَمَسَ ١**/کردی بە ئاودا، لە ئاودا نقومی کرد. **٢/النجمُ:** ئاوابوو.

●**غَمَّسَ ١/هُ:** بەتوندی کردی بەئاودا. **٢/الشربَ:** کەمی کردەوە.

**غَمَشَ** لەبەر برسێتی چاوی کزبوو، چاوی کزبوو زۆر جاریش ئاوی پێدا هاتەخوارێ.

●**غَمَصَ ١/هُ:** بەسوك وکەم سەیری کرد، بە بێ ئەرزش دایە قەڵەم. **٢/النعمةَ:** سوپاسگوزار نەبوو لەبەرانبەر ئەو نیعمەتەی خودا پێی دابوو.

**غَمَص** ڕیپۆقی چاو، چڵکی چاو، ڕیپۆك، چڵکێکی سپیە لە ڕێڕەوی فرمێسکدا.

**غَمِصَ** ڕیپۆق لە چاوی هاتە دەرێ، چڵکی سپی چاوی هاتەدەرێ.

●**غَمَّضَ ١/الکلامَ:** قسەکەی شاردەوە، قسەکەی بەپێچ وپەناوتەمومژەوە کرد. **٢/عینَهُ:** چاوی داخست، پێڵوەکانی چاوی نابەیەکدا.

●**غَمَّضَ ١/السیفَ:** شمشێرەکە لەناو گۆشتدا ون بوو. **٢/عنهُ:** لە کڕین و فرۆشتندا چاوپۆشی لێکرد.

**غُمْض، غِماض** خەو، داخستن ولێکنانی پێڵوەکانی چاو.

**غَمَطَ** بە کەم وسوك سەیری کرد.

●**غَمطَ ١/النبیحة:** سەری بڕی.

**غُمَّة** دڵ تەنگی و نارەحەتی، داپۆشەر.

●**غَمَقَ ١/المکانُ:** ئاونگ وشێی لەسەر نیشت.

**غَمِقَ** شێداربوو، تەڕ ونمناك بوو.

●**غَمَّلَ ١**/داپۆشی، ڕێکوپێکی کرد. **٢/فلاناً:** داپوشی بۆ ئەوەی ئارەق بکاتەوە.

**غَمِلَ** زامەکە بۆگەن بوو.

**غَمْلَج** بەکەسێك دەوترێت لەسەر حاڵێك ڕاوەستاونەبێت، ڕاڕا، نابەرقەرار لەسەر بارێك.

●**غمن ١**/داپۆشی. **٢/البُسرَ:** داپۆشی بۆ ئەوەی پێ بگات. **٣/فلاناً:** جلکەکانی خۆی بەسەردا دا بۆ ئەوەی ئارەق بکات.

**غَموس** پیاوی ئازاو دلێر، هەرشتێکی خەفەت ئەنگێز.

**غَموص** درۆزن، زۆر درۆزن، ناڕاستگۆ.

**غُمــــوض** نــــارِونێتی، تەمومــــژداری، پێچوپەنا.
**غُمُوضَة** لەکەو ناتەواویی، عەیب وعار.
**غَمَى** هەر شتێك ئەسپی پێ داپۆشرێت بۆ وەی ئارەق بکاتەوە.
**غَمِيَ** غەشی کرد.
**غَمِي** بێهۆش، هەوری تەنك.
**غَمِيــــز** عــەیبێ خاوەنەکــەیی پێــوە بناسرێت.
**غميزة** لاوازی لەئەقڵ و ئاوەزو فامدا.
**غميس** تاریکایی، شەوی تاریك.
**غميق** قوڵ، پێچەوانەی تەنك.
**غناج** دوکەڵ، دوکەری دوگ وپیو.
**غَناظ** خەم وخەفەت.
**غنام** شڤانی پەزگەل، شوانی مێگەل.
**غنان** گیزەی مێش.
**غَناء** سود، فایدە، قازانج.
**غنــاء** گـورانی، سـتران، قـامو بەسـتەك، لاوك.
**غَنثَ** ئاوی خواردەوە ئینجا هەناسەیدا.
**غَنِجَ** نازو عیشوەی کرد.
**غَنَج** پیری بە ساڵدا چوگ، پیری کۆنـە ساڵ.
**غُنْج** نازو عیشوە.

**غُنْدَر** منـداڵی قەڵەو، نـەوجوانی قەڵـەو وگۆشتن.
**غَنْدَرَة** بـە ڕێـدا ڕۆیـشتنێك کەشـوفش وغەمزە ونازی تێدا بێت.
**غَــنِصَ** ســنگی هاتــەوە یــەك، ســنگی تەسکبوویەوە لەبەر هەرشتێك.
● **غَـنَطَ ١/الأمرُ فلانـاً:** نارِەحـەتی کـرد، بەزەحمەتی برد.
**غَنْظ، غَنَظ** خەم وخەفەتی سەخت.
**غَنَم** پەز، مەڕ، مێ.
**غَنِمَ** دەست کەوتی گـرت، غەنیمـەتی لـە شەڕدا دەستکەوت.
● **غَنَّمَ ١/ه كذا:** پـتر لەبەشـی خـۆیی پـێ بەخشی، بەخشی.
**غُنم** تاراج، دەستکەوتی لە شـەڕدا گـیراو، غەنیمەت.
**غُنَّة** مینگە، دەنگێکە لـە لوتـدا دروست دەکرێت.
● **غَنِيَ ١/**خاوەن سامان ودەوڵەمەند بوو. **٢/بالشيء:** کومسایی پێ هـات. **٣/بالمكان:** تیایدا مایەوە ونیشتەجێ بوو. **٤/الرجلُ:** ژنی هێنا.
**غَنَّى** گۆرانی گوت، لاوکی بێـژا، سـترانی وت.

**غَنِيّ** دەوڵەمەند، زەنگین، خاوەن ماڵ وسامان، بێ دەربەست.
**غَنیمة** دەستکەوتی لە شەڕدا گیراو، غەنیمەت، دەستکەوت بەگشتی.
**غَوِ** گومڕا، سەرلێ شێواو، ئارەزوو پەرست.
**غُواث** کۆمەك، یارمەتی.
**غَوّاص** کەسێك بچێتە ژێر دەریا، بریتیە لەو کەسەی بەدوای مرواریدا دەگەڕێت لەقولاییەکانی دەریادا.
**غَوّاصَة** کەشتی جەنگی گچکە کە بەژێر دەریادا دەڕوات، ژێردەریایی.
**غَوْث** پیاوەکە گوتی (**واغوثاه** — فریام کەون).
**غَوْث** کۆمەك، یارمەتی، پشتگیری.
**غَوْج** ئەسپی سینە پان.
**غَوْر** ئەشکەوت، قولایی وبنی هەرشتێك، زەوی نشێو.
● **غَوَّرَ ١/القوم:** شکستی پێ هێنان. **٢/ت الشمسُ:** ئاوابوو. **٣/الرجلُ:** لەنیوەڕۆدا خەوت، بە ڕۆژدا نوست.
**غَـوْرَة** هەتاو، خۆر، هۆر، ڕۆ، ڕۆژی عاسمان، خەوتن بەنیوەڕۆدا، خەوی نیوەڕوان.
**غَوْرِی** بنکی هەرشتێك، نزمترین ئاستی قولایی لەهەرشتێکدا.
**غَـوْص** چویە ژێر ئاوەوە، خۆی کرد بەژێر ئاودا.
**غَـوص** خۆکردن بەژێر ئاودا، خۆنقومکردن لەناو ئاودا.
● **غَـوَّطَ ١/البئرَ:** بیرەکەی هەڵکەندو بنکەکەیی دوورخستەوەو قوڵتری کرد، قوڵی کرد. **٢/ الطعامَ:** کردیە پاروی زلزل.
**غَوْطَـة** هەرجێگەیێك ئاو ودرەختی زۆربێت.
**غَوْغَـاء** خەڵکی تێکەڵ وپێکەڵ وقەرەباڵغ، کوللە لەکاتێکدا باڵی دەردێت، خەڵکی هەرچی وپەرچی وپەلەپەل کەربۆ خراپە.
**غَوغَـة** هەیاهۆ، جۆش وخرۆش، قیژوهوڕ.
**غَـوْل** سەریەشە، مەستی، سەرخۆشی، ئاوەز لەسەردا نەمان، ناڕەحەتی و ڕەنج، خۆڵ وخاکێکی زۆر.
**غُـوْل** بەلا، تیاچون، غۆل، ئاژەڵێکی ئەفسانەییە.
**غَوهَق** دێوانەیی، شێتێتی.
**غَوِی** گومڕابوو، سەری لێ شێوا، سەری لێ شێویا، تیاچوو، لەناوچوو.

**غَوِيطَة** بيرى قوولّ، بيرێك قولّ بێت وبنكەكەى دوور بێت.

**غَهَبَ** لەبيرى چويەوە، فەراموٚشى كرد، لەبيرى كرد، پشت گوێى خست.

**غَهَبَ** بیٚ مەبەست، بیٚ نياز، لەبيرچوون وفەراموٚش كردن وبیٚ ئاگايى.

**غَهَق** وشترى درێژ.

**غَيّ** گومڕايى، سەرلیٚ شێوان.

**غَيّة** گومڕايى، سەر لیٚ شێوان، تاوان، هەلّە، خەتا، كەتن.

**غَيّا** ئالاّى چەقاند، پەرچەم و بەيداخى هەلّكرد.

**غَيَاب** گۆڕ، قەور، قەبر، گلكۆ، ئارامگە.

**غِياب** نا ئامادەيى، ئامادەنەبوون.

**غِيَاظ** خەم وخەفەت، نارەحەتى و ميحنەت، ڕەنج وئازار.

**غَيَّاف** پياوێك ڕدێنى زۆر درێژ بوبێت.

**غَيَال** شێرى بێشە وجەنگەلّ.

**غَيَايَة** بنكى چالّ و بير، هەرچيەك سێبەر بكات بەسەر ئادەميزاددا وەك هەور وتەم، تيشكى خۆر، ڕۆشنايى تيشكى خۆر.

● **غَيَّبَ** ١/هـ دوورى خستەوە.

**غَيب** گومان، دوو دلّى، هەر چيەك لە تۆپەنهان بێت، ناديار، نهێنى.

**غَيْبوبَة** بیٚ هۆشى، ئاگا لەخۆ نەمان، خۆر ئاوابوون.

**غَيْبَة** قەور، گۆڕ.

**غِيبَة** يادكردنى كەسێك لە پاشملە بەخراپى، بەخراپ باسكردنى كەسێك لە پاشملە واتەلە كاتێكدا خۆى ئامادەنيە.

**غَيْث** باران، واران، ئاوێ كەبەدلۆپە لەهەورانەوە دادەڕژێ، ڕوەكێك بە ئاڤى واران سەوز بێت.

**غَيِّث** هەورێك بارانى زۆر بێت.

● **غَيِدَ** ١/الغلام ملى لار بوو، گەردنى خوار بوو.

**غَيَد** نەرم و نۆلّيى، ناسكى.

**غَيداق** پياوى جوانمەرد، بەخشندە، ئەسپى بالاّ درێژ.

**غَيْدان** سەرەتاى لاوێتى، دەسپێكى گەنجێتى.

● **غَيّر** ١/الشيء گۆڕى، ئالّو گۆڕى كرد.

**غَير** بێجگە، جگە.

**غَيض** كۆرپەى بە ناكاملّى لە دايك بووگ، كەم، كەمێك.

**غَيضَة** جەنگەلّ، درەختى زۆر لەجێگەيەكى ئاودار دا.

**غَيط** بێستان، باخ، ڕەز، باغ.

**غَيْظ** رق، قین و ئەوپەڕی تورەیی، زۆر تورەیی، سەرەتای تورەبوون.
**غَيْف** گروپ و دەستەیەك باڵندە.
●**غَيَّقَ** ١/خراپی کرد. ٢/**في رايه**: تێکەڵ و پێکەڵ بوو لەسەر رایەك نەوەستا.
**غَيْل** منداڵی قەڵەو، ئاوێك بە سەرزەوی دا بڕوات، هەر دۆڵ وشیوێك چاوگی ئاوی تێدابێت ولە بەری بڕوات، هەرچیەك تۆ بە نزیك بێتە بەرچاوت بەڵام ئەو دوربێت، ئەو شیرەی ئافرەتی سكپڕ دەیدات بە منداڵ، شیرێك ئافرەتی سكپڕ بیدات بەمناڵێکی تر نەك منداڵی خۆی.
**غِيْل** بێشەو جەنگەڵی شێر، درەختی پێکدا هەڵچوک، درەختی پێکدا پێچراو، هەر شیوێك ئاو و کانی تێدا بێت.
**غِيْلَة** شیردان بە منداڵ لە کاتی سکپڕی ئافرەتەکەدا، فێڵ وفڕ.
**غِيلَة** کوشتن و لە ناوبردنی بێ ئاگایی وبە فێڵ، کوشتن بەحیزەفێڵ.
**غَيلَة** ژنی قەڵەو.
**غَيْم** هەور، عەور، مژی بەرزەوە بوگ بۆ ئاسمان، تینوێتی.
**غَيمان** تینوو، وشترێك لە تینوێتیدا هەناوی گەرم بوبێت.
**غَيْمة** پەڵە هەور.
●**غِيْنَ** ١/**ت السماء**: هەور بەری ئاسمانی گرت.
**غَيْن** تینوێتی، پیتێکی هیجایە.
**غَيْنَة** درەختی بە بێ ئاو هەڵچوک.
**غَيُور** پیاوێ دڵی پیس بێت لە ژنەکەی، بە غیرەت، غیرەتمەند.

**فاء** گەڕایەوە، گەڕایەوە دواوە.

**فئام** گرۆهو کۆمەڵی خەڵك.

**فُئِدَ** دەردەدڵی گرت، دڵی ئێشی کرد.

**فَئَد** گۆشتی برژاند لەئاگردا.

**فِئَة** گرۆ، دەستە، کۆمەڵ، نرخ.

**فِئَة، فِيَّة** نرخ، بەها، قیمەت، دەستە، گرۆ.

**فَئِيد** ئاگر، ترسنۆك، برژاو.

**فائِدَة** سود، قازانج، کەڵك، میوە.

**فائِجة** کۆمەڵ، دەستە، گروپ، تەختایی نێوان دوو بەرزایی.

**فائِز** سەرکەوتوو، ڕزگاربوو.

**فائِض** زۆر، زیادلەپێویست، ڕەوان، ئاوی لەبەر ڕۆیشتوو.

**فائِق** هەرشتێك لە جۆر ونەوعیەتیدا چاك و پاڵفتە بێت، چاتر، باڵاتر.

●**فاتَ** ١/لەدەست چوو، لەدەست دەرچوو، تێپەڕی، گوزەری کرد، کاتی کردنی بەسەرچوو. ٢/**ه فلانٌ في كذا:** فلان کەس لە فلان شتدا پێشی ئەوکەوت. ٣/**الشيءَ:** تێی پەڕاند، لەدەستیدا، لەدەست خۆی دەرکرد. ٤/**تهُ الفرصةُ:** هەلی لەدەست چوو. ٥/**ه القطارُ:** شەمەندەفەرەکەی لە دەست دەرچوو، بەشەمەندەفەرەکە نەگەیی.

●**فاتَحَ** ١/دەستی بەقسەکردن وگفتوگۆکرد، دەرگای قسەو باسی کردەوە. ٢/**البيعَ:** ئاسانی کرد، ئاسانکاریی تێدا کرد.

**فاتِح** ڕەنگ ڕۆشن، کەسێك براوە بێت لەشەڕدا، یەکلاکەرەوەی شەڕوجەنگ

**فاتِحة** سەرەتاو دەستپێکی هەر شتێك، ناوی یەکەمین سورەتی قورئانی پیرۆز.

**فاتِر** نیو گەرم، شلەتێن.

**فاتِك** ئازاوچاو نەترس، بوێرو گوستاخ.

**فاتُورة** فاکتۆر، بریتیە لەلیستێك کەلەگەڵ کەلوپەلدا دەنێردرێت ونرخ وبڕی کەلوپەلەکەی تێدا تۆمار دەکرێت.

**فاجِر** پیاوی داوێن پیس، جادوگەر.

**فاجِرة** ژنی گاندەر، ژنی داوێن پیس، سوێندی درۆ.

**فاجِعة** خورپەو پێشهاتی سەخت وموسیبەت کە بەسەر مرۆدا دێت.

**فاجِل** قومارباز.

**فاجور** زیناکەر، داوێن پیس، شەرواڵ پیس.

●**فاحَ** ١/**المسكُ:** بۆن وبەرامی بڵاوبویەوە. ٢/**تِ القدرُ:** کوڵا، هاتە کوڵ.

**فاحِش** زۆر چاوچنۆك و بەخیل، هەرکارێکی ناشیرین و قێزەون.

**فاحِشة** گانی حەرام، زینا، گوناهی زۆر ناشیرین، ژنی خراپەکارو داوێن پیس.

●**فــاحَصَ ١/هـ** هەریــەکیان ناتــەواوی یەکیان پشکنی وبەدوی عەیبەی یەکتردا گەڕان.

**فــاحِم** ڕەش، نــاوی مــەنگی لەبــەر نەڕۆیشتوو.

**فاخِتَــة** جــۆرە کــۆترێکی جــوان و نەخشینە.

**فــاخِر** قەشــەنگ، هــەر شــتێکی چــاك وجوان.

**فــاخورة** کارگــەی سـفالگەری، کارخانــەی دروســت کردنــی کــەلو پــەل لــەقوڕی سورەوە کراو.

**فاخوريّ** فرۆشیار یان دروستکەری کەلو پەلی لەقوڕی سورەکراو دروستکراو.

**فاد** بەکەسێك دەگوترێت بەماڵی خۆی دیلێك لەبەندی ئازاد بکات، ڕزگارکەر.

**فادِح** سەنگین و گران لەسەر شانی مرۆڤ وەك قەرزێکی زۆرقورس.

**فادِر** گۆشتی لێنراوی ساردەوەبوو.

**فــادِن** شـاوڵی وەستای دیـوار دروسـتکەر، شـاوڵ، ئـامێرێکی سـادەیە وەسـتای دیـوار ڕێکــی ونــاڕێکی دیوارەکــەی پــێ تاقیدەکاتەوە.

**فــار** مـشك، جانـەوەرێکی چـکۆڵەی گـوێ قوتە لـە مـاڵان ولەمـەزرادا کـون دروسـت دەکــات زۆر زیــان بــە ڕســقی خــەڵك دەگەیەنێ وڕەنگی ڕەشبۆزە.

●**فارَ ١/تِ القدرُ:** مەنجەڵەکە هاتە کوڵ و ئەوەی تیایدا بـوو هەڵچوو. ٢/**المسكُ:** بۆنی بڵاوبوویەوە.

**فارّ** ڕاکردوو، هەڵاتوو.

**فارِح** شادومان، دڵخۆش.

**فــارِس** سوارچــاك، ئــازاودلاوەر، ئەسـپ سوار، خاوەنی ئەسپ، نـاوی نەتەوەیەکە لەنێران وناوەڕاستی ئاسیا دەژین، شێری بێشەوجەنگەڵ.

**فارِع** بەرز، بڵند.

**فارِق** هەرشتێك جیاوازی بکات لە نێوان هـەق و ناهەقـدا، پەڵـە هـەوری تـەنها، وشــترێ ژانــی زایــین گرتبێتــی و تــاك کەوتبێتەوە، جیاوازی.

**فاروق** کەسێك جیـاوازی بکـات لـە نێوان مەسـەلەکاندا، نازنـاوی عومـەری کـوڕی خەتتابە، زۆر ترسناك.

**فارِهَة** کەنیزەکی جوان و گەنج.

●**فازَ١/**سەرکەوت، سـەرکەوتن و پیرۆزی بـە دەسـت هێنـا. ٢/**الرجلُ:** لەناوچـوو، مرد. ٢/**من المكروه:** ڕزگاری بوو.

**فازَة** چەتری دوو ستون دار.

●**فاسَخَ ١/ە العقد:** ڕێکەوتن لەسەر هەڵوەشاندنەوەی پەیمان یان مامەڵەی کڕین وفرۆشتنەکە.

**فاسِد** خراپەکار.

**فاسِق** خراپەکاری دەرچوو لەڕێگەی هەق وراستی.

**فاش** هەر شتێك بڵاوبوبێتەوە.

**فاشَ** شانازی کردو لوت بەرزی نواند.

●**فاصَ ١/في الأرض:** ڕۆیشتو پیایدا گەڕا.

**فاصَلَ** مامەڵەی کرد.

**فاصِل** هەر حوکمێك مشت ومڕببڕێتەوە، هەرسنور وبڕیارێك دوو مەسەلە یان دووشت لێك جیابکاتەوە.

**فاصِلَة** لە سەجعدا لە بریتیە قافیەی هۆنراوەیە، لەخاڵبەندیدا بە فاریزە دەگوترێت.

●**فاضَ ١/**مرد، کۆچی دوایی کرد، گیانی دەرچوو، عەمری خوای کرد. **٢/السیل:** زۆر بوو لە کەنارەکانی دۆڵەکەوە بەلێشاولەبەری ڕۆشت، بۆیە لافاو. **٣/الشيء:** زۆربوو. **٤/الخبر:** بڵاوبویەوە. **٥/الإناء:** پڕبوو.

**فاضِح** بەیانی لەکاتی خۆرکەوتن و دنیا سپی بووندا (بۆیە واناونراوە چونکە هەموو شتێك ئاشکرا دەکات وپەردە لەسەرتاریکیەکان لادەدات) ئابڕووبەر، ئابڕو تکێن، نەنگی هێنەر.

**فاضِل** پاشماوەی شتێك کە نیوەی یان زۆربەی ڕۆیشتبێت، خاوەن ڕێز، بەڕێز، ڕێزدار، پاکداوێن.

**فاضّة** سەختی وبەلا.

**فاضِي** فراوان، پان وپۆڕ.

**فاطِر** پێچەوانەی ڕۆژووەوان، کەسێك بەڕۆژو نەبێت.

**فاظَ** مرد، کۆچی دوایی کرد.

**فاعِل** بکەر، کرێکار، کارکەر.

**فاعِلیّة** کارایی، کاریگەرێتی.

●**فاغَ ١/الطیب:** بڵاوبویەوە، بۆنەکە بڵاوبوویەوە.

●**فاقَ ١/الرجل:** کەوتە سەرەمەرگ یان گیانی دەرچوو. **٢/الشيء:** شکاندی. **٣/أصحابە بالعلم:** لە هاوڕێکانی بڵندتر بوو لەزانست وزانیاری یان ڕێزو حورمەتدا.

**فاقَ** کاسەی پڕ لە چێشت وخواردن، شانە، پیاوی بالا بەرز.

**فاقِع** ڕەنگی زەردی بێ لەکە، زەردی خاوێن، ڕەنگی ڕۆشن.

**فاقِعَة** بەلاو نارەحەتی وسەختی.

●**فاكَـهَ ١/الرجـلَ:** سـوعبەتی لەگەڵـدا کرد، شۆخی لەگەڵ کرد.

**فاكِـه** پیـاوی ڕوخۆشـی سوعبەتـچی، پیاوی نوکتە بازو دەم بە خەندە، خاوەن میوە.

**فاكِهـة** میوە، مێـوە، فێقـی، بـەری تـام خۆشی داروبێستان.

**فالَ** هەڵە وخەتای کرد.

**فـالِج** دەردێکە دووچاری لایـەکی لـەش دەبێـت وجموجـوڵ وهەسـتی ناهێڵێـت، ئیفلیجـی، جـۆرە وشـترێکە پـشتی دووگردۆڵکەی هەیە.

**فالِعَة** بەڵاو سەختی و نارەحەتی.

**فالِق** داشکاویی لە شاخدا.

**فالِك** کیژێ مەمکەی خڕ بێت.

**فامِيَ** بەقاڵ.

**فـــانِي** پیـــاوی پیرچـــونکە لـــەمردن ولەناوچوونەوە نزیکە.

●**فـانى ١/المالَ:** ڕێکوپێکی کـرد، چاکی کرد.

**فــاهَ** قـسەی کـرد، دەمـی کـردەوە بـۆ قسەکردن.

**فاهِقَة** زامێـك خـوێنی لێ بتکێـت، زامـی تیر.

●**فَـأدَ ١/هُ:** دای لە دڵی، کاری لەدڵی کرد. ٢/**الخوفُ فلاناً:** تـرس فلان کەسـی کـردە ترسنۆك.

●**فـــارَ ١/الـترابَ:** خۆڵەکـەی هەڵکەنـد. ٢/**الشيءَ:** شاردیەوەو پەنهانی کرد.

**فَار** مشك.

**فَارة** مێینە مشك، شوشەی میسك.

●**فـأسَ ١/الخشبةَ:** بەتەور لێیـدا وشـەقی کرد.

**فَأس** تەور، بیور، بەڵتە، ئامڕازی سادەی دارقڵیشاندن.

●**فـألَ ١/هُ بالشيءِ:** وای لێکرد هیوای پێی هەبێت ودڵی پێی خۆش بێت.

**فَال** گەشبینی، پێچەوانەی ڕەشبینی.

●**فَـأمَ ١/البعيرُ:** دەمـی خـۆیی پڕکـرد لـە گیای تەڕ.

**فَأو** شەو، هەرجێگەیەکی خزونەرمەلان، داشکاوی نێوان دووچیا.

●**فَـتَّ ١/الـشيءَ:** بـە پەنجـە شـکاندی و ووردی کرد.

**فَتّ** کەلایی وشکاویی لە تاوێرە بەردد.

**فَتاة** کچی گەنج، کەنیزەك.

**فُتـات** وردەی هەر شـتێکی شـکاو کـەلێی هەڵدەوەرێت و دەپەرێتە سەر زەوی.

**فُتاح** حکومەت.

**فَتّـاح** دادوەر، قـازی، ناوێکـە لـە نـاوە جوانەکانی خوای گەورە.

**فَتّـاش** زۆر پـشکنەر، زۆر شـارەزا لەپشکنیندا.

**فَتّاك** زۆر لەناوبەر وقڕکەر.

**فَتّال** گوریسی زۆر پێچراو، بولبول.

**فَتّان** دز، شەیتان، زەرەنگەر.

●**فَتَّتَ** ١/**الشيء**: بـە پەنجە شکاندی و ووردی کرد.

●**فَتَحَ** ١/**الباب**: کردیـەوە، والای کـرد، دەرگای خستە سەر پشت.

●**فَتَحَ** ١/**الحاكم بين الناس**: قەزاوەتی کرد، دادوەری کـرد. ٢/**البلاد**: بەسـەریدا زاڵ بوو وداگیری کرد.

**فَتح** سەرکەوتن، یەکـەم بـارانی بـەهار، کردنەوە، ئاوی لەچاوگ ڕۆیشتوو.

**فُتُح** دەرگای فراوان وکراوە.

**فَتحَة** نیشانەی (نصب)ی وشە لەڕستەی عەرەبیدا.

**فَتِخَ** جومگەی ئەندامەکانی سست ولاواز بوو.

**فَتَخَة** ئەنگوستیلە، کلکەوانەی بـێ نگین کەلەپەنجە دەکرێت

●**فَتَرَ** ١/ کەمتەرخـەمی کـرد لـە کـاردا، لـەدوای هەڵچون هێوربوویـەوە ولـەدوای ڕەقـی نـەرم بوویـەوە، لـەدوای گـەرمی سـاردبویەوە. ٢/**الماء**: سـاردبوویەوە. ٣/**السحاب**: ئارامی گـرت وئامـادەبوو بـۆ بـاران داگـردن. ٤/**ه**: بـە قـولانج پێـوای. ٥/**جسمه**: جومگەکانی لاواز وسست بوو.

**فِـتر** قـولانج، نێـوانی هـەردوو پەنجـەی دۆشاو مژەو ئەسپێ کوژە بەکراوەیی.

**فُتُر** لاوازیی وسستی.

**فِتر** جۆرە ماسیەکە، مارماسی.

**فَتَرَة** ماوە، کات، نێوانی دوو تالێهاتن کە توشـی نەخۆشـی دەبێـت، داشـکان و لاوازیی.

**فَتَرَصَ** ١/**ه**: بڕیی.

●**فَـتَّشَ** ١/**الـشيء**: پـشکنی. ٢/**عنـه**: بەدوایـدا گـەڕاو پرسـیاری کـرد لەبارەیەوە.

●**فَتَـق** ١/**الـشيء**: دڕیـی، دڕانـدی. ٢/**العجين**: خومرەی کـردە هەویرەکەوە بۆوەی زوتر هەڵبێت.

٣/**الثـوب**: تەقـەڵی پۆشـاکەکەی هەڵتەقاندو پارچەکانی لێك کردەوە.

**فَتق، فتـق** داخزانـی ڕیخۆڵـە بـۆ نـاو تورەکـەی گـون کەبەنەشـتەرگەریی چارەسەردەکرێت، فتق.

**فَتق** بەیانی، دەمەوبەیان.

**فَتـــق** تێکـچونی گـوزەران، جێگەیـەك بـارانی لێ نـەبارێت بـەڵام دەوروبـەری بارانی لێ باری بێت.

●**فَتَكَ ١/بفلان:** ستەمی لێکردو بەبێ ئاگـایی کوشـتی. **٢/الرجــل:** ئــازاو چاونەترس بوو. **٣/في الأمر:** زیادەڕەوی تێدا کرد. **٤/في صناعته:** کاراو لێزان بو لە پیشەکەیدا.

●**فَتَّكَ ١/القطن:** لۆکەکەی شیکردەوە.

●**فَتَلَ ١/البلبل:** خوێندی، ئاوازی چڕی، دەنگی هەڵبڕی.

**فَتلَة** یەکجار پێچان، یەك پێچ.

●**فَتَنَ ١/ه:** سەرسامی کـرد، دڵی ڕاکێشا، سـەرنجی ڕاکێشا، خستیە نـاو فیتنـەوە. **٢/الى النساء:** حەزی لە خراپەکردن بـوو لەگـەڵ ژنانـدا. **٣/فلانـاً:** گـومڕای کـرد، سـەری لێ شـێواند، لەخـشتەی بـرد. **٤/الشيء:** سوتاندی. **٥/الرجل:** کەوتە ناو فیتنەوە.

●**فَتَّنَ ١/ه:** خستیە ناوئاشوب وفیتنەوە.

**فِتنَــة** مـاڵ ومنـداڵ، گونـاه، تـاوان، ئەشـکەنجە، ئـازار، پارەوسـامان، تـاقی کردنـــەوە، گـــومڕایی، ڕیـــسوایی، پەنـدوئامۆژگاری، ناڕەحـەتی وتەنگانـە، نەخۆشـین، شـێتی، ئاژاوە، کوفروسـەرلێ شێوان.

**فتوحـــــات** زنجـــیرە هەڵمەتـــە ڕزگاریخوازەکـــانی ســـوپای ئیـــسلام لەســـــەردەمی پێغەمبـــــەر(د. خ) و خەلیفەکانی ڕاشیدیندا، سەرکەوتنەکان.

**فُتُــوق** بـەڵای وەك گـەدایی وبرسـێتی وقەرزاری، بارانی کەم.

**فُتُــوة** جوانمـەردی، پیـاوەتی وئازایـەتی، گەنجێتی، دەست بڵاویی و سەخاوەت.

**فُتــوی، فَتــوی** فتـوا، بڕیـاری شـەرعی هەڵگواســـتراو لــەقورئان وســـوننەت سەبارەت بەهەرمەسـەلەیەك کـە زانایـان دەری دەکەن.

**فَتِـــی** ســەخی وبەخـشندە، دەســت گوشاد.

**فَتی** گەنج، لاو، بەندە، کۆیلە.

**فَتَیان** شەو وڕۆژ، دووگەنج.

**فَتیت، فَتُوت** نـانی وردکـراو، نانـە وردە، هەر شتێکی وردکراو، ورتکەنان.

**فَتیق** سەر لە بەیانیەکی ڕۆشـن و گـەش، وشتری قەڵەو.

**فَتین** شەیدا، دێوانە.

●**فَثَّ ١/الحارَّ بالبارد:** گەرمەکەی بە سارد هێور کردەوە، شلەتێنی کرد.

●**فَثَأَ ١/الغضبَ:** ڕادەی توندو تیژییەکی هێور کردەوە.

●**فَثَجَ ١/الشيءَ:** کەمی کردەوە.

**فَجَّ** لنگی بلاوکردەوە وقاچەکانی لێکدورخستەوە، گەلی داچەقاند.

**فِجّ** میوەی نەگەیوو.

**فَجّ** ڕێگەی فراوانی نێوان دووکێو.

**فُجائة** ناگەهان، بێ ئاگا، هەرچیەك توشی حەپەسان وموفاجەئەت بکات.

**فِجار** ڕێگە پان وپۆڕەکان لەنێوان دووشاخدا.

**فَجار** زیناکاری.

**فَجّال** تورفرۆش.

●**فَجأَ/١الرجلَ:** غافڵ گیری کرد، بە بێ ئاگایی هێرشی کردە سەر، بەناگەهان هات بۆ لای، لەناکاودا هات بۆ لای.

●**فَجَرَ ١/**درۆی کرد، زینای کرد. **٢/عن الحق:** لایدا لە هەق. **٢/عن مرضه:** چاك بویەوە.

**فَجَر** دیاری وبەخشیش، کردەوەی چاك.

**فَجـر** ڕۆشنایی بەرەبەیان، گزنگی بەیانی.

●**فَجَر ١/القناة:** جۆگەی لێدا.

●**فَجَس ١/**لوتبەرزی نواندوکەشوفشی کرد، خراپەیداهێنا. **٢/فلاناً:** سەرکوتی کردوچەوساندیەوە.

●**فَجَعَ ١/ه:** ئازاری پێگەیاندو خورپەی لێدا.

●**فَجَلَ، فَجِلَ ١/الشيءَ:** هەڵاوساو قەوی کرد.

●**فَجَّلَ ١/الشيءَ:** پانی کرد، فراوانی کرد.

**فُجل، فُجُل** توور، ترپ، تفر، سەوزەیەکە لەدێر زەمانەوە دەنێژرێت وڕەگەکەی هەڵدەناوسێت و دەبێتە سەلك وبەکاڵی دەخورێت.

**فُجُور** خراپە، زیناکردن.

**فَجُور** ژنی گاندەر، پیاوی گانکەر.

**فَجوع** ئازار بەخش.

**فَجـوة** کەلێنی نێوان دووشت، حەوشی ماڵ.

**فُجّة** گوشادی نێوان دووشاخ.

●**فَجِئَ ١/الرجلَ:** لەناکاودا بەبێ ئاگایی هێرشی کردە سەری.

**فجيعة** موسیبەت و بەڵای گەورە وئازار بەخش.

**فَحّ** فیشکەی مار.

**فَحّاش** زۆر داوێن پیس وبەدڕەوشت.

**فَحّال** درەختی نێرەی خورما.

**فَحّام** خەڵوز فرۆش.
**فُحش** گوفتار یان کرداری بەدو قێزەون.
**فَحشاء** گانی حەرام، زینا، هەر گوناهێکی زۆر قێزەون بێت.
●**فَحَصَ ١/عنه**: بەدوایدا گەڕا، لێی کۆڵیەوە، ٢/**الترابَ**: هەڵی کەند.
**فَحص** تاقی کردنەوە، ئەزمایش، بەدوادا گەڕان، پشکنین.
**فَحل** هەر ئاژەڵێکی نێر.
**فَحلَة** ژنێ هەڵس وکەوتی نێرانە بێت کە لەگەڵ ڕەگەزی خۆیدا پێك نایەتەوە.
**فَحلَة** نێرێتی.
**فَحَمَ** زمانی بەسترا ونەیتوانی وەلام بداتەوە.
**فَحُمَ** ڕەش بویەوە، ڕەش هەلگەڕا.
●**فَحَّمَ ١/الشيءَ**: ڕەشی کردەوە.
**فَحم، فَحَم** خەڵوز، سکلی کوژاوە کە بۆ سوتەمەنی بەکاردەهێنرێت، ڕەژی، زوخاڵ، کۆمر، ڕەژوو.
●**فَحمَ ١/الصبيّ**: هێندە گریا تاکو دەنگی کپ بوو، هێندە گریا تاکودەنگی نوسا.
**فَحوی** مەبەست و واتای پەیڤ.
**فُحّة** گەرمی وتونی بیبەر.
**فَحیم** زوخاڵ، زۆر ڕەش وەك خەڵوز.
**فَخّ** داو، داوی مەل ڕاوکردن، تەڵە.

**فَخّار** سفال.
**فَخّاری** سفالگەر و سفالفرۆش
●**فَخَتَ ١/السقفَ**: کونی کرد. ٢/**الشيءَ**: بڕیی.
●**فَخَتَ ١/الرجلُ**: درۆی کرد.
**فَخت** کلاوڕۆژنەی سەقفی ماڵ، ڕووناکی مانگ لە سەرتای شەودا، داوی مەل ڕاوکردن.
●**فَخَذَ ١/ه**: کێشای بەڕانیدا یان ڕانی شکاند.
**فَخذ، فِخذ، فَخِذ** ڕان، لە ئەژنۆ بەرەو ژوور تا سمت.
**فَخَرَ** شانازی وکەشوفشی کرد بەخەسڵەتێکەوە کە یان لەخۆیدا هەیە یان لەبنەماڵەکەیدا.
**فَخر** شانازی، مەزنێتی وڕێز، سەربڵندیی.
**فَخَزَ** لوتبەرزی نواندو تەکەبوری نیشاندا.
**فَخُمَ** گەورەوقەوی وقوڵ بوو، ڕێزوحورمەت وپلەو پایەی گەورە بوو.
**فَخم** قەشەنگ، ڕێزوحورمەت گەورە.
●**فَخَّمَ ١/ه**: گەورەی کرد، کردیە گەورە وبەڕێزی بۆدانا.

**فَخــور** شــانازی کــرد بەخەســڵەتێکەوە کەیان لەخۆیدایە یـان لـە بنەماڵەکەیـدا، لاف لێدەر.

**فَخّة** ژنی فێزەون.

●**فَدّ ١/الرجل:** دەنگـی هـەڵبڕی، دەنگـی بەرز کردەوە.

**فَـدا** گەنجینـەی گـەنم و جـۆ وخورمـا، ئەمبارەی شت، عەمار.

**فَدّاد** ووشـترەوانان و شـڤانان وجوتیـاران کەلـەکاتی کارەکەیانـدا دەنـگ هەڵـدەبڕن وهاواردەکەن، لوت بەرزوخۆبەزلزان.

**فَدّادة** قرپۆق، بۆق، قرپۆك، ترسنۆك.

**فدامَة** دەم بەندی ووشتر.

**فَدّان** دووگا کـە دەبەسـترێن بـە یەکـەوە بۆ زەوی کێلاّن.

**فَــدّان** کێڵگـە، ئـەو زەویـەی دووگـای پێکەوە بەستراو بەڕۆژێك دەیکێڵن.

●**فَـدَحَ ١/ه:** فشاری لەسـەر دروسـتکرد، گوشاری خستەسەری.

●**فَدَخَ ١/الشيء:** شکاندی.

●**فَـدَرَ ١/اللحـمُ المطبـوخ:** سـاردبویەوە، گۆشتە کوڵاوەکە سارد بویەوە.

**فَدَر** بزنەکێوی.

**فَــدِر** نــادان، گەمــژە، چــڵەدارێ زوو بشکێت.

**فُدُرّ** زیو، زیـڤ، نـوقرە، منـداڵی قەڵەوو گۆشتن.

**فِــــدرَة** پارچـــە گۆشـــتی کـــوڵاوی ساردەوەبووگ.

**فُدس** جاڵجاڵۆکە.

●**فَدَشَ ١/ه:** پاڵی پێوە نا.

●**فَدَعَ ١/ه:** درزی چکۆلانەی تێکرد.

**فَـدَع** لاری لـە جومگەکانـدا بـەجۆرێك وەك لەشـوێنی خۆیانـدا نـەمابن ولـەجێ چووبن.

**فَدَك** لۆکەی شیکردەوە.

●**فَدَمَ ١/الإبريق:** دەم بەندی خستە سەر دەمەکەی.

**فُدم** نادان، گەمـژە، گـەلحۆ، گێـل، ڕەنگـی سووری تێر.

●**فَدَنَ ١/الإبل:** قەڵەوی کـرد. ٢/البنـاء: درێـژی کـردەوە. ٣/الثـوب: بـە بۆیـەی سوور ڕەنگی کرد.

**فَدَن** بۆیـەی سـوور، بینـای دروسـتکرياگ بە بەرزی.

**فَدَوكَس** شێری بێشەو جەنگەڵ.

●**فَدَى ١/الرجل من الأسر:** پیاوەکەی بە پارە لەدیلێتی ڕزگارکرد.

**فَدَى، فِديَة** سەربەها، ئـەو پارەیـەی بـۆ بەڕەلاکردنی دیلێك دەدرێت.

**فَدَ** تاك، تەنها، يەكەم تيرى قومار.

**فَدَة** دەگمەن، ريزپەڕ.

●**فَـرَّ** ١/ڕای كـرد، هـەلات. ٢/**الدابـة**: سەيرى ددانـەكانى كـرد بـۆوەى بزانێت چەند ساڵ تەمەنى كردوە. ٢/**عن الأمر**: بەدويدا گەڕيا.

**فَر** ڕاكردوو، هەلاتوو.

**فُر** هەڵبـژاردەى هـۆز، بـژاردەى خزمـان، كەسـێك هەڵبـژاردەى هـۆزى خـۆى بێـت واتە باشترين كەسيان بێت.

**فُرَة** تێكەلاوبوون، سەرەتاى گەرما.

**فُـرات** ئـاوى سـازگار، ئـاوى زۆر شـيرين، دەريا، ڕووبارێكە لە كوردستانى باكورەوە هەڵدەقوڵێت وبـە سـوريا وعێراقـدا تـێ دەپەڕێت ودەڕژێتە كەنداوى فارسەوە.

**فَراد** مروارى فرۆش.

**فَـرار** جيـوە، كانزايـەكى بەناوبانگـە و بەگەرمى وساردى زۆرخێـرا هەڵدەچێت ودێتـەوە يـەك بۆيەلـە گـەرمى پێـودا بەكاردەهێنرێت.

**فِرار** هەلاتن، ڕاكردن.

**فِراسـة** فيراسـەت، كـاربينى ودانـايى بەهۆى لێكدانەوەى ڕۆحيەوە.

**فِراش** پێخـەف، نـوێن، جێگـەى سـازكراو بۆ لەسەر نوستن، جێگەى زمان لە بنكى دەمدا.

**فَراشَ** دووڕەگى سەوزى ژێر زار.

**فَراشـة** پەپوولـە، نەنـۆك، پەروانـە، جانـــەوەرێكى بـــچكۆلانەى بـــاڵ ڕەنگاوڕەنگـە وچـونكە هێنـدە بـێ زيانـە كراوەتە ڕەمزى جوانى و بەرائەت.

**فِراض** پۆشاك، جلك.

**فَـرَّاض** كەسـێك بـاش بـە فـەرزەكان شارەزابێت.

**فَراعة** تەور.

**فَراغ** بۆشايى، بێ كاريى، بەتاڵى.

**فِراغ** ئەو دەمـەى دۆڵچە كـە ئـاوى لێـوە ڕۆدەكرێت، دەفر، پێكى گەورە.

**فَراق** جودايى، لێك جيابوونەوە.

**فَران** نانەوا، خاوەنى فڕن.

**فَرَتَ** داوێن پيس بوو، زيناى كرد.

**فَرتَ** ئاوەزى لاوازبوو

●**فَرِثَ** ١/تێربوو، تێرى خوارد. ٢/**القوم**: شپرزە بوون، پەرتەوازە بوون.

●**فَرَجَ** ١/**الشيء**: كرديەوە، فراوانى كـرد. ٢/**اللهُ الغـمَ عنـهُ**: خـودا خەموخەفـەت وماتەمينى لەسەر لابردو ڕزگارى كرد.

**فَــــرج** قوز،كــوز، عــەورەتی ژن، درز، پیاوێك نهێنی نەپارێزێت.

**فَرَج** ئاسودەگی، سەرفرازی و قوتاربوون لە تەنگانە.

**فرجــار** پرگـال، ئامرازێکـە بـۆ کێشانی هێڵی بازنەیی بە ئەنـدازەی جیاجیـا لـە ئەندازەدا بەکاردەهێنرێت.

●**فَرَجَ ۱/الشیء:** کردیەوە، فراوانی کرد.

●**فَــــرِحَ ۱/بالـشیء:** پـێ خۆشـحاڵ و شادومان بوو.

**فَرَحَ** شادومانی، خۆشحاڵی.

●**فَرَّحَ ۱/ه:** خۆشحاڵی کرد.

●**فَرِخَ ۱/الأرض:** پێوەی چەسپا، چەسپی بەزەوییەوە.

**فَرخ** جوجکە، جوجەڵە، بێچووی باڵندە، ڕوەك وئـاژەڵی بـچکەڵە، پیـاوی لاوازی دەرکراوو سەرشۆڕ.

**فَرخَة** جوجکەی مێینە.

**فَرَدَ** تاك بویەوە.

●**فَرِدَ ۱/بالأمر:** تاك ڕەوانە پێی هەستا وبەتەنها کردی.

**فَرَد** گا، نێرینـەی چێڵ، بـێ نمونـە، بـێ هاوشان.

●**فَــرَّدَ ۱/**لەخـەڵکی تـاك بویـەوەو تـەرا بوو. **۲/ه:** تاکی کردەوە، تەرای کرد.

**فَــرد** یـەك دانـە، یـەك کـەس، نیـوەی جـووت، تـەنها، تـاك، پیـاوی بـێ نموونـە وهاوشان.

**فردَوس** باخ، بێستان، بەهەشت، باخچە.

**فُرَدَة** کەسێك بە تەنهاو بێ هاوەڵ بڕوات بەڕێدا.

**فَردیة** تـاك گـەرایی، تاکڕەویی لـەحوکم دارێتیدا.

**فَرَزَ** جیای کردەوە، جودای کردەوە.

**فَــرز** جیاکردنـەوە، دەسـتەبەندی کـردن، پانایی نێوان دوو شاخ.

●**فَـرَسَ ۱/**شـێرەکە نێچیرەکەی ڕاوکـرد، شــێرەکە ملــی نێــچیرەکەی شــکاند. **۲/الشیء:** پرژوبلاوی کردەوە.

**فَـرُسَ** لێـزان و زیـرەك بـوو لـە ئەسـپ سواریدا، بویە سوارچاك.

**فَــرَس** ئەسـپ، هەسـپ، حەسـپ، نێـرەی ماین.

**فُــرس** فـارس، نەتەوەیـەکن لـە ئێـران و بەشێکی ئاسیادا دەژین.

**فَرسَخَ** پان بوو، فراوان بوو.

**فَرسَخ** وەختێکی درێژ، دوازدە هەزار باڵ کـە نزیکـەی (۸ ) کیلـۆ مـەتر دەکـات، فرسـەخ، ئـارامی، ئاسـایش و حەوانـەوە،

هەر شتێك هەمیشەیی بێت و نەبڕاوە بێت.

**فَرش** هەر جێگەیەك ڕووەکی زۆر بێت، هەر کشتێك گەڵاکانی لە سێ گەڵا کەمتر نەبێت، مانگاو مەڕێك بۆ سەربڕین نەبێت بۆ هیچی دی دەست نەدات، فەرشی ناومال، درۆ، پەیفی ناڕاست.

●**فَرَشَ** ١/ڕایخست، دایخست. ٢/**الرجلُ**؛ درۆی کرد. ٢/**عنه**؛ ویستی لێی بوو، خۆی بۆ ئامادەکرد.

**فِرشایة، فُرشة** فلچە، فرچەی ددان شوشتن.

**فَرشَحَ** گەڵی بلاوکردەوە، نێوان قاچەکانی پان کردەوە، بە چوارمشقی دانیشت ورانەکانی خۆی لکاند بەزەویەوە.

**فَرشَخَ** نێوانی قاچەکانی پان کردەوە، گەڵی بلاوکردەوە.

**فَرشَخَة** پانی، پانایی.

**فَرَصَ** بڕیی، لەتی کرد.

**فِرصاد** ڕەنگێکی سورە، تفێ، توو، تفە

**فِرصة، فُرصة، فَرصة** پارچەیەك لۆکە یان خوری.

**فُرصَة** هەل، کاتی گونجاو بۆ کردنی هەر کارێك، دەرفەت.

●**فَرَضَ** ١/**الأمرَ**؛ دەست نیشان ودیاری کرد، سەپاندی، ئەندازە گیری کرد.

**فَرض** فەرز، ئەو کارانەی خوای گەورە لەسەر مرۆی فەرزکردون وەك نوێژو ڕۆژو و. هتد، سوننەت، ئەوەی دەدرێت بە سەروازان.

**فَرَّضَ** فەرزی کرد، سەپاندی، کردیە ئەرك.

**فِرض** بارومیوەی درەخت.

**فَرض، فَریضة** ئەرك، فەرز.

●**فَرَطَ** ١/**في الأمر**؛ کەمتەرخەمی تیادا کرد تاکو لەدەستی دەرچوو. ٢/**على فلان**؛ ئازاریدا.

**فُرُط** هەر مەسەلەیەکی وازلێ هێنراوو پشت گوێ خریاگ، ستەم و دەست درێژی.

●**فَرَّطَ** ١/**في الشيء**؛ کەمتەرخەمی تێداکردو دەستەو سانی تێدا نیشاندا. ٢/**ه**؛ پیایدا هەڵدا و ستایشی کرد تاکو لە سنور دەرچوو.

**فَرط** دەرچوون لەسنوور، زیادڕەوی، نیشانەی سەرەڕێ.

**فَرَط** سود، قازانجی پارە.

**فِرِط** هەرزان، کەم نرخ

**كَنّاس** گسك دەر، كەسێك پیشەی گسك لێدان بێت.

**كُناسة** خۆڵ وخاشاك، شەخەڵ كەگسكی لێ دەدرێت.

**كنان** پەردەی هەرشتێك.

**كِنانَة** تیردانی لەچەرم یان لەتەختە دروستكراو.

**كِنايَة** بریتیە لەدەربڕینی مەبەستێك بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆو شاردراوە بۆوەی هەموو گوێگران لەمەبەستەكە تێ نەگەن تەنها ئەو كەسە نەبێت كەپەیوەندی پێیەوە هەیە.

**كَنَبَ** لەدوای هەژاری دەوڵەمەند بوو.

**كَنِبَ** پێستی دەستی ڕەق ونەستور بوو بەهۆی كاركردنەوە.

**كَنَب** بریتیە لەئەستورو ڕەق بونی دەست بەهۆی كاركردنەوە.

**كَنَدَ** بڕیی، كوفرانەی بەنیعمەت كرد.

**كُنُد** سوپاس نەكەری نیعمەت.

**كِنْدَة** بەشێك لەشاخ.

**كُنْدُر** جۆرە كەتیرەكەیەكی سروشتیە.

**كَنَزَ** پارە وپولی پەزمەندەكرد.

**كَنْز** ماڵ وسامانی پەزمەندەكراو، پارە وپولێ لەپێویستی مرۆڤ زیاتر بێت وپەزمەندە كرابێت، پارەو پولی خەوتوو.

**كَنَسَ** ماڵیی، گسكیدا، گسكی لێدا.

**كَنَّسَ** ماڵیی، گسكی لێدا.

**كَنَّسَ** لوتی بادا بۆ گاڵتەكردن بەشتێك.

●**كَنَعَ ١/النجم:** لاربویەوە بەرەو ئاوابون. **٢/الأمرُ:** نزیك بویەوە.

**كَنَفَ** پاراستی، هاوكاری كرد ویارمەتیدا.

**كَنَف** باڵی پەلەوەر.

**كِنْف** هەگبەی شوان یان بازرگان، توێشەدانی شڤان

**كَنَّنَ** ئارام وهێور وبێدەنگی كرد.

**كَنُود** بەرچاوتەنگ، ڕژد، یاخی لەخوا، سوپاس نەكەری نیعمەت.

**كُنْه** هەقیقەت وجەوهەری هەرشتێك.

**كَنَّة** ژنی كوڕ یان ژنی برا، بوك یان براژن.

**كِنَّة** سپیایی، سپێتی.

**كُنَّة** كەپر، سابات.

**كَنّى** بەناڕاستەوخۆ وشاردراوەیی مەبەستی دركاند.

**كَنيس** پەرستگای جولەكە.

**كَنيسَة** كەنیسە، كڵێسا، پەرستگای گاوران، دێر.

**کنیــع** دەســت شــکاو، برســێتیەکی زۆر سەخت.

**کنیف** پەردە، قەڵغان، ئاخۆڕ وپەرژینی درەخت بۆ ئاژەڵان.

**کَنــی، کَنّــی** نازنــاوی لێنــا، نازنــاوی بەسەردا بڕی.

**کُوَارَة** پوورەی هەنگ.

**کِوارَة** شاشك، عەممامە.

**کواعــب** مــەمك، مەمکــە، یــان جوتــە مەمك.

**کُــوْب** کــوپ، دەفــری تایبــەتی ئــاو خواردنەوە.

**کُوْبَة** تەپڵی بچوك، تاوڵە، شەترەنج.

**کَوْبَة** ئاخ کردن لەشوێن شتێ لەدەست دەرچوبێت.

●**کَـوْثَ ١/الـزرع** چوار گـەڵا یـان پێـنج گەڵای دەرکرد.

**کَوْث** جۆرە (خوف)ێکی کورتە، کەفش.

**کَوْثَر** ڕوبار یان جۆگەیەکە لەبەهەشتدا، خواردنــەوەی ســازگار، زۆرو زەوەنــد لەهەرشتێك.

**کُوْثَة** هەرزانی، بەپیتی ساڵ، پیت وفەڕ.

**کَوْثَل** بەشی دواوەی کەشتی.

**کُــوْخ** کــوخ، ماڵۆچکەیەك کــە باخــەوان دروستی دەکات ولەناویا دادەنیشێت بـۆ ئەوەی بێستانەکە بپارێزێت.

**کَوْدَ** کۆی کردەوە وکردیە تەپۆڵکە.

**کَوْدَة** خۆڵی کۆکراوە.

**کَوْدَن** فیل.

**کَـوْر** مێگـەل وگەلـە مانگـای زۆر، پێـچی شاشـك وجامانـەی، یـەك پێـچی شاشـك بەدەوری کڵاودا.

**کَـــوَّرَ** شاشــکی پێــچایەوە، جامانـــەی پێچایەوە.

**کُــوْرَة** ئــەو پارچــە زەویــەی کەگونــدو ئاواییەکانی تێدا کۆدەبنەوە.

**کَوْر** سروشت وتەبیعەت.

**کُوز** گۆزەی ئاو.

**کَـوَّسَ** شـتەکەی هەڵگێڕایـەوە سەرسـەر، شتەکەی سەرەوخوار کرد.

**کَوْس** شـەپۆل و هەڵچونی دەریـا، نزیـك کەوتنەوە لەنقوم بوون لەدەریادا.

**کُـوْس** سێگۆشـە، تـەپڵ، جـۆرە تەپڵێکـە جاران بەکاردەهێنرا.

**کُوْسِيَ** ئەسپێك دەست وقاچەکانی کورت بێت.

**کَوْسَج** کەسێك ددانەکانی ناتەواو بن.

●کَـوَّفَ ١/هـات بـۆ شـاری کوفـه، پیتـی (کافی)نوسی. ٢/اللهمَّ: بڕیی.
کُوْفَة شارێکه لەباشوری عێراقدا.
کُوفِيَّ بەکەسێك دەگوترێت خەڵکی شاری کوفه بێت، کوفەیی.
کوفِیّـــونَ زانایـانی زانــستی (نــەحو)ی کوفه.
کُوْفِیَّة دەسته سرێکه دەیدەن بەسەردا.
کَوْکَـبْ ئەسـتێره، شمـشێر، ئـاو، سـەختی گەرما، زیندان، گـەورەو دەمڕاسـتی هـۆز، سەرکردەی هۆز، بریکانەوەی ئاسن، پیـاو بەچەکەوە، مێرد منداڵی هەرزەکار، خاڵ یان تانـەی سپی کەلـەناو چاودا دروست دەبێـت، ئەوجێگەیـەی بیرکـە ئـاوی لێـوە هەڵدەقوڵێت، شاخ، چیا، کەژ، کێو، کێـف، زۆربـــەی هەرشـــتێك، ڕوەکێـــك درێـــژ بوبێت.
کَوْکَبَة گرۆ وکۆمەڵ.
کَوْکَی لەڕۆشتندا لەرزی وپەلەی کرد.
کَوَّمَ خۆڵەکەی کۆکردەوە وکردیە کۆما.
کُـوْم کەلەوشـتر، هەرجێگەیـەکی بـەرزی وەك گردۆلکە.
کُوْمَة کۆمای خۆڵ.
کَوْن گەردون.
کَونيّ گەردونی.
کُونيّ بەتەمەن گەورە.
کَوَّه ئاگری جۆشدا.
کَوِهَ سەرسام بوو.
کَوَی داخـی کـرد، داغـی کـرد، جلکەکـەی ئوتو کرد.
کَهَانَة پیشەی کاهین، فالگەری.
کَهِبَ ڕەنگی بۆری ڕەشباوی لێ نیشت.
کَهَــدَ گـوێ درێژەکـە غاریـدا، پیاوەکـە شەکەت وماندو بوو.
●کَهَرَ ١/فلاناً: بەگرژی وقەڵسیەوە ڕوی تێکرد، گەرما توند بوو، پێکەنی.
کَهْرَبَ تەزوی کارەبای تێخست.
کهربـاء کارەبا، عەلەتریك، ئەلکتریك.
کَهْرَبِیَّة هێزی کارەبا، تەزوی کارەبا.
کَهْــف ئەشـکەوت، ئەشـکەفت، شـکەفت، غار، ڕەهۆڵی زل لەشاخدا، پەناگا.
کَهَلَ چوە تەمەنی کامڵ بونەوە.
کَهْــل هەرکەســێك تەمــەنی لــەنێوان (٣٠ - ٥٠) ساڵیدا بێت.
کَهْلَة ژنی کاملی فامدار.
کَهَــمَ نارەحــەتی و تەنگانــەی ســەخت ترساندی و ئیقدامی تێدا نەهێڵا
کَهِمَ لاوازبوو، سست بوو.
کَهُمَ لاواز بوو.

**كَهْمَسَ** نێوانی قاچەکانی نزیك کردەوە، قاچەکانی لەیەکتر نزیك کردەوە.
**كَهْمَس** پیاوی کورتە باڵا، گورگ، شێری بێشە وجەنگەڵ.
**كَهول** جاڵجاڵۆکە.
**كَهِيَ** بەهاڵاوی دەمی سەری پەنجەکانی خۆیی گەرم کردەوە.
**كَهيم** پیاوی پیر، پیاوی بەساڵاچوو.
**كَيَّاد** زۆر فێڵباز، تەڵەکەباز.
**كِياسَة** زیرەکیی، ژیری.
**كَيّـال** کەسێك پیشەی کێشانە کردن بێت.
**كِيالَـة** پیشەی قەپانداری و کێشانە کردن.
**كِيان** قەوارە.
**كَيَح** زبرێتی.
**كَيْد** فێڵ، حیلە، تەڵەکە، جەنگ.
**كَيَّـر** ئەسپ لەکاتێکدا کلك بەرز دەکاتەوە.
**كَيَّسَ** زیرەك بوو، کردیە کیسەوە.
**كَـيْس** زیرەکیی، هۆش، ئەقڵ وژیریی، کۆمەڵ ودەستە.
**كِـيس** کیس، فەردە، تورەکە، گونیە، گونی، گوێنو.
**كيسوم** ئالفی وشك وزۆر.
**كَيْص** ڕژدیەکی زۆر، زۆر بەرچاو تەنگ.
**كَيْص** پیاوی کورتە باڵای قەڵەو.
**كَيْعَر** بێچوە شێری بچوك.
●**كَيَّـفَ ١/ه** پێی گوت: حاڵت چۆنە؟، پرسیاری حاڵ وباڵی لێکرد. **٢/الشيء** بڕیی، گونجاندنی.
**كَيْـفَ** وشەیەکە بۆ پرسیارکردن لەچۆنێتی حاڵ بەکار دەهێنرێت.
**كيفما** هەرچۆنێك، هەرچۆن.
**كيفيَة** چۆنێتی.
**كيكَة** هێلکە.
**كَي** بۆوەی، بۆنەوەی.
**كَي لا** بۆوەی نە.
●**كَيَّلَ ١/الرجل** ترسنۆك بوو. **٢/القمح** گەنمەکەی پێوا، گەنمەکەی کێشانە کرد.
**كَيْل** کێشانەکردن.
**كِيلُوس** شلەیەکی سپی شیریە گەدە دەری دەداتە سەر خۆراك، کیلۆس.
**كيلوغرام** کیلۆگرام، بڕێکی کێشانە کردنە ویەکسانە بە (١٠٠٠)گرام.
**كيميا، كيمياء** زانستێکە لە سروشت وسیفەتی مادەکان دەکۆڵێتەوە.
**كيميائيّ** کیمیاگەر، هەرکەسێکی پسپۆڕ وشارەزا لەبواری زانستی کیمیادا.
**كِيْنَة** حاڵەت، بارودۆخ.

**کـیَ، کیَـة** داخ، داغ، جێگـەی داغکـردن وسوتان.

● **لازَمَ س\/هـ** دەستی پێوەگرت ولێی جیا نەبویەوە.

**لاسَ** تامی کرد، چەشتی.

**لاسِع** گەزندە، ژەهردار، ژاراوی.

**لاسلكي** بێتەل، بێ سیم.

**لاشى** لەناوی برد، گێڕایەوە بۆ نەبوون.

**لاشيء** هیچ، هیچ شتێ.

**لاصَ** لێی لادا، لێی دەرچوو.

**لاطَ** پێوەی لکاند، لێیدا، دەری کرد، پێداگری کرد، شاردیەوە.

**لاعَ** بەهۆی دڵداریەوە نەخۆش کەوت، خۆر ڕەنگی دەموچاوی گۆڕی.

**لاعٍ** نەخۆش، ترسنۆك.

**لاعِب** یاری کەر.

● **لا عَبَ ١/هـ** یاری لەگەڵدا کرد.

**لاعِج** عەشقی سوتێنەر.

● **لاعَجَ ١/هـ الأمرُ** مەسەلەکە توند بوو لەسەری.

**لاعَة** ژنی دڵداری کەر، ئافرەتی عەشقباز.

**لاغٍ** پوچەڵ، هیچ، پوچەڵ کراو.

**لاغِب** لاواز، سست.

**لاغية** قسەی پوچ وگوێ پێ نەدراو، قسەی قۆڕ، زمانی ناڕەوان.

**لافِظ** بوێژ، گۆینەدە.

**لافِظَة** دنیا، دەریا.

● **لافَ ١/الطعامَ** خواردی.

**لاقَ** نەرم بوو.

● **لاقَبَ ١/هـ** بەناوناتۆری ناشیرین جنێویان بەیەکتردا.

**لاقِط** هەرکۆیلەیەك ئازاد کرابێت.

**لاقى** ڕوبەڕوی بویەوە وسودفەی کرد.

**لاكَمَ** یاری بۆ کسێنی کرد، ملاکەمەی کرد.

**لالا** بریکەی دایەوە، درەخشایەوە.

**لألاة** درەخشاوەیی.

**لأل** مرواری فرۆش.

● **لامَ ١/هـ** لۆمەی کرد، سەرزەنشتی کرد.

**لاءَمَ** چاکی کردو کۆی کۆدەوە.

**لأم** زنجیر، زرێ، توندوسەخت لەهەر چشتێ وێ.

**لأمَة** زنجیر، زرێ.

**لامِس** ژنی داوێن پیسی زیناکار.

● **لامِع ١/**درەخشان وتابان. **٢/** کەس، دەگوترێت ( **مابالدار لامِعٌ** واتە هیچ کەسێك لەماڵدا نیە ).

**لام** نزیکی، توندوسەخت لەهەرشتێك.

**لانَ** نەرم بوو.

● **لاوصَ ١/هـ** فێڵی لێکرد، خەڵەتاندی.

**لاةَ** تراویلکە بریکایەوە.

**لاهذا** ئەومتە.

**لاهِز** گردو شاخ وتەپۆلکە چونکە ڕێگە دژوارو ناڕەحەت دەکەن.

● **لاهَسَ ٨/القَومَ إلىَ الشيء:** کردیان بەفەڵەمبالغی لەسەری.

**لاهِط** کەسێك ئاو پرژێنی بەردرگای خۆی بکات وپاکی بکاتەوە.

**لاهَف** ستەم لێکریاگ، ستەمبار.

**لاهِفة** ژنی دڵسوتاوی ستەم لێکراو.

**لاهوت** ئاسمانی، خوایی، زانستێکە لەبیرو باوەڕەکانی تایبەت بەخودا دەکۆڵێتەوە.

**لاهَة** مار.

**لأی** خاوەخاوی کرد.

**لأي** تەنگانەو ناڕەحەتی.

**لأي** گاکێوی.

● **لایَنَ ٨/هـ:** بەنەرمی ومیهرەبانی لەگەڵیدا جولایەوە.

**لِـئْم** سازگاری وڕێکەوتنی نێوان دوکەس، شەشێر، هەنگوین.

**لئیم** ناکەس، ناچیزە، بەرچاوتەنگ، ڕژد.

● **لَبَّ ٨/بالمكان:** تیایدا مایەوە. **٨/اللوزة:** شکاندی وکاکڵەکەیی دەرهێنا.

**لَبّ** کەسێکی نەرم ونیان ونزیك لەخەڵك.

**لُبّ، لُباب** کاکڵە، پالفتەو هەڵبژاردەی هەرشتێك.

**لَبَّأ** گوتی: اللهم لبيك.

● **لَبَأ ٨/الشاة:** تۆبەرە شیرەکەیی دۆشیی.

**لَبْـأة، لَبائـة** مێینەی شێری بێشەو جەنگەڵ.

**لباج** گەمژەی کەم فام.

**لِباس** جلك، پۆشاك، هاوسەر، کۆبونەوە.

**لَباقة** خۆش زەوقیی.

**لُباكة** کۆمەڵ.

**لُبان** سنەو بەر.

**لَبان** سینگ یان نێوانی هەردوو مەمك، سنگی ئاژەڵی سمدار.

**لَبّان** شیرفرۆش.

**لَبْاة** مێینەی شێری بێشەو جەنگەڵ.

● **لَبِثَ ٨/بالمكان:** تیایدامایەوە.

**لَبِث** کەسێك لەشوێنێکدا مابێتەوە.

**لُبْثة** ڕاوەستانێکی کەم.

**لَبْجة** ئاسنێکی دەدانەدارە بۆ ڕاو کردنی گورگ بەکار دێت.

**لَبَح** پیاوی پیر، ئازایەتی.

**لَبَخَ** لێیدا، جنێوی پێدا، کوشتی.

**لَبِخَ** لەشی ئاسەواری لێدانی پێوە دەرکەوت.

**لُبْخة** هەتوان، مەرهەم، زەمادی گەرم کەدەخرێتە سەر برین یان ئازار.

● **لَبَدَ ٨/بالمكان:** تیایدا مایەوە، سەقامگیر بوو.

**لَبَّدَ** خوری شی کردەوە.

**لَبَد** خوری شیکراو.

**لُبَد** خانەنشین کەلەماڵەوە دادەنیشێت وهەرگیز سەفەرناکات وماڵ بەجێ ناهێڵێت، شێری بێشەو جەنگەڵ.

**لِبْدَة، لُبْدَة** قژی نێوان هەرتکەشانی شێر.
**لَبِد** کەسێك سەفەرنەکات ومال بەجێ نەهێڵێت.
**لِبْد** بەرەی لەخوری دروستکراو.
●**لَبَزَ ٨/هُ** شکاندی، کێشای بەپشتیدا.
**لَبَس** تێکەڵ بون و ناوڕنێتی هەرمەسەلەیەك.
**لُبْس** جۆرە جلکێکە، تێکەڵ وپێکەڵ بون و ناڕونێتی هەرمەسەیەك.
**لَبِسَ** جلکی لەبەر کرد، بەرگی پۆشی.
**لُبِطَ** توشی هەڵامەت بوو.
**لَبْطَة** هەڵامەت.
●**لَبَقَ ٨/الشيء** نەرمی کرد.
●**لَبَّقَ ٨/الشيء** زۆر نەرمی کرد.
**لَبُقَ** کارزان و نەرم ونیان بوو، زیرەك بوو.
**لَبِق** خۆش ڕەفتارو نەرم ونیان.
**لَبقَة** زیرەکی.
**لَبَكَ، لَبَّكَ** تێکەڵاوی کرد، تریتەکەی کۆکردەوە بۆوەی بیخوات.
**لَبِكَ** تێکەڵاو بوو.
**لَبْك** هەرشتێکی تێکەڵاو.
●**لَبَنَ ٨/الرجل** شیری پێدا بیخواتەوە.
**٢/الرجل** زۆری خوارد، زۆر خۆری کرد.
**لَبَنْ** شیر، شلەیەکی ڕەنگ سپیە لەمێینەی ئادەمیزادو ئاژەڵاندا لەدوای منال بون دروست دەبێت.

**لَبِن** شیر خۆر، کەسێك حەزی لەشیر بێت.
**لَبِنَة** شیردار.
●**لَبِنَ ٨/الرجل** بەهۆی نارێکی سەرینەوە ملی هاتەئێش.
**لَبَّنَ** خشتی دروست کرد بۆ خانگ دروستکردن.
**لَبِنَة** خشتی خانگ وئەپارتمان دروست کردن.
**لُبُودِيّ** هەلاج، شیکەرەوەی پەموو.
**لَبُوس** پۆشاك، زرێ.
**لَبُونات** شیردارەکان، مەمك دارەکان.
**لَبُوَة** مێینەی شێر.
**لَبَّة** سینگ، جێگەی ملوانکە لەسنگی ژندا، سەری سینە.
**لَبَيَ** زۆری خوارد، زۆر خۆری کرد.
**لَبِيَ** وەڵامی دایەوە.
**لَبيخ** گۆشت دار، کەسێك قەڵەو و گۆشتن بێت.
**لَبيخَة** ئەو دەفرەی مسکی تێ دەکرێت، شوشەی گوڵاو.
**لبيق** خۆش ڕەفتاری نەرم ونیان.
**لَبَيك** گوێم لەفەرمانتە، فەرمانبەردارتم، وشەیەکە بۆ وەڵامدانەوەی داخوازیەك دەگوترێت.
●**لَتَّ ٨/الشيء** هاڕی و وردی کرد.
**لَتّ** تەوری گەورە.
**لَثْلَثَة** سوێندی درۆ.

**لَثَبَ** چەسپا، سەقامگیر بوو.

● **لَثَحَ ١/ڤ** جەوی كێشا بەدەم وچاویدا.

**لَثِحَ** برسی بوو.

**لثحان** برسی، كەسێك برسی بێت.

● **لَثَغَ ١/ڤ** پیسی كرد.

**لُثر، لِثـر** لیتر، یەكە یـەكی پێوانـەكردنی شلەمەنیەكانە.

● **لَثَمَ ١/ڤ** لێیدا. ٢/تیری هاویشت.

**لَثْمْ** برین، زام.

**لَثِنَ** شیرین.

**لَثّ** شەونم، ئاورنگ، تەڕونم دار.

**لثام** پەچە، ڕوبەند.

**لَثَاة** دەم.

● **لَثْلَثَ ١/المطرُ** بارانەكـە چـەند ڕۆژێ بەردەوام بوو.

**لَثـا** جـەوی، ئـەوەی لـەدرەخت دەڕژێـت ودەچۆڕێت.

**لَثَد** شمكەكەی ڕێك وپێك كردو لەسەریەك داینان.

**لَثَطَ** بەسوكی لێیدا.

**لَثَغَة** دەم.

● **لَثِقَ ١/اليومُ** باكەی بێدەنگ وتەڕوتوشی زۆر بوو.

**لَثَـق** شـەونم، تـەڕی و نمنـاكی، قـوڕو ئـاو بەتێكەڵی، قوڕاو.

**لَثَمَ** ماچی كرد.

**لَثمة** ماچ.

**لَـثَمَ** دەم بەنـدی بەسـت بـە دەمـی یـەوەیان بەلوتیەوە.

**لَثَم** لوت ودەورو بەری لوت.

**لِثْمَة** شێوازی بەستنی دەم بەند.

**لثة** پوك، ئەو جێگەیەی ددانی لێ دەڕوێت.

**لَثِيَ** كەم كەم ئاوی خواردەوە.

**لَثى** شەونم وئاونگ.

**لَثى** كراسێ بەئارەقی لەش تەڕبوبێت.

**لَجَّ** لەڕكابەرایەتیدا پێداگرو ڕەق بوو.

**لُجّ** گرۆهێكی زۆر، لاپاڵی شیو، شمشێر.

**لَجاجة** سەرسەختی.

**لجام** دەم بەند.

**لَجَـا** هاوسـەری پیـاو، ژن، میراتگـر، جۆرەكیـسەڵێكە لـەئاوو وشكانیـشدا دەژی، پەناگا.

**لَجَأَ** پەنای برد.

**لَجِبَ** دەریا شەپۆلیدا، خـەڵكی هـاوارو قیـژو هۆریان كرد.

**لَجَب** شەپۆلی دەریـا، حیلـەی ئەسپ، هـاوارو قیژو هوڕ.

**لَجَبَة** مـەڕی كـەم شیر، مـەڕی شیردار. ئـەم وشەیە لەو وشانەیەكە دژە واتایان هەیە.

**لَجَذَ** خواردی، خۆراكی خوارد.

● **لَجَفَ ١/ڤ** بەتوندی لێیدا.

● **لَجِـفَ ١/ت البئـرُ** لاپاڵـەكانی بیرەكـە كەندڕ بوون.

**لجفاء** بیرێك قەدپاڵەكانی كەندرپوبێت.
**لَجَف** كەندری ئەم لاو لای بیر.
● **لَجَمَ ١/الثوبَ** دوری، درومانی كرد.
**لُجَم** هەوا، بۆق.
**لُجَم** قربۆك.
● **لَجِنَ ١/بهِ** پێوەی پەیوەست بوو.
**لَجِنْ** چلك وچەپەڵیی.
**لَجْنَـــة** دەســـتە، كۆمیتـــە، دەســـتەیەكن دادەنیـشن بـۆ سـەرنجدان لەمەسـەلەیەك و بڕیاری لەبارەوە دەدەن، كۆمیسیۆن.
**لَجون** وشتری قورس لەڕۆشتندا.
**لُجّة** هـەیاهو، قیـژو هـوڕو غـەوغا، قوڵترین شوێنی دەریا.
**لَجّة** هاوارو بانگ.
**لُجَیزاء** گەنجینە.
**لَجِین** ئاڵفی تێكەڵ لەگـەڵای هـاڕدراو وئـارد یان جۆ.
**لُجَین** زیو، نوقرە.
● **لَـحَّ ١/تِ العــینُ** پێڵوەكـانی بـەهۆی ڕیپۆقەوە لكان بەیەكدا.
**لَحّ** خزم، خوێش.
**لَحّـــاد** گــۆڕ هەڵكــەن، كەســێك قــەور هەڵبكەنێت.
**لَحاص** بەڵاو سەختی ونارەحەتی.
**لَحاظ** كلكی چاو، قنگەی چاو.
**لِحاف** عەبا.
**لحاق** بەرگی كەوان.
**لَحّام** گۆشت فرۆش، قەساب.
● **لَحا ١/هُ** جنێوی پێدا.
**لَحَــبَ** ڕێگەكـەی گـرت، ڕێگەكـەی ڕۆشـن كردەوە.
**لَحَبَ** بڕیی لاوازی كرد.
**لَحْب** ڕێگەی ڕۆشن.
**لَحَّبَ** بڕیی.
**لَحْت** پاڵفتە وتەواو.
**لحج** كاسەی چاو.
**لُحْج** گۆشەی خانوو.
**لَحِجْ** تەنگ، تەسك.
**لَحَدَ** مردوی شاردەوە، گۆڕی هەڵكەند
**لَحْد، لُحْد** گۆڕ، قەور، ئارامگا.
**لَحَسَ** لێسایەوە.
● **لَحَطَ ١/هُ** ئاوپرژێنی كرد.
**لَحَـظَ، لاحَـظَ** چاودێری كـرد، بەقنگەچاو سەرنجیدا، تێبینی كرد. .
**لَحْظَة** چركە.
**لَحْظِيّ** لەحزەیی، فەوری.
● **لَحَـفَ ١/هُ** بـەعابا دایپۆشـی. ٢/**الـشیءَ** لێسایەوە، لستیەوە.
**لحف** بنكی كێو، بنكی شاخ.
● **لَحَـقَ ١/بهـلانٍ** پێـی گەشـت، گەشـتەوە پێی.

**لَحَق** بەروبومی دوای نۆبەرە، هەرشتێکی زیادە.

● **لَحَكَ ١/الشيءَ بالشيء:** پێوەی لچکاند.

● **لَحَمَ ١/الأمرَ:** ڕێکوپێک و توندوتۆڵی کرد. **٢/العظمَ:** گۆشتی لەنێسقانەکە کردەوە. **٣/ه:** گۆشتی پێدا.

**لَحْم** گۆشت.

**لَحِمْ** کەسێك زۆر گۆشتن بێت، کەسێك زۆر حەزی لەگۆشت بێت، شێر.

**لَحْمَة** پارچەیەك گۆشت.

**لُحْمَة** خزمایەتی، خوێشی ونزیکی.

**لَحَنَ** هەڵەیکرد لە قسەکردندا.

**لَحَّنَ** ئاوازی دانا.

**لَحْن** ئاوازی گۆرانی وسرود.

**لَحِن** زیرەك، وشیار.

**لَحِنَ ١/الكلام:** لێی حاڵی بوو.

**لَحُوس** کەسێك شوێنی شیرینی بکەوێت وەك چۆن مێش شوێنی دەکەوێت، واتە بەئەندازەی مێش ئارەزوی لەشیرینی بێت.

**لَحيان** پیاوی ڕیش درێژ.

● **لَحَى ١/فلاناً:** لۆمەی کردو جنێوی پێدا.

**لِحْيَة** ڕیش، ڕدێن.

**لَحِيص** تەنگ، تەسك وتروسك.

**لَحِيظ** هاوتاو هاوشان.

**لَحِيم** کەسێك لەشی زۆر گۆشتن بێت، کوژراو.

**لَخَص** قەڵەوی و هەڵاوساوی پێڵوەکانی چاو بەسروشت.

**لَخِصَ** گوانێك لەبەر قەڵەوی بەناڕەحەت شیری لێبێتە دەر.

**لَخَصَة** پارچە گۆشتی ناو چاو، بەزی چاو.

● **لَخَفَ ١/ه:** بەتوندی لێیدا.

● **لَخَمَ ١/** بڕیی. **٢/الرجلُ:** دەم وچاوی قەڵەو بوو.

**لَخِمَة، لُخَمَة** پیاوی ڕۆح قورس، ناچیزە.

● **لَخِنَ ١/** بۆگەنی کرد. **٢/الرجلُ:** قسەی قۆڕی کرد.

**لَخِيَ** قسەی لەباتڵدا زۆر کرد.

● **لَدَّ ١/الرجلَ:** دوژمنایەتیەکی سەختی لەگەڵدا کرد.

**لُدَاغ** دڕك.

**لَدَد** دوژمنایەتی قورس وسەخت.

● **لَدَدَ ١/ه:** سەرسامی کرد.

● **لَدَّدَ ١/بە:** ناتەواوی وعەیبەکانی ئاشکراکرد.

**لَدّ** دوژمنی سەرسەختی زۆرقین لەدڵ.

● **لَدَسَ ١/ه بیدە:** لێیدا، پیایدا کێشا. **٢/الشيءَ:** لێسایەوە، لستیەوە.

**لِدس** بارێك لەهەرشتێك.

● **لَدَغَ ١/ه:** گەستی، پێوەیدا، تانەوتەشەری لێدا.

**لَدغَة** گەستن، پێوەدان.

●لَدَمَ ١/هـ: بەشتێکی قورس لێیدا کەدەنگی کەوتنەخوارەوەی شتەکە بۆ سەرزەوی ببیسترێت.
لَدَم تەقەی بەرد کەدەکەوێتە سەرزەوی.
لَدُنَ نەرم بوو.
لَدن نەرم.
●لَدَّنَ ١/الشيء: نەرمی کرد.
لَدُن چێشتێ باش نەکولاَبێت.
لَدُن، لُدُن، لَدن، لُدْن ناوەڵفرمانی کاتەو تەنها بۆ حاڵی حازر بەکاردێت، بەواتای. . لەکن، لەلایەن.
لِدَة هاوساڵ، هاوتەمەن، کەسێك لەگەڵتا لەدایك بوبێت یان لەگەڵتا گەورە بوبێت.
لَدى ناوەڵفرمانی شوێنەو بەواتای "لَدُن" بەکاردێت.
لَدید دوژمنێك دوژمنایەتیەکەی سەرسەختانەبێت.
لَدیدة مێرگوزاری پاك.
لَدیس قەڵەو، گۆشتن.
لَدیغ ماران گەستە، گەزراو.
لَدیم پارچەی کۆنە.
●لَذَّ ١/الشيءَ: خۆش مەزەو بەچێژ بوو.
لَذّ بەچێژ، بەتام، خەو.
●لَذَبَ ١/بالمكان: تیای دامایەوە.
لَذَجَ قوم قومی کرد.
لَذَعَ سوتاندی، عەشق دڵی ئازاردا.

●لَذَعَ ١/الطائرُ: باڵەکانی ڕاوەشاند، کەمێك باڵەکانی بزواند.
●لَذِمَ ١/بالشيء: پێی سەرسام بوو، حەزی لێکرد.
لُذَمة کەسێك سەفەرنەکات وماڵ بەجێ نەهێڵێت.
لَذَّة تام، چێژ، لەزەت، پێچەوانەی ئێش وئازارو نارەحەتی وناخۆشی.
●لَذِيَ ١/بالأمر: پێی سەرسام بوو لێی جیانەدەبوەوە، پێوەی چەسپا.
لَذیذ خۆش، بەتام، بەچێژ.
●لَزَّ ١/چەسپا، لکا. ٢/القومُ: کۆبونەوە، گردبۆبون.
لِزّ، لِزاق چەسپ.
لِزاز تەختەیەکە درگای پێ دادەخرێت وقایم دەکرێت، سەختی دوژمنایەتی.
لِزام مەرگ، مردن، حکومدان لەهەرکێشەیەکدا.
لَزَأَ ١/الإناءَ: پڕی کرد.
لَزَبَ سەقامگیر بوو چەسپا.
لَزِبَ لکاو توندوتۆڵ بوو.
لَزِب ڕێگەی تەنگ وتەسك.
لَزِب کەم.
لَزْبَة وشکەساڵی وگرانی، تەنگانەو نارەحەتی.
لَزِجَ کشاو درێژ بوو بێ ئەوەی بچرێت، هەنگوینەکە لکا بەدەستەوە.

**لَزْجَة** كەسێك لەماڵ نەچێتە دەرو سەفەرنەكات.

**لَزَز** سەختی دوژمنایەتی، تەختەیەكە دەرگای پێ قایم دەكەن.

**لَزَز** ژیانی تەنگانە، گوزەرانی كولەمەرگی.

**لَزِق** لكا، چەسپی.

● **لَزِمَ ١/الشيءَ:** سەقامگیر بوو. **٢/بيتَهُ:** لێی جیانەبوەوە. **٢/الصمتَ:** بێدەنگی هەڵبژارد. **٤/الشيءَ:** لێكی جودا كردەوە.

**لُزَمَة** كەسێك كەدەستی بەشتێكەوە گرت ئیدی بەری نەدات.

**لَزَن** سەختی وتەنگانە، سەختی گوزەران.

**لَزَن** جێگەیەك قەرەباڵغی لەسەربێت.

**لَزْنَة** تەنگانەو سەختی.

**لِزْنَة** تەنگانە، شەوێك لەبەر برسێتی یان سەرما سەخت وناڕەحەت بێت.

● **لَسّ ١/** ئاژەڵەكە بەلازمانی گژوگیای برد بۆدەمی تابیخوات. **٢/الطعامَ:** خواردی.

● **لِسان ١/**زمان، زوان، ئەندامی چەشتن لەناودەمدا، پەیام، زمانی پێ ئاخافتن. **٢/النارِ:** زوانەی ئاگر. **٢/الحالِ:** زمان حاڵ، زمانی حاڵ. **٤/القومِ:** وتەبێژی ناوهەركۆمەڵ وهۆزێك. **٥/الصدقِ:** باس كردن بەچاكە.

● **لَسَبَ ١/تهُ الحيةُ:** مارگەستی، مار پێوەیدا.

**لَسِب** چەسپا، لكا.

**لَسَدَ** لێسایەوە، لستیەوە.

● **لَسَعَ ١/هُ:** گەستی، گازی لێگرت. گوتراوە"**لسع** " بۆگەستنی جۆزودارەكان بەكار دەهێنرێت و"**لدغ**" یش بۆگەستنی دەم وەك پێوەدانی مار. **٢/هُ بالكلامِ:** بەقسە ئازاریدا وعەیب داری كرد وەك ئەوەی بیگەزێت.

**لَسِقَ** چەسپی، چەسپا.

**لَسَمَ** چەشتی، تامی كرد.

**لَسِمَ** لەبەر حەیاو شەرم بێ دەنگ بوو.

**لَسِنَ** زمانی پاراو بوو.

● **لَسَنَ ١/الشيءَ:** تیژی كرد.

● **لَسَنَ ١/فلاناً:** بەخراپ باسی كرد، بەدگۆیی كرد.

**لَسْن** زمان، قسە، زوانی ئاخافتن.

**لَسَن** زمانپاراویی.

**لَسِن** زمانپاراو، هەرشتێكی تیژ، ڕەوانبێژ.

**لُسُوع** درزو قڵیشاویی.

**لَسيع** گەزراو، ماران گەستە.

● **لَشّ ١/هُ:** دەری كرد.

**لَشا** لەدوای سەربڵندی بێ ڕێزو سەرخوار بوو.

● **لَصّ ١/** دزیی كرد، بەدزیەوە كارێكی كرد. **٢/البابَ:** دەرگاكەی داخست.

**لَصّ، لُصّ، لِصّ** دز.

**لَصاة** عەیب، ناتەواویی.

● **لـصا ١/المرأة:** تۆمـەتباری کـردو جنێـوی پێدا.

**لَـصِبَ** ئەنگوستیلەکە بـەهۆی قەڵـەو بـونی ئەو پەنجەوە کەتیایدایـەتی تـەنگ بویـەوەو بەناڕەحەت هاتە دەرێ.

**لِصب** تەنگەی شیو.

**لَصِب** بەرچاو تەنگ وبەد خو.

**لِصّت، لَصّت، لُصّت** دز.

**لَصَفَ** بریکەی دایەوە.

● **لَـــصِفَ ١/الجلـــدُ:** وشــك بویـــەوە بەئێـــسقانەوە بـــەهۆی لاوازی و کـــەم گۆشتیەوە.

**لَصِقَ** چەسپی، لکا.

**لَصِق، لَصِيق** پەیوەست، چەسپاو.

**لُصُوصِيَّة** دزێتی، ڕێگریی.

**لَـــصوقَ** هـــەرجۆرە دەوایـــەك بخرێتـــە سەربرین.

● **لَطَّ ١/الباب:** دەرگاکەی داخست. **٢/الشيءَ:** دایپۆشی. **٣/هـ:** بەگۆچان لێیدا.

**لَطّ** گەردن بەند، ملوانکە.

**لَطاط** وشکەساڵی سەخت.

**لَطافة** نەرمی وناسکی.

**لَطّاف** زۆر میهرەبان وبەلوتف.

**لَطَأَ** لکابە زەویەوە.

● **لَطَــثَ ١/هـ:** بەشــتێکی پانکەلــە لێیــدا. **٢/الــشيءَ:** بۆگــەنی کــرد، بۆگــەن بــوو. **٣/الشيءَ:** کۆی کردەوە.

**لَطث** گەندەڵی، بۆگەنیی.

● **لَطَـحَ ١/هـ:** بەبـەری دەسـت یـان بەپـشتی دەست لێیدا.

● **لَطَـخَ ١/الـشيءَ:** پیـسی کـرد، لەکـەداری کرد.

**لَطْخ** کەم لەهەرشتێك.

**لَطِخ** هەرشتێك بەڕەنگێ جیالەڕەنگی خۆی پیس کریاوێ.

**لَطْخَة** پەڵە، لەکە، چەپەڵی.

**لُطَخَة** گەمژە، نادان.

● **لَطَسَ ١/هـ:** بەشـتێکی پـان لێیـدا، بـەردی کێشا بەبەردا.

● **لَطَشَ ١/هـ:** بەدەست لێیدا.

● **لَطَّشَ ١/ثیابَه:** جلەکانیی پیس کرد.

**لَطَعَ** گورگەکە یان سەگەکە ئاوی خواردەوە، مەبەستەکەی بەدەست هێنا.

**لُطَع** پیاوی ناچیزە.

● **لَطَعَ ١/فلاناً:** شەقی هەڵدا لەقنگی.

● **لَطَفَ ١/بفلان:** نـەرمی لەگەڵدا نوانـدو بەزەیی پێداهاتەوە.

**لُطــف** لوتــف، نــەرمی لــەکارو کــرداردا، تەوفیق وبەزەیی خودا.

**لَطَف** دیاریی، کەمێك خواردن، خۆراکی کەم وسوکەڵە.

● **لَطَمَ ١/هـ**: زللەی دالەدەم وچاوی.

● **لُطِمَ ١/الفرسُ**: لایەکی ڕوخساری ڕەنگی سپی تێکەڵ بوو.

**لطیف** بەبەزەیی ونەرم ونیان، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە بەمانای بەبەزەیی بەرانبەر بەندەکانی و دانابە کردەوە گچکەو شاردراوەکان.

**لطیفة** سوعبەت، گاڵتە، شۆخی، نوکتە.

**لطیمَة** میسك، بازاڕی عەتارەکان.

**لَطیم** میسك، ئەسپێك لایەکی دەموچاوی ڕەنگی سپی تێکەڵاو بێت، منداڵێك دایك وباوکی مردبێتن.

● **لَظَّ ١/هـ**: دەری کرد.

**لَظّ** پیاوی توندڕەو وسەخت گیر.

● **لَظِيَ ١/تِ النارُ**: کڵپەی سەند، داگیرسا، بڵێسەی سەند.

**لَظَى** ئاگر، کڵپەی ئاگر، دۆزەخ، بڵێسەی ئاگر.

● **لُعاب ١/** ئاوی دەم، لیك. **٢/النحلِ**: هەنگوین. **٣/الحيَّة**: ژەهری مار.

**لَعّاب** یاریکەر، یاریزان، کەسێك زۆرگاڵتەو یاری بکات.

**لُعاع** گیای نەرم لەسەرەتای ڕوینیدا.

**لُعاعة** بەپیتی، هەرزانی ساڵ.

**لعاة** دەڵەسەگ، مێینەی سەگ.

**لَعِبَ** یاری کرد، گەمەی کرد، وازی کرد.

● **لَعَبَ ١/الصبيُّ**: لیکی دەمی ڕژا، لیك لەدەمی ڕژا.

**لَعِب** یاریی، وازی، گەمە.

**لُعبَة** گەمژەیەك گاڵتەی پێ بکرێت، هەرشتێك گەمەی پێ بکرێت وەکو شەترەنج، پەیکەر.

● **لَعْثَمَ ١/في الأمرِ**: تیایدا ڕاوەستاو سەرنجیدا.

**لَعَجَ** لێدان ئازاریدا وپێستەکەیی سوتاند.

**لُعَج** ئازاری لێدان، ژانی پێداکێشان.

● **لَعْذَمَ ١/في الأمرِ**: تیایدا ڕاوەستاو سەرنجیدا.

● **لَعَسَ ١/هـ**: گەستی، گازی لێگرت.

**لَعَس** ڕەشایی لەلێودا.

**لَعَطَ** پەلەی کرد، خێرای کرد.

**لَعِقَ** لێسایەوە، بەپەنجە یان بەزمان لستیەوە.

**لُعقَة** کەوچکێکی پڕلەهەرشتێك، پڕبە کەوچکێك.

**لَعَلَّ** بەڵکو، شایەد"بەڵکو فلان شتەکە وابێت!".

**لَعْل** بەردێکی بەنرخە.

**لَعَم** ئاوی دەم، لیك.

● **لَعَنَ ١/هـ**: نەفرەتی لێکرد، سەرشۆڕی کردو جنێوی پێداو دوری خستەوە لەبەزەیی ورەحمەت.

●**لَعَنَ ١/ه:** ئازارو ئەشكەنجەیدا.

**لَعْن** نەفرەت، نەفرین، نەعلەت، لەعنەت، جنێو، جوێن.

**لَعنَة** نەفرەت، جنێو، ئازار، ئەشكەنجە.

**لُعْنَة** كەسێك یەكبینەو تاھەنوكە خەڵك نەفرەتی لێبكەن، نەفرەت لێكراو.

**لَعو** بەدخو، بەد ڕەوشت.

**لَعْوَة** دەڵەسەگ، ئەو بازنە ڕەشەیان بۆرەی كەدەوری گۆی مەمكی ئافرەت دەدات.

**لُعْوَة** ئەو بازنە ڕەشەیان بۆرەی كەدەوری گۆی مەمكی ئافرەت دەدات.

**لَعْوس** گورگ.

**لعوق** كەم فام، كەم ئەقڵ.

**لَعْوَقة** چالاكی وسوكەڵەیی وخێرایی لەكاردا.

**لَعين** نەفرەت لێكراو، دەركراو، دەركراو لەبەزەیی، شەیتان.

**لَغا** قسەی بێ سودی كرد.

**لَغَا** دەنگ.

●**لَغا ١/الشيءُ:** پوچەڵ بویەوە. **٢/الرجلُ:** ئومێدبڕاو بوو. **٣/عن الطريقِ:** لایدا لەڕێكەكە.

**لغابَة** گەمژەیی، لاوازیی.

**لَغّاز** ھەرزەگۆ، بەد زوان.

**لُغام** لیكی دەمی وشتر، لیك.

**لَغْب** قسەی بۆگەن وبێ تام، پیاوی كەم فام وگەمژە.

**لَغِبَ** ھیلاك بوو، شەكەت وماندو بوو.

●**لَغَبَ ١/القومَ:** قسەی ناڕاستی بۆكردن.

**لُغْز، لَغْز، لُغَز** كونی مشك، موعەمما، واتای شاردراوەی پەیڤ وقسان، مەتەڵ، مەیتەڵ.

**لَغَط** قسەو دەنگێك ببیسترێت و نەفامرێت.

●**لَغَطَ ١/القومُ:** دەنگیان لێوەھات، دەنگە دەنگ وھەیاھۆیان كرد.

**لَغَفَ** ڕوانی وسەرنجی خۆی تیژكرد.

**لُغْفَة** پاروو.

**لَغَمَ** مین ڕێژی كرد، ئەڵغامی دانا، مینی چاند.

**لُغْم** مین، لوغم، ئەڵغام.

**لَغَم** كەمێك بۆنی خۆش.

**لَغْو** وەڕەی سەگ، قسەی پوچ وبێ سود.

**لَغوب** پیاوی گەمژەو لاواز.

**لُغَويّ** زمانناس، زمان شوناس، پسپۆڕی زمانەوانی.

**لُغَة** زمان، ئەو كۆمەڵە قسەو زاراوە باوەی كەھەرگەل ونەتەوەیەك لەسەری ڕاھاتون وبەكاری دێنن.

●**لَفَّ ١/الشيءَ:** پێچایەوە وكۆی كردەوە.

**لَفّ** پێچانەوە.

**لِفّ** كۆمەڵ ودەستە یەكی كۆبووەوە، باخێك درەختەكانی كۆ وچڕبن.

**لَفات** گەمژە، گێل وكەم فام.

**لُفاظَة** پاشماوەیەكی كەم لەھەرشتێك بێت.

**لِفام** ئەو بەشەی ڕوبەندکە دەخرێتە سەر پەڕەی لوت.
**لَفاء** خۆڵ، خاك، بێ ڕێز.
**لَفا** گۆشتەکەی لەئێسقان کردەوە.
●**لَفَأَ ١/**بەگاڵۆك لێیدا. ٢/**ه** لەپاشملە باسی کرد، غەیبەتی کرد.
●**لَفَتَ ١/الراعي الماشية:** شوانەکە هات بەویژەی ئاژەڵەکانداو دەستی کرد بەلێدانیان بێ ئەوەی گوێ بدات بەرکام لەئاژەڵەکان دەکەوێت.
**لفت** ژنی کەم ئەقڵ، مانگا، چێڵ، شێلم.
**لُفَتَة** شوانێك هەمیشە لەئاژەڵەکانی بەردەستی بدات بێ ئەوەی گوێ بدات بەرکامیان دەکەوێت.
**لَفَج** سەرشۆڕیی.
●**لَفَحَ ١/فلاناً:** بەشمشێر لێیدا. ٢/**ه:** کێشای بەسەریدا.
**لَفَظَ** بێژای، بەزمان گوتی.
**لَفظ** قسە، پەیڤ، واژە، هەرگوتەیەك بەزمان دەربپردرێت و لەدەم بێتە دەرێ.
**لَفظي** واژەیی، زارەکی.
●**لَفَعَ ١/ته النار:** کەوتە بەرتێنی گەرما. ٢/موی سپی هەموو قژی سەری گرتەوە، سەری سپی بوو.
●**لَفَعَ ١/فلان:** زۆری خوارد، زۆر خۆری کرد.

●**لَفَقَ ١/الحديث:** قسەی هەڵبەست و بەدرۆ ڕازاندیەوە.
**لَفَمَ** ڕوبەندی لەسەرلوتی بەست، پەچەی لەسەر دەم وچاوی بەست.
**لَفُوت** پیاگی بەد ئاکار، ژنێ قسە بهێنێ و ببا، ژنێ چاوی بەهەمیشە یی بەلاو لادا بگێڕێت، وشترێ لەکاتی دۆشیندا زۆر بێ ئارام بێت.
**لَفَّة** شاشك، عەمامە.
**لفيف** کۆمەڵێك درەختی زۆر لەجێگەیەکدا کۆبوبێتەوە، کۆمەڵێك خەڵکی هەمەچەشن کەپێك هاتبن لەلاوازو بەهێزو ناچیزە و گوێڕایەڵ ویاخی و بەشەرەف ودەوڵەمەند وهەژار. . . هتد.
**لفيفة** کۆمەڵ و دەستە، جگەرە.
●**لَقَّ ١/عينه:** کێشای بەچاویدا.
**لَقّ** درز لەزەویدا، زەوی بەرز، هەرزەویەکی تەسکی لاکێشەیی.
**لِقاح** ناوی نێرەی ئەسپ و وشتر، نوتفەی ئەسپ و وشتری نێر.
**لَقاح** ئەوەی خورمای پێ موتروبە دەکرێت.
**لُقاح** کوتان، دەرمانێ دەدرێتە مرۆڤ و گیانلەبەران بۆ پاراستنیان لە نەخۆشیە درمەکان.
**لُقاط** ئەو گوڵە گەنمەی کەدرەوکەر دروێنەی ناکات وخەڵکی گوڵچنی دەکەن.

**لُقَاع** مێشی سەوز کەزۆر مرۆڤ دەگەزێت.
**لُقَاع** کەمژەو کەم فام.
**لَقَافَة** زیرەکی.
**لَقَانَة** خێرایی تێگەشتن.
●**لَقَّبَ ١/فلاناً**: نازناوی لێنا.
**لَقَب** نازناو.
●**لَقَحَ ١/النخل**: پێوەنی کرد، متروبەی کرد.
●**لَقَزَ ١/ه** بەمشت لێیدا، بەبۆکس لێیدا.
●**لَقَسَ ١/ه** عەیب داری کرد.
**لَقِس** کەسێك گاڵتە بەخەڵکی بکات ونازناوی زۆری خراپیان پێوە بنێت، زیرەك، دانا.
**لَقِصَ** تەنگ بوو، هاتەومیەك، تەسك بویەوە.
**لَقِص** تەنگ، تەسك، هەڵپەکەر بۆ خراپە.
●**لَقَطَ ١/الشيء**: بەبێ هیلاك بون لەزەوی هەڵیگرت، دۆزیەوە، دیتیەوە.
**لَقَط** پارچە وردەی ئاڵتون کەلە کانگەکەدا دەمێنێتەوە.
**لُقَطَة** کاڵای هەرزان، هەرشتێك لەکەزەویدا کەوتوە ودەدۆزرێتەوە، دۆزراوە.
●**لَقَعَ ١/فلاناً**: عەیب داری کرد.
●**لَقِفَ ١/الحوض**: لەبنکەوە بنکەن وفراوان بوو.
**لَقَف** لاپاڵی بیر، حەوز.
**لَقْف، لَقِف** پیاوی ڕۆح سوکی زیرەك.
**لَقْلَقَ** مارەکە زمانی دەرهێنا.
**لَقْلَق** حاجی لەقلەق، باڵدارێکی سپی و ڕەشی زۆر لنگ ودندوك درێژە لەناو ئاوایی لانەدەکاو گۆشتی ناخورێ گەرمێن و کوێستان دەکات.
**لَقِمَ** بەپەلە خواردی.
**لَقَم** ناوەڕاستی ڕێگە.
**لُقْمَة** پاروو.
**لَقُنَ** زیرەك وزیر بوو.
●**لَقَّنَ ١/ه** تێی گەیاند.
**لَقِن** کەسێك بەخێرایی لەشت حاڵی بوێت.
**لَقَن** تەشتولکەی لەمس دروستکراو.
**لِقْوَة** نەخۆشینێکە دوچاری دەم وچاو دەبێت ودەم لاردەکات.
●**لَقِيَ ١/فلاناً**: چاوی پێی کەوت، دیداری لەگەڵدا کرد.
**لُقَى** باڵندەکان، ئازارەکان.
**لَقًى** شتی فڕێ دراو.
**لُقَيْس** دواکەتو لەکاتی خۆی.
**لَقِيط** منداڵی زۆڵ، منداڵێ توڕدرابێت، منداڵێك بە ناشەرعی لەدایك بوبێت.
**لَقِف** پیاوی ڕۆح سوکی زیرەك.
●**لَكَّ ١/ه**: بەمشتەکۆڵە لێیدا. **٢/الشيء**: تێکەڵاوی کرد.

● **لكّ ١/ هـ** گۆشت، یەك سەد هەزار ڕوپیە، بۆیەیەكی سورە پێستەی پێ ڕەنگ دەكەن.

**لَكَ** بۆتۆ.

**لُكَـاثْ** گـەچ دروسـت كـەر، نەخۆشـیەكی وشترە پەڵە لەدەمی وشتردا دروست دەكات.

**لُكَاثِيّ** زۆر سپی، هەرشتێ زۆر سپی بێت.

**لكاة** پێستەیەك بە(لەك) ڕەنگ كرابێت.

● **لَكَـــأَ ١/ فلانـــا،** بەقامــچی لێیــدا، دای بەئەرزدا.

**لَكَثْ** چڵكی پێوە لكا.

**لَكَـثْ** چـڵكی وەك شـیر كەوشـك دەبێتـەوە بەدەفرەوە.

**لَكَثَة** وشتری قەڵەو.

● **لَكَحَ ١/ هـ** لێیدا.

● **لَكَدَ ١/ هـ** لێیدا یان پاڵی پێوەنا.

**لَكَد** بەرچاو تەنگی بەد ئاكار.

**لَكَدَ** چڵكی پێوە لكا.

● **لَكَـزَ ١/ هـ** بەمـشتەكۆڵە لێیـدا، بـەبۆكس لێیدا.

**لَكَز** بەرچاو تەنگ.

**لُكَـعْ** منـداڵی بـچوك، چـەپەڵێی، گەمـژەو نادان، كۆیلە، بەندە، ناچیزە.

**لُكَعَة** ژنی ناچیزە.

**لَكِعَ** بێ ئەقڵ وگەمژە بوو.

● **لَكَـمَ ١/ هـ** بـە مـشتەكۆڵە لێیـدا، پـاڵی پێونا.

**لَكْمَة** مشتەكۆڵە، بۆكس لێدان.

**لَكِنَ** زمانی قورس بوو.

**لكِنْ** بەڵام، وەلێ.

**لَكَـنْ** دەفرێكـی لـەمس دروسـتكراوە شـتی تیادەشۆرن وهەویری تیادەشێلن.

**لكيع، لكوع** ناچیزە.

**لكَيْ** بۆ ئەوەی.

**لَمّ** كۆی كردەوە.

**لَمّ** كۆمەڵێكی زۆر.

**لُمّ** كەم ئەقڵ بوو.

**لَمّا** هەركە، هەرگا.

**لمّا** جۆرە ماسیەكە.

**لَمَـــاج** كـەمتر لـەوەی كـە دەخورێـت، دەگوترێـت: ( **ماتلمجت عنـده بلماج** لای ئەو تامی هیچم نەكردو هیچم نەخوارد).

**لَمَازْ** قسە هەڵبەست، قسە هێنەرو قسەبەر.

**لَمَاسَة** پێداویستی.

**لُمَاظَــة** پاشمـاوەی خـواردن لەدەمـدا، پاشماوەی هەرشتێكی كەم.

**لَمَاظَة** زمانپاراویی وڕەوانبێژی.

**لَمّاع** زۆر بریكەدار، بریقەدار، تابان.

**لَمّاعَــة** دەشــت كــە تراویلكــە تیایــدا بیریكێتەوە.

**لُمَاك** سورمەی چاو.

● **لَمَأ ١/ هـ** دەستی كێشا بەسەریدا.

● **لَمَجَ ١/ الشيء:** بەلادەمی خواردی.

**لَمج** زۆر خۆر.

**لَمَحَ** نیگای چاوی پێدا، فنگە چاوی تێ بڕی، ئامازەیدا.

**لَمْحَةٌ** بەپەلە نیگا تێبڕین، بەپەلە سەرنج دان.

**لَمَّحَ** ئامازەی کرد، ئامازەیدا.

**لَمَدَ** خۆی بەکەم گرت و زەلیلی خۆیی نیشاندا.

**لَمَذَ** بەلادەمی خواردی.

**لِمـاذا** بۆچی؟ لەبەرچی؟ وشەیەکە بۆ پرسیارکردن بەکار دەهێنرێت وپێکهاتوە لەسێ بەش(**لام**) ی تەعلیل و(**ما**) ی ئیستفهام و(**ذا**) ی ئیشارە.

●**لَمَـزَ** ١/ه عەیب داری کرد، بەچاو ئامازەی پێکرد لەگەڵ قسەیەکی ژێرلێودا. ٢/ه پاڵی پێوەنا، لێیدا.

●**لَمَسَ** ١/ه دەستی لێدا، دەستی پیادا خشاند.

**لَمْس** دەست لێدان، بریتیە لەیەکێك لەپێنج هەستەکانی مرۆڤ و بەهۆیەوە هەست بەگەرمی وساردی و وشکێتی وشێداری هەرشتێك دەکرێت لەکاتێکدا دەست لەشتەکە دەدرێت.

●**لَمَصَ** ١/بەپەنجە هەنگوینەکەی برد بۆ دەمی ولستیەوە. ٢/**الصبيَّ** میزی کرد.

**لَمْص** لەپاشملە باسکردنی خەڵك، غەیبەت کردنی خەڵك.

**لَمَظَ** شڵەژان.

**لَمَظَ** لەدوای خواردن زمانی دەرهێناو لێو وددانەکانی خۆیی پێ پاککردەوە لەچەوری وشتی تری خواردنەکە، زمانی دەرهێنا، زمانەی کێشا.

**لَمَظ** سپیایی لەلچی خوارەوەی ئەسپدا.

**لُمظَـةٌ** کەمێك چەوری کەبەپەنجە هەڵبگیرێت.

**لَمَعَ** درەخشایەوە.

●**لَمَّعَ** ١/**النسيجَ** رەنگاو ڕەنگی کرد.

**لُمَعَة** کۆمەڵێك خەڵك.

●**لَمَـقَ** ١/ نوسیی، کوژاندیەوە. (لە وشەدژەواتاکانە) کوێری کرد. ٢/**اليهِ** سەیری کرد، سەرنجیدا.

**لَمُوص** زۆر درۆزن، زۆر فێڵباز.

**لَموع** درەخشاو، بریکەدار.

**لَمون** لیمۆ.

**لُمَّة** هاوڕێی سەفەر.

**لُمَّة** کۆمەڵ و دەستە، هاوڕێ لەسێ کەسەوە تاکو دەکەس.

**لَمیَ** لچی ڕەش هەڵگەڕا.

**لَمیس** ئافرەتی نەرم ونۆڵ وخرپن.

**لَمیك** پیاوێ هەردوو چاوی بەکل ڕشتبێت.

**لَنْ** هەرگیز نەء، نەء، نا، وشەیەکە بۆ(نصب ونفی و استقبال بەکار دەهێنرێت) وەك لەم ڕستەیەدا دەردەکەوێت ( **لن افعل المنكر**

**مابقيت**- تاكو ماوم هەرگيز كارى خراپە ناكەم).

**لَوْ** ئەگەر.

**لؤلوئة** دانەى مروارى.

**لواب** ئاوى دەم، ليك.

**لُوَاثة** كۆمەڵ ودەستە.

**لوّاز** بادەم فرۆش.

**لَوازِم** پێداويستيەكان.

**لَـــوَاص** هـــەنگوينى پوخـــت، هـــەنگوينى پاڵفتەى بێ خەوش.

**لِواطة** هەتيو بازى، نێربازى.

**لواصِب** چاڵ وبيرى تەنگ.

**لَوّام** زۆر لۆمەكەر.

**لَوّامَة** دەرونێك لۆمەى خاوەنەكەى بكات.

**لَواء** پەرچەم، بەيداخ.

**لُوَب** هەنگ، مێشەنگوين.

**لَوَث** زام وبرين، تواناو هێز.

**لَوث** خاوەخاوى كرد لەكاردا.

● **لَوَثَ ١/ـه** پيسى كرد، لەكەدارى كرد، لێڵى كرد.

**لَوْث** بەلگەى لاواز وناتەواو.

**لُوثَة** زۆرى گۆشت وبەز.

**لَوْثَة** گەمژەيى وبێ ئەقڵێتى.

**لَوَّحَ** ئاماژەى كرد لەدورەوە.

**لَوْح** لەوح، هەرڕوبەرێكى پانكەلەى تەختە يان. . . هتد.

**لُوْح** بۆ شايى وهەواى نێوان ئاسمان و زەوى، تينوێتى.

**لَوحَة** تابلۆ، تەختەى نيگارتكێشان.

**لوذعيّة** دانايى.

**لَوْز** بادەم، بادام.

**لَوْس، لُوس** خۆراك.

**لَوْص** هەنگوينى پاڵفتەى خوارد.

**لَوْص** گوێ يەشە، گوێچكەيەشە.

**لَوْط** سوو، ڕيبا.

**لوعَـة** ڕەنـج و ناسۆرى دڵتـەنگى ودڵـدارى، ڕەشـايى يـان بـۆرايى دەورى گـۆى مـەمكى ئافرەت.

**لَوْف** خواردنێ دڵ بۆى نەچێت.

**لَوَق** بێ ئەقڵى.

● **لَوَقَ ١/ـه** چەماندييەوە.

**لُـــوق** هەرشـتێكى نـەرمى وەكـو چێـشت و خواردن.

**لُوفا** ئينجيلى لوقا.

**لَوْقَة** سەعات، كاتژمێر، سات.

**لـــولا** ئەگـەر نـەبێت، ئەگـەر نەبوايـە، دەگوترێـت (**لـولا زيـدا لاكرمتـك**- ئەگـەر زەيد نەبوايە).

**لولاء** سەختى وتەنگانە.

**لوء لووة** دانەى مروارى.

● **لَوَّم ١/لاماء** پيتى لامى نوسى. ٢/ـه زۆر سەرزەنشتى كرد.

**لُومَـة** کەسـێك خـەڵکی زۆر سەرزەنـشتی بکەن.

**لُوَمَـة** کەسـێك زۆر سەرزەنـشتی خـەڵکی بکەن.

**لَوَّنَ** ڕەنگی کرد.

**لَوْن** ڕەنگ، جۆر.

**لَونيّ** ڕەنگی.

**لَوَه** بریکەی تراویلکە.

**لُوَّة** چیلکەیەکە بخوردی پێ دەکەن.

**لَوَى** چەمانەوە لەپشتدا، ئازاری گەدە.

**لُـوَى** شـتی پڕوپـوچ وبـێ نـاوەڕۆك، درۆو دەلەسە.

**لَوِيَّـة** ئـەو بەشەچێـشت وخۆراکـەی کـەبۆ کەسێکی تری دەشاریتەوە.

**لَهـا** یـاری کـرد، گەمـەی کـرد، وازی کـرد، بەهەمان واتای (لَهْ) دێت لەباری تەئنیسدا.

**لُهاب** تینوێتی، تینگێتی.

**لُهابَة** تورەکەیەکە هەڵی دەواسن بە لایەکی کەژاوە وبارداو پێی لارەسەنگ دەکەن.

**لُهَـاث** گـڕی تینـوێتی لەهـەناودا، سـەختی سەرەمەرگ.

**لُهاس** خواردنی کەم، خواردەمەنی کەم.

**لهاعَة** بێ ئاگایی.

**لَهَاق** گای سپی، هەرشتێکی سپی.

**لُهَام** سوپای مەزن، لەشکرێکی گەورە.

**لَهانَة** کەلەرم، گیایەکی چاندنی گەڵا پانـە بەتۆپ دەردەچێ و پـەلکی دەکرێتـە دۆڵمـە پەلکی زۆر سپی و تورتە، کەلەم.

● **لَهَـبَ ١/النـارَ** ئـاگری داگیرسـاند تـاکو بڵێسەی سەند.

**لَهَب** زمانەی ئاگر، بڵێسە.

**لُهْبَة** تینوێتی.

**لَهَـثَ** لـەتینوێتی یـان لەهیکیـدا سـەگەکە زمانی دەرهێنا.

**لَهِثَ** تینوی بوو.

**لَهثان** پیاوی تینوو.

**لُهْثَة** تینوێتی، هیلاکیی، ماندوێتی.

● **لَهِـجَ ١/ بالـشيء** حـەزی لێکـرد وپێـی سەرسام بوو.

**لَهْجَة** دیالێکتی زمان، شێوە زار.

**لَهَدَ** خواردی، لێسایەوە.

**لَهْد** پیاوی قورس وقەڵەو.

**لَهْذَم** بڕیی.

**لَهْذَم** شمشێری تیژی بڕندە.

● **لَهَزَ ١/القومَ** تێکەڵاوی لەگەڵدا کردن.

**لَهِز** توندوتیژو پتەو.

**لَهِسَ** لستیەوە، لێسایەوە.

**لَهْـسَمَ** هەرچـی لەسـەر سـفرەکەدا بـوو خـواردی، هـەموو شتەکانی سـەر سفرەکەی خوارد.

● **لَهَطَ ١/هُ** بەچەپازللە لێیدا، زللەی لێدا.

● **لَهَطَ ١/الثوبَ:** دروماني كرد.

**لَهِفَ** بۆ ئەوشتەی کەلەدەستی دەرچوو بوو خەفەتی خواردو نیگەران بوو.

**لُهِفَ** ستەمی لێکرا.

**لَهْف** حەسرەت.

● **لَهَقَ ١/الشيءُ:** زۆر سپی بوو.

**لَهِق، لَهَق** گای سپی، هەرشتێکی سپی.

**لَهَمَ** قوتیدا.

**لِهَم** هەرشتێکی بەتەمەن وبەساڵاچوگ.

**لُهَمّ** پیاوی زۆر خێرەو مەن، دەریای مەزن، زەریا.

● **لَهَنَ ١/القومَ:** بەرکوتی پێدان، ناشتاشکێنی پێدان.

**لَهْوُ** زنێ خەلکی پێی ڕابوێرێن، تەپڵ، هەرشتێ مرۆڤ پێی ڕابوێرێت.

**لَهوف** قەڵەو، درێژ.

**لَهوم** پیاوی زۆر خۆر، مێینەی شیرداری وشتر.

**لهيب** زمانەی ئاگر.

**لهيد** حوارپێی شەکەت وماندوکراو.

**لَهيعة** بێ ئاگایی، تەمبەڵیی، تەوەزەلیی.

**لَهيف** بێچار وستەملێکراو، گرفتارو بەرێشانی ڕۆژگار.

**لَيَاح، لِياح** بەیانی، سپێدە، بەرەبەیان، هەرشتێکی سپی.

**لياط** سوو، ڕیبا، گەچ، قسڵ، ڕەنگ.

**لياغة** نادان وگەمژە.

**لَيَاق** دامەزراویی و سەقامگیری لەکاردا.

**لِياق** ڕوناکی ئاگر.

**لياقة** لیاقەت، لێهاتویی.

**لَيَاء** زەوی دوور لە ئاو.

**لِيَاع** بای توندیان بای گەرم.

**لَيْتَ** کاشکای، بریا، خۆزگە.

**لَيْث** شێری بێشەو جەنگەڵ، هێزو توانا.

**لَيْثة** مێینەی شێری بێشەو جەنگەڵ.

● **لَيَّثَ ١/الرجلُ:** وەکو شێری لێهات، لەئازایەتیدا وەکو شێری لێهات.

● **لَيِسَ ١/الرجلُ:** بویە ئازاو چاونەترس. **٢/عنه:** لێی بێئاگا بوو.

**لَيْسَ** وشەیەکە بۆ (نەرێ) کردنی حاڵ بەکار دەهێنرێت.

**لَيط** ڕەنگ.

**لِيط** ڕەنگ، جۆر، پێست، بەرگ وپێستی هەرشتێ.

**لِيطة** کەوان، کەمان.

**لَيَغ** گەمژەیی ونادانی تەواو.

**ليف** توێکڵ یان پێستی درەختی خورما.

**لَيَّقَ** نەرمی کرد.

**لِيَق** توێەڵە هەوری بچوکی پرژوبڵاو.

**لَيل** شەو.

**لَيْلة** یەك شەو.

**لَيْليّ** شەوانە.

**●لَیْلَـی ٨/الخمـر،** سـەرەتای مەست بـون بەمەی.

**لَیْمون** لیمۆ، بەری درەختی لیمۆ.

**لَیَّنَ** نرمی کرد.

**لَیِّن** نەرم.

**لِینَة** نەرمی.

**لَیْنَة** تەکیەگاهی نەرم.

**لَیَّة** چەماوەیی، کووڕیی.

**ماء** ئاو، ئاف ئاب.

● **مـــاءُ ١/العــذب:** ئـاوی شـیرین، ئـاوی سـازگار. **٢/المـالح:** ئـاوی سـوێر، سـوێراو، ئـاوی تێکـەڵ بـەخوێ. **٣/ الزهـر:** ئـاوی گوڵ، گوڵاو. **٤/الوجه:** ئاوی ڕوو، ئابڕوو. **٥/اللحم:** ئاوی گۆشت. **٦/ الـذهب:** ئـاوی ئـاڵتون. **٧/ الـشباب:** ترۆپکـی لاوێتـی، هـەڕەتی گـەنجی. **٨/الـورد:** گـوڵاو، ئـاوی لەگوڵ دەرهێنراو بەدڵۆپاندن.

**مَئِـــر، مِئَـــر** خراپـەکار، فیتنـە گێـڕ، ئاژاوەچی، تێکدەروگەندەڵ.

**مِئَرة** دوژمنـی، دوژمنایـەتی، کینـەو ڕق، قسە هێنان و بردن.

● **مَئِـق ١/الرجـل:** خـەریك بـوو لەبـەر توڕەیی وقین بگری.

**مَئِق** کەسێك بـەخێرایی دەست بـەگریان بکات، گرینۆك.

**مَئِنّة** ئاماژە، نیشانە.

**مِئَوِیّ** سەدی، سەدساڵە.

**مَئِیْد** ناسك، نازك، بەناز پەروەردە.

**مآب** شوێنگەڕانەوە.

●**ما ١/**ئـامرازی نـەفی کردنـە، وەك ئـەم نمونەیە: **ماهذا بشرا.** ٢/ ئامرازی **زائـدة** یە، وەك ئەم نمونەیە: **فبمارحمة من الله لنـت لهـم. ٣/** ئـامرازی **اسـتفهامیه** بـۆ پرسـیار لـەنائاقڵ، وەك ئـەم نمونەیـە: **ماعنـــدك؟** هـــەروەها پرســـیاری پـــێ دەکرێـــت لەســـیفات وخەســـڵەتەکانی ئاقڵێك: **مازید؟.** لەوەڵامـدا دەگوترێت بۆ نمونــە: **عاقــل اواحمــق. ٤/**وەك ئیـسمی مەوصول بەکاردێت لەڕستەدا، وەك ئـەم نمونەیە: **ماعندکم ینفد وماعندالله باق.** ٥/ وەك ناوێك بـۆ **ابهام** بـەکاردێت، وەك ئـەم نمونەیـە: **اعطنـی کتابـا مـا**. . . . هتد.

**مائِـــت** نزیـــك بـــەمردن، لـــەحاڵی سەرەمەرگدا.

**مائِج** شەپۆلدار، پێلدار، مۆنجدار.

**مائِـــد** خـــواروخێچ، کەســـێك توشـــی سەرسوڕێ بوبێت بـەهۆی مەسـتی یـان سەفەری دەریاییەوە.

**مائِـدة** سـفرە، خـوان، خـودی خـواردن، زۆری نان خواردن.

**مائِر** پیاوی کەم ئەقڵ.

**مـــائِرة** بەهـەمان واتـای **مـائر** دێـت لـە حاڵەتی تەئنیسدا.

**مـــائِس** پیاوێـك بـەدەم ڕۆشـتنەوە کـەش وفش بکات.

**مائِع** چـەوریی تـواوە، گـەلحۆ، گێـل، کـاڵ فام، گەمژە.

**مائِق** گەلحۆ، گێژ، گێل، کاڵ فام، گەوێل.

**مـائِلات** ژنانێـك لەبـەر مـەکروناز بـە لەنجەولار بەڕێدا بڕۆن، ژنانێك حـەزیان لەداوێن پیسی بێت.

**مائِل** کەچ، خواروخێچ.

**مائِی** ئاوی، ئاڤی.

**ماتَ** مرد، گیانی دەرچوو، کۆچی دوایی کرد.

●**مـاتَ ١/ جوعـاً:** لەبرسـاندا مـرد. **٢/بـرداً:** لەسـەرماندا مـرد، ڕەق بویـەوە. **٣/الحَرُّ:** گەرما نـەماو کۆتـایی هـات. **٤/تِ النارُ:** ئاگرەکە دامردەوە، خۆڵەمێشەکەی ساردبویەوە.

**مـاتِع** درێـژ لـە هەرشـتێك، هەرشـتێکی باش، خەڵی زۆر سور، پیاوێك کامـڵ بێـت لەڕوی خەسڵەتەکانی خێرەوە.

**مَاتَم** عەزاداری، پرسە.

● **ماثَ ١/الشيءَ بالشيءِ:** تێکەڵاوی کـرد، ئاوێتەی کرد.

**ماثِل** چاودێر، دیدەوان، دیدەبان.

● **ماثَلَ ١/هُ بفلان:** لێکی چواند بـەفلان کەس.

**ماثِلة** چل چرا.

● **ماجَ ١/البحرُ:** شەپۆلی دا. **٢/عن الحق:** لایدا لەهەق.

**ماجّ** کەسێك بەهەمیشەیی ئـاوی دەمـی بێتە خواری، لیکن.

**ماجِد** سەربڵند وخاوەن عیزەت، ڕەوشـت جوان، بەخشندە.

**ماجِـــدة** وشـــترێك کەوتبێتـــە نـــاو لەوەڕگایـــــەکی زۆرەوەو تێــــــری لێ خواردبێت، زۆر لەهەرشتێك.

**ماجِعةَ** ژنـی کـەم ئـابڕو، ژنـی زیناکـەرو داوێن پیس، قەحبە، حیز.

**ماجِـل** ئـاو لـەدامێنی چیادا یـان لـەناو شیودا.

**ماجِن** کوستاخ، چەداوە ڕوو.

● **مـاحَ ١/الرجـلَ:** سـودی پـێ گەیانـد. ئاوی بەمشت دەرهێنا. **٢/الرجلَ:** بەفیزو لـوت بەرزیـــەوە دەرۆشـــت بـــەرێگاداو سەیری سێبەرەکەی خۆشی دەکرد.

**مـاح** زەردێنـەی هێلکـەی مریـشك یـان سپێنەکەی، جل وپۆشاکی کۆن.

**ماحِش** زۆر خۆری ورگ زل.

**ماحِض** کەسێك ئـارەزوی شـیری پاڵفتـەی بێ تێکەڵە بکات.

**ماحِقٌ** توندوتیزی گەرمای هـاوین، ڕۆژێ زۆر گەرم بێت.

**ماحَكَ** دوژمنی کرد، دوشمنی کرد.

**ماحِل** دوژمن، زەوی بێ بەروبوم.

**ماحة** حەوشەی ناوماڵ.

**ماحِی** پێغەمبەر (د. خ)چونکە کوفری بنەبڕکرد.

**ماخِرة** کەشتی.

**ماخِض** ژنی تازە زاو، زەیسان.

**ماخور** قەحبەخانە، جێگەی کۆبونەوەی فاحیشەگەران.

● **مادَ ١/هـ**: دەست بەدەستی پێکرد، ئەمڕۆو بەیانی پێکرد، درێژی کردەوە.

● **مادَ ١/الغصن**: لار بویەوە. **٢/الرجل**: کەش وفش وفیزی کرد، توشی سەرە سوڕێ بوو بەهۆی مەستی یان سەفەری دەریایی کردنەوە. **٣/الرجل**: سەردانی کرد.

**مادِح** ستایشەگەر، سوپاسگوزار.

● **مادَحَ ١/هـ**: ستایش ومەدحی کرد.

**مادِخ** گەورەو سەربەرز.

● **مادَخَ ١/هـ**: پارمەتیدا وهاوکاری کرد لەسەرخێریان شەڕ.

**مادّة** مادە، تـوخم وپێکهاتەی هەرشتێك کەقەبارەو بارستایی هەبێت وبۆشاییەك داگیربکات.

**مادّي** دنیایی، پارەو دنیاپەرست، کەسێك بیـژێت جگە دنیای مادە هیچ بویەکی دیکە نیە، کەسێك بڕوای بەفەلسەفەی ماتەریالیزم هەبێت.

**مادِّیـة** فەلسەفەی ماتەریالیزم ومادەپەرستی.

**مادی** مۆڵەتیدا.

**ماذا** ح شتێك؟، چی؟.

● **ماذَقَ ١/ فلانا فی الود**: بەڕاستی خۆشەویستی لەگەڵ نەکرد.

**ماذِیّ** هەنگوین، هەرچەکێکی لەئاسن دروستکراو.

**ماذِیّة** زرێی سپی، زرێی سپی کەجەنگاوەران لەکۆندا دەیانپۆشی.

**مارّ** ڕێبوار، ڕەفتەنی.

● **مارَ ١/البحر**: شەپۆلیدا. **٢/الشیء**: لەریەوە، جموجوڵی بەملاو لاداکرد. **٢/عیاله**: خواردنی بۆ هێنان.

**ماری** کێشمەکێشی کرد.

**مارِج** تیشکی ئاگری زۆر بەتین تێکەڵ بەڕەشی ئاگر.

**مارِخ** ئاوی ڕەوان، ئاوی لەبەر ڕۆشتوو.

**مارِد** سەرکەش، شەیتان، بڵند، بەرز.

● **مارَسَ ١/الأمر**: پێوەی خەریك بوو، سەرقاڵ بوو، خۆی تێوەگلاندو مومارەسەی کرد.

**مارِض** نەخۆش، ناساغ، ناتەندروست.

●**مارَغ** ١/هـ فێڵی لێکرد، چاوبەستی لێکرد.

**مارِغ** گەمژە، گەلحۆ، گێل، نادان، کەم فام.

**مارِق** کەسێك لەدین دەرچوبێت.

**مارِقَة** گروپێك لەخەواریجی نەهرەوان، خەواریج چونکە لەدین دەرچون.

**مارِن** نەرمەی لوت، لوت.

**مارِنان** هەردوو کونەلوت.

**مارُونی** گاوری لوبنانی، مەسیحی لوبنانی.

**مارِيّ** گوێرەکەی سپی درەوشاوی بێ لەکە، پۆشاکی کۆنە.

**مارِيّة** مانگایەك گوێرەکەی سپی درەوشاوی بێ لەکەی ببێت.

●**مازَ** ١/الشيءَ جیای کردەوە. ٢/فلان لەجێگەیەکەوە چو بۆجێگەیەکی تر.

**مازال** هەمیشە، یەکبینە، تا ئێستاش.

●**مازَجَ** ١/هـ تێکەلاوی کرد.

**مازَحَ** شۆخی کرد، گاڵتەی کرد، سوعبەتی کرد، گەمەوگاڵتەی کرد.

**مازِح، مَزّاح، مُزاح**: نوکتەباز، سوعبەتچی.

**مازِن** هێلکەی مێروله، گەرای مێروچه.

**مازوت** نەوتی ڕەش، پترۆڵی ڕەش.

**مازور** ماسی گرە، ماسی گرەك، ماسی خۆرە، ماسی گیرە.

**مازِيّ** دوور وپێچەوانە.

●**ماسَ** ١/الرجلُ چاکی کرد، تاشی. ٢/الرجلُ بەفیزوکەش وفشەوە ڕۆشت بەرێگەدا.

**ماس** ئەڵماس، بەردێکی زۆر سەخت وبەنرخە، هەرپێداویستی یەکی زۆر گرنگ.

●**ماسا** ١/هـ گاڵتەی پێکرد.

**ماسِح** درۆزن، زۆر درۆزن.

**ماسِحَة** ئارایشت کەر، کەسێك پیشەی ئارایشت کردن بێت.

**ماسِخِيّ** کەوان ساز.

**ماسِط** ئاو وگیای سوێر.

**ماسورة** لوله، بۆری.

**ماسُونِيّة** ماسۆنیەت، ڕێکخراوێکی جیهانی نهێنیه.

**ماسِیء** بێ باك، بێ دەربەست.

**ماش** بیادەڕەو.

● **ماشَ** ١/الشيءَ بالشيءِ تێکەلاوی کرد، ئاوێتەی کرد.

● **ماشا** ١/هـ لەگەڵیدا ڕۆشت، لەتێکیدا ڕێڕەوی کرد.

**ماشِط** ئارایشتگەر، کەسێك پیشەی ئارایشت کردن بێت.
**ماشِطة** ژنی ئارایشتگەر.
● **ماشَقَ ۸/ە** شەڕە جنێوی کرد لەگەڵیدا، شەڕەجوێنی کرد لەتەکیدا.
**ماشِل، مَمشُول** پیاوی لاوازی کەم گۆشت.
**ماشِيَة** چوارپێ، ئاژەڵ، مەڕو مانگاو بزن و وشترو. . . هتد.
**ماصَ** بەدەست هەڵی گلۆفت.
**ماصِر** وشترێك کەم کەم شیر لەگوانی بێتەدەر نەك بەخێرایی، پەردەو بەربەستی نێوان دووشت.
**ماصَعَ** جنێویدا.
**ماصِع** بریکەدار، ئاوی سوێر، ئاوێکی کەمی لێڵ، وشترێك شیری کەم بێت.
**ماصِل** شیرو دیاریی کەم.
**ماضِ** تیژ، برندە، شمشێر، ڕابردوو، لای زانایانی نەحوو فرمانێکە دەلالەت بکات لەوەختێکی پێشتر لەو کاتەی هەنوکە تۆی تێدایت.
**ماضِح** لەکەدارکەری ناموس و ئابروی کەسێك.
**ماضِر** شیری ترش، شیری ترشیاگ، شیری ترشەڵۆك کەزمان بسوڵێنێتەوە.

**ماضِغان** دووڕەگی ژێرچەناکە.
**ماضِغَة** گەمزە، گەلحۆ، گیل، کاڵ فام.
**ماضِيّ** شێری بێشەو جەنگەڵ، ڕابردوو، شمشێری تیژ، پێشینان.
● **ماطَ ۸/عن کذا:** دورکەوتەوە. **۲/ە** دوری خستەوە. **۳/الرجلَ:** ستەمی کرد، تۆبزی کرد.
**ماطِخ** نەسپی نەرم ڕەفتار.
**ماطِر** هەوری بەباران، باراناوی.
**ماطِع** پاڵفتە، پاکژ، بێ خەوش، خۆلاسە.
● **ماطَلَ ۸/ە** دەسی دەسی پێکرد، دەس بەدەستی پێکرد، ئەمڕۆو بەیانی پێکرد.
● **ماظَّ ۸/ە** دوژمنایەتی کرد جنێوی پێدا.
**ماعَ** بەسەر زەویدا پەڕاکەندە بوو وڕژا.
**ماعِز** بزن، ئاژەڵی بەشاخ وریشی دایکی گیسك وکار، هەرشتێکی ڕەق وسەخت.
● **ماعَكَ ۸/ە** بۆقەرزەکەی دەستاو دەستی پێکرد، مۆماتەڵەی پێکرد.
**ماعون** باران، ئاو، هەرچی کەلوپەلێك سودی لێ ببینرێت لەناو ماڵدا وەك قاپ و قاجاخ و تەورو. . . هتد، زەکات، گوێ ڕایەڵی، هەرکاریکی چاك، بڕێکی دیاری

کــراو کاغــەز ژمارەکــەی بگاتــە (٥٠٠) گاغەز.

●**ماغَ ١/السنور:** دەنگی هەڵبڕی.

●**ماغَثَ ١/ه:** دژایەتی کرد.

**مافَعَلَ** چــی کــرد؟ چ کــارێکی کــرد، چ کردەوەیەکی لێ وەشایەوە؟.

● **ماقَ ١/الرجل:** کەم فام بوو، فامی کەم بوو. ٢/**المبیع:** هەرزان بوو.

●**ماقَــتَ ١/الرجــل:** زۆری بوغزانــد، بوغزاندی.

●**مــاقَسَ ١/ه:** یــەکتریان نقــوم کــرد لەئاودا.

**ماقِط** گوریسی دۆڵچە.

● **ماقَــلَ ١/ه:** یــەکتریان نقــوم کــرد لەئاودا.

**ماکِـث** کەسـێك لەشـوێنێکدا بمێنێتــەوە ودابنیشێت.

**ماکِـد** کەسـێك لەشـوێنێکدا بمێنێتــەوە ودابنیـشێت، ئاوێـك هەمیـشەیی وشــك نـەکات، وشترێك شیری زۆربێت و وشـك نەکات.

**مــاکِر** فێڵبــاز، فریــودەر، تەڵەکەچــی، چاوبەست کەر.

**ماکِس** باج وەرگر، باج سێنەر، باجگر.

**ماکِن** بەرقەرار، دامـەزراو، بـنج داکوتـاو، سەقامگیر، پایەدار.

●**مـالَ ١/** لار بویـەوە. ٢/مـاڵ و سـامانی زۆر بـــوو. ٣/**الی الـــشيء او الـــشخص:** ئارەزوی کردیان خۆشی ویست. ٤/**الحاکمُ في حکمـه:** سـتەمی کــرد. ٥/**ت الـشمسُ:** لەناوەڕاســـتی ئاسمـــان نـــەماو نزیـــك کەوتەوە لەئاوابوون، لاروخوار بوو.

**مــال** سامان، مـاڵ، دارایی، لای عەرەبـە گونــد نــشینەکان مەبەســت لێــی ولاّخ وەمەڕو بزن و وشتر دەگرێتەوە، پارەپول.

● **مـــالأ ١/ه علـى الأمــر:** یارمەتیــدا، هاوکــاری و کۆمــەکی کــرد، هاریکــاری ویاریەیدا.

●**مالَثَ ١/ه:** یاری لەگەڵدا کرد.

**مالِج** ماڵەی وەستا، کەمچە.

●**مالَحَ ١/ه:** نانی لەگەڵدا خوارد.

**مالِح** ئاوی سوێر، ئـاوی خـوێ دار، ئـاوی تێکەڵ بەهۆی خوێ، هەرشتێکی سوێر.

●**مــالَغَ ١/ه:** یــاری وســوعبەتی لەگــەڵ کرد، گەمەو شۆخی لەتەك کرد.

**مالطَة** دورگەی ماڵتە.

**مــالِطي** دانیــشتوانی دورگــەی ماڵتــە، خەڵکی دورگەی ماڵتە.

●**مالَطَ ١/ه:** تێکەڵاوی کرد.

**مالِغ** گەمژەو گەم فامێك قسەی قۆڕو نەشیاو بكات.

●**مالَقَ** ۱/ه: مەرامی بۆ كرد، ڕوپامایی بۆ كرد كورد بەو جۆرەی دواندن دەڵێت: ماستاوی بۆ كرد.

**مالك** خاوەن موڵك، خاوەنی هەرشتێك، ناوێكە لەناوەجوانەكانی خوای گەورە، فەرمان ڕەوا.

**مالَم** مەگەر.

**مالیّ** كارشناسی دارایی، كەسێكی شارەزا لەبواری داراییدا.

**مالیّة** دارایی، نوسینگە یان وەزارەت وفەرمانگەی تایبەت بەدیسپلاندنی كاروباری دارایی.

●**مانَ** ۱/درۆی كرد، قسەی ناڕاستی كرد. ۲/**الأرضَ**: كێڵای بۆ كشت وكاڵ.

**مان** ئەو ئاسنەی زەوی پێ دەكێڵرێت، گاسن.

●**مائحَ** ۱/ ت **العينُ**: فرمێسكەكانی بەدوای یەكدا هاتنەخوارەوەو لێی نەبڕان.

**مانَعَ** بەربەستی كرد، ڕێگەی گرت لێی.

**مانِع** بەربەست، ڕێگر، كۆسپ، لەمپەر، قەدەغەكار، هەرچییەك بەربەست و قەدەغەت بكات لەشتێك.

●**مانی** ۱/**الرَّجلَ**: چاوەڕوانی كرد، موداراى كرد. ۲/**الرَّفيقَ**: لەدوای ئەو سوار بوو، بەدوایدا سوار بوو، بەنۆرە لەدوای ئەو سوار بوو.

**ماوِيّة** ئاوێنە، قودیك، عەینەك، نەینەك، نەینوك، جام.

●**ماهَ** ۱/ شمشێری بەئاوی ئاڵتون ئاودا. ۲/**الرَّجلُ**: ئاوی پێدا. ۳/**الشيءَ بالشيءِ**: تێكەڵاوی كرد. ٤/ت **البئرُ**: ئاوی زیاد بوو. ٥/ت **السفينةُ**: ئاوی تێ چوو.

**ماه** دینار، ئاو.

**ماهِج** شیری خۆلاسەی بێ تێكەڵ، شیرو بەزی تەنك.

**ماهِر** زیرەك، چاوتیژ، پێچەوانەی تەمەڵ.

●**ماهَرَ** ۱/ه: لەمەهارەت و زیرەكیدا بەسەریدا زاڵ بوو.

**ماهِل** پێشڕەو لەچاكەدا، پێش دەستی كەر لەچاكەدا.

●**ماهَنَ** ۱/ه: سەرقاڵ بوو پێیەوە، خەریك بو پێیەوە، مومارەسەی كرد.

**ماهِن** خزمەتكار، بەندە، كۆیلە.

●**ماهَة** ۱/ئاوڵە، خوریكە، خورویلكە، هاوڵە. ۲/بیرێك ئاوی زۆر تێدابێت.

**ماهِيّة** كرۆك وجەوهەری شت.

**ماهيَّة** مانگانه، كرێی مانگانه، هەق كاری بەمانگانه دراو، هەقیقەتی شت.

●**مايَر ١/ه**: لاسایی كردەوه، دەمەلاسكێی كردەوه.

**مَاثَم** گوناه، خراپەو تاوان.

**مَاخَذ** شێوه، ڕەوش، پرۆگرام وپەیڕەو.

**مَأَدَ** نەرم بوو، ناسك بوو.

**مَأْد** گیای ناسك ونەرم، پیاوی بەنازپەروەردەكراو.

**مَأذَنَة** مناره، شوێنی بانگدان، میمبەر.

**مَأذونِيَة** مۆڵەت، مۆڵەتدان لەبڕوانامەی بەرزی زانیاریەكاندا.

**مَأذون** ڕێگەدراو، مۆڵەتدراو، بڕوانامه پێ بەخشراو لەزانستەكاندا، كەسێك مۆڵەتی پێ بەخشرابێت.

**مَأرَب** ئارەزوو، خواست.

**مَأزَق** تەنگانه، شوێنی تەنگ و تەسكەلان.

●**مَأسَ ١/عليه**: توڕه بوو. **٢/بين القوم**: ئاژاوەی نایەوه.

**مَأْس** كەسێك گوێ نەگرێت بۆ ئامۆژگاری كەسانی تر.

**مَأساة** بەدبەختی، تراژیدیا.

**مَأق** قوڵپەی گریان.

**مَأق، مُؤق** گۆشەی چاو، ڕێڕەوی فرمێسك لەقتنچكی چاودا.

**مَأقَة** گریان، گریانی بڵند.

**مَأكَلْ** خۆراك، هەرچی یەك بخورێت.

**مَأكول** خوراو، هەرچی یەك بخورێت.

**مَأل** قەڵەو، گۆشتن.

**مَآل** پەناگا، حەشارگه، جێگەی خۆشاردنەوه لەهەرمەترسییەك.

**مَألوف** هەرچیەك مرۆڤ پێی ئاشنابێت وناموٚنەبێت بەلایەوه.

**مَألوق** شێت، تێكچوك لەڕوی هۆش وئاوەزەوه.

**مَألَة** باخ، مێرگوزار، باخچه.

**مَأمَل** ئومێد، ئارەزو، خۆزگه، هیوا، جێگەی ئومێد وئاوات.

**مَأمَن** پەناگا، هەرجێگەیەك بێ وەی وبێ ترس بێت.

**مَأن** ئاسنێكه زەوی پێ دەكێڵرێت.

**مَأنَة** ناوك ودەوروبەری لەسكدا.

**مَأو** سەختی، تەنگانه.

**مَأوَة** پەناگا، جێگەی خۆحەشاردان.

**مَأوَة** زەوی نزمەلان.

**مَأوى** پەنا، پەناگا.

**مِأَة** سەد، دەجاران دە، ١٠×١٠، سەت، ژمارەی دوای نەوەت ونۆ.

●**مأى** ٨/ **الجلد**: درێژی كرد. ٢/**الشجرة**: گەڵای كرد. ٣/**بينهم**: ئاژاوەو خراپەی نایەوە.

**مُباح** ڕێگەدراو، ڕەوا، دروست.

**مبادیء** بنەمای سەرەكی، بناغەو پایەی بنەڕەتی هەرشت ومەسەلەیەك.

**مُباراة** پێشبڕكێ لەتۆپ تۆپێن ویاری تردا.

**مُباشِر** ڕاستەخۆ.

**مَبانی** ئەپارتمانەكان، بیناو شوققەكان.

**مُبْتَدأ** سەرەتا، یەكەم، لەڕستەدا بەشی نیهاد دەگرێتەوە.

**مُبْتَدِع** نوێكار، بیدعەچی.

**مَبحَث** لێكۆڵینەوە، بەدوادا گەڕان، شوێنی لێكۆڵینەوە.

**مَبدأ** بنەڕەت، هۆكار.

**مَبْدَإي** پەیوەست بنەڕەت ومەبدەئەوە، بنەڕەتی، ئوصولی.

**مِبْراة** قەڵەم دادەر، پێنوس تاش.

**مِبْرَد** بڕبەند، بڕبەن، مڕمەند، مورەت، ئامرازی ئاسن ڕنین.

**مَبْرَدة** هەرچی یەك ببێتەهۆی ساردكردنەوە، فێنك كەرەوە.

**مُبَرِدة** فێنك كەرەوە، موبەریدە.

**مُبَرْسَم** كەسێك پەردەی نێوان جگەرو دڵی هەوی كردبێت.

**مُبَشِر** مزدە دەر، مزدە بەخش.

**مِبْطان** ورگن، ورگ زل.

**مُبْغَض** نەفرەت ئەنگێز.

**مبغى** پێویستی وداواكاری، جۆری پێویستی، جێگەی داواكاری وپێویستی.

**مَبْلَغ** بڕ، ئەندازە، بڕێك پارە یان هەرشتێكی تر، سنورو كۆتایی هەرشتێك.

**مُبَلِّغ** گەیەنەر، هەواڵ گەیەنەر.

**مبنى** ئەپارتمان، شوققەو بینا.

**مَبْهوت** سەرسام، حەیران.

**مُبيد** لەناوبەر، فڕكەر.

**مَبيع** كاڵای فرۆشراو.

**مُبِيْن** ئاشكرا، ڕون وبێ پەردە.

● **مَتّ** ٨/**ه**: درێژی كردەوە.

**متات** خزمایەتی ونزیكی، گوریسی دۆڵچە.

●**مَتاع** ٨/ كەل وپەلی ناوماڵ. ٢/هەرچیەك مرۆڤ لەبەری بكات یاخود ڕای بخات، هەرچی یەك مرۆڤ سودی لێ وەربگرێت لەدنیادا جگەلە زیو و ئاڵتون.

**متانَة** بەهێزیی، بەتوانایی و توندوتۆڵی.

●**مَتَأَ ١/هُ**: بەگۆچان لێیدا.

**مُتَأَخِّر** کەسێك لەگەڵ داب ونەریتی هاوچەرخدا هەڵنەکات و واز لەنەریتی باوباپیران وبۆماوە نەهێنێت، دواکەوتوو.

**مَتْجَر** جێگەی بازرگانی کردن، خانەی بازرگانی، بازرگانی کردن.

● **مَتَحَ ١/فلاناً**: لێیدا، دای بەئەرزدا.

**مُتْحَف** مۆزەخانە، شوێنی دانانی کەلوپەلی مێژوویی ودێرین بۆ نمایش کردن.

●**مَتَخَ ١/الشيءَ**: بەرزبوویەوە، بڵند بوویەوە.

●**مَتَدَ ١/بالمكان**: تیایدا مایەوە، سەقامگیر ونیشتەجێ بو تیایدا.

●**مَتَرَ ١/الحبلَ**: درێژی کردەوە. **٢/الشيءَ**: بڕیی، لەتی کرد.

**مِتْر** ئەندازەی سەت سانتی مەتر، ١٠٠سم.

●**مَتَشَ ١/الشيءَ**: بەپەنجەجیای کردەوە، بەپەنجە پرژوبلاوی کردەوە، کۆی کردەوە.

●**مَتِشَ ١/ت عينه**: بەهۆی برسێتی یان گەرمی خۆرەوە تاریکایی بەسەردا هات.

**مُتَشَرِّد** ئاوارە، وێڵ گەرد، هەڵومدا، دورلەژینگەی خۆ، تەرە.

**مُتَطَرِّف** زیادەڕەو، توندڕەو.

**مُتَطَوِّع** خۆبەخش، کەسێك لەخۆە کاری چاکەی زیادلە پێویستیخۆی بکات.

**مُتَطَهِّر** خۆپاك کەرەوەی خۆپاك ڕاگر.

●**مَتَعَ ١/الشيءَ**: درێژبویەوە. **٢/النبيذُ**: سوریەکەی زۆر بوو.

●**مَتَّعَ ١/الشيءَ**: درێژی کردەوە.

**مُتَعَبَّد** ئەو جێگەیەی خواپەرستی تێدا دەکرێت.

**مُتْعَة** دۆڵچە، سەتڵی چەرمین، مەشکە، مەشك، پێستەی حەیوانی گووراو کەماستی تێدا دەژێنن.

**مُتْعَة** توێشویەکی کەم، مارەکردنی ژن بەشێوەی کاتی بۆ چێژ لێ وەرگرتن.

**مَتْفَحة** باخی سێو، سێوستان.

**مُتَّقي** پارێزکار، لەخواترس، خۆپارێز لەهەرکارێك خواپێی ناخۆش بێت.

**مُتَكاسِل** تەوەزەل، خۆتەمەڵ کەر.

**مُتَّكَأ** هەرچیەك پاڵی لەسەر بدرێتەوەو شانی لەسەر دابدرێت.

**مُتَكَلِّم** کەسێك شارەزای زانستی کەلام بێت، جێگەی قسەکردن.

**مُتَّكِيء** شان دادەر، کەسێك پاڵی دابێتەوە یان شانی دادابێت.

**مُتَلالي** درەخشاو، بریکاو، هەرشتێك بریکە بداتەوە.

**مُتَلَوِّن** كەسێك لەسەریەك جۆرە ڕەوشت نۆقرە نەگرێت، ڕەنگاوڕەنگ.

**مَتُنَ** ڕەق وسەخت وبەهێز بوو، هێزی پەیدا کرد.

●**مَتَنَ ١/ه بالسوط،** لێیدا، زۆربە سەختی لێیدا بەقامچی.

●**مَتَّنَ ١/الشيء،** توندوتۆڵ ودامەزراوی کرد.

**مَتْن** پشت، دەق، تێکست.

●**مَتْنُ ١/الأرض،** هەرجێگەیەك بەرزوتەخت بێت. ٢/**الشيء،** ئەو بەشەی دەردەکەوێت. ٣/**الطريق،** ناوەڕاست وپانتایی ڕێگە. ٤/**الكتاب،** دەقەکەی بەدەر لەڕافەو پەراوێزە لەسەر نوسراوەکانی.

**مُتَنَعِّم** کەسێك سامان ومالّی زۆربێت، کەسێك حالّ وگوزەرانی خۆش بێت.

**مَتْنَة** زەوی بەرزو ڕەق وسەخت.

**مُتَواصِل** بەردەوام و بەدوای یەکدا هاتوو لەهەرشتێك.

**مَتُوح** دوور، بیرێك ئاوی زۆر تێدابێت یان بنکەکەی نزیك بێت بەجۆرێك بەدەست ئاوی لێ دەربهێنرێت.

**مُتُوع** گەشتن بەکۆتایی بەرزی وبلّندی.

**مُتَوَفّي** مردوو، کەسێك کۆچی دوایی کردبێت.

**مُتَوَقِّد** ڕۆشنایی بەخش، بلاّوکەرەوەی ڕۆشنایی.

**مُتَهَجِّد** کەسێك لەخەوهەستابێت بۆ نوێژکردن، شەونوێژکەر.

**مَتى** کەی؟چ کاتێ؟ چ وەختێ؟، ئامرازی پرسیارکردنە لەکاتی ڕودانی هەر ڕوداوێك.

**مَتّى** ناوی ئەوکەسەی کەئینجیلی مەتی نوسیوە.

**مَتِين** توندوتۆڵ، بەهێز، سەخت وڕەق، بەرقەرارو سەقامگیر، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە.

●**مَثَّ ١/العظم،** چی تێدا بوو ڕژا. ٢/**الرجل،** لەتاوقەلّەوی ئارەقی کرد. ٣/**الحديث،** پەخشی کرد، بلاّوی کردەوە. ٤/**شاربَهُ،** سمێڵی چەوریی تێوە چوو وبەدەستی سڕیی.

**مَثابَة** جێگەی کۆبونەوە، ژوانگە.

**مَثاث** ڕۆن وچەوریی موی سەر.

**مَثّال** پەیکەر تاش و وێنەکێش، موجەسەم ساز.

**مِثال** بڕ، ئەندازە، شێوە، نمونە، تۆڵە، نوێنی لەسەر نوستن.

**مَثالَة** حالّ باشی، باشی حالّ وگوزەران.

**مِثالی** نمونەیی، ئەو شتەی دەکرێتە نمونە لەخەسڵەتە جوانەکانیدا.

**مِثالیّة** ئایدیالیسم، فەلسەفەی پێچەوانەی ماتەریالیزم.

**مُثبَت** سەقامگیر، دامەزراو، نەخۆشێك بەهۆی قورسی نەخۆشیەکەیەوە نەتوانێت نوێنەکەی بەجێ بهێڵێت.

**مُثری** ماڵدار، دەوڵەمەند، خاوەن سامان.

**مَثغَر** کەلێن.

**مَثقال** مسقاڵ، بەئەندازەی نوکی دەرزی، گەردیلە.

**مثقالَ ذرة:** زۆر بچوك، ئەندازەی گەردیلەیەك کەهەرگیز بەچاو نابینرێت.

**مِثقَب** ئامێرێکە بۆ کون تێکردن، پیاوی زیرەکی زۆرلێزان.

**مُثقّف** رۆشنبیر، روناکبیر، رۆشنفیکر.

●**مَثَلَ** ١/ **فلانا بفلان**، لێکی چواندن، فلان کەسی بە فلان کەس لێکچواند. ٢/ نوێنەرایەتی کرد. ٣/ **الحدیث**، رونی کردەوە. ٤/**بالقتیل**، تەرمەکەیی شێواند، تەرمی کوژراوەکەی شێواند.

●**مَثَلَ** ١/ **بین یدی فلان**، لەبەر دەستیدا راوەستێنرا.

**مِثل** وەك، شێوە، هاوشان وهاوشێوە.

**مَثَل** پەند، داستان، بەڵگە، ئەوقسە پڕماناپانەی لەناوخەڵکدا باوەو بۆهەرمەسەلەیەك پەندێکی تایبەت دەبێژن، پەندی پێشینان.

**مُثلَة** سزاو بەلا.

**مَثُلَة** ئەو بەلاو ناڕەحەتیانەی دوچاری سەدەکانی رابردوو بون و هەنوکە بونەتە پەندو وانەیان لێ وەر دەگیرێت.

**مُثمِر** بەردار، سودبەخش، هەر درەخت ودارێك بەروبوم بدات.

**مَثِن** میزی لەمیزڵدانیدا ڕانەدەگرت، میزی بەخۆی ڕاگیر نەدەکرد.

**مَثِن** کەسێك میزبەخۆی ڕاگیرنەکات لەمیزڵدانیدا، میز بەخۆداکەر.

**مُثَنّی** دوتایی.

**مَثوبة** پاداشت لەسەرکردەوە ئیدی چاك بێت یان خراپ بەڵام زیاتر لە بەرانبەر پاداشتی چاکدا بەکار دەهێنرێت.

**مَثوی** مەنزڵ، ماڵ، جێگەی نیشتەجێ بوون.

**مَثیل** شێوە، هاوشان دەگوترێت: (**لیس له مثیل**، واتە هاوشێوە یان هاوشانی نیە).

**مَجّ** دنکۆڵەی ماش.

**مَجّاج** نوسەر.

**مَجّاح** خۆبەزلزان، لوت بەرز.
**مُجادَلَة** گفت وگۆی بەمشت ومڕ، ڕوبەڕوبونەوە بەگفتوگۆ.
**مجار** دەم بەس وپێوەندی وشتر.
**مَجاز** ڕێگە، پرد، واژەیەك مانای بنەڕەتی خۆی لێی داڕنرابێت ومانایەكی پێ درابێت كەتەم ومژی بۆ دروست بكات.
**مَجاعة** برسێتی، پێچەوانەی تێرێتی.
**مَجال** بوار، زەمینە.
**مَجّان** خۆڕایی، بێ بەرانبەر، هەرچی شتێك بەخۆڕایی بدرێت.
**مُجاهِد** كەسێك بۆ بەرگری لەئاینی ئیسلام بجەنگێت وئامادەبێت گیانی خۆی ببەخشێت، تێكۆشەر.
**مُجتَمَع** جێگەی كۆبونەوە، كۆمەڵگە، كۆمەڵگا.
**مُجتَهِد** كەسێك زۆر شارەزابێت لەزانستی ئیسلامیداو بتوانێت خۆی فەتوابدات، كۆششكار.
**مَجَحَ** شانازی كرد، لوت بەرزی نواند.
●**مَجُدَ** ١/خاوەنی سەربڵندی بوو. ٢/**الراعیُ الإبلَ**: ئالفی پێداو تێری كرد.
●**مَجَّدَ** ١/**فلاناً**، گەورەی كرد، كردیە خاوەن سەربڵندی. ٢/**العطاءَ**: زیادی كرد، زۆری كرد.
**مَجد** گەورەیی، سەربڵندی، هەر زەویەكی بەرزوبڵند وەك ناوچەی (نەجد).
**مَجْدَرَة** شایستە، شیاو، شایان.
**مَجَرَ** تینوی بوو، تینو بوو.
**مَجْر** سوپایەكی زەبەلاح وگەورە، زۆر لەهەرشتێك، كۆرپەی نێوسكی مەڕو وشتر، سوو، ئەقڵ، ژیری، ئاوەز.
**مَجَر** وڵاتی مەجەرستان.
**مُجَرَّب** هەرشتێك تاقی كرابێتەوە، ئازمودەكراو.
**مُجْرِم** تاوانبار، گوناهكار، تاوانكار.
**مَجروح** برینداار، زامدار، زامار، برینار.
**مَجَرَّة** كەهكەشان، گەلەستێرە.
**مَجْری** ڕێڕەوی ئاو.
**مَجزَرَة** جێگەی سەربڕینی ئاژەڵ، قەسابخانە، كوشتارگا.
**مَجْزَم** پڕ، لێوان لێو، پێچەوانەی خاڵی.
●**مَجَّسَ** ١/**ه** كردیە ئاگرپەرست، كردیە مەجوسی.
**مَجَعَ** خورمای خواردو شیری بەسەردا خواردەوە.
**مَجِعَ** شەرم و ئابڕوی كەم بویەوە.

**مَجْع** سوعبەتچی، شۆخی باز.

**مَجِعَة، مِجَعَة، مُجَعَة** ژنی بێ شەرم وئابڕوو، ژنی داوێن پیس.

**مِجْعَة** ژنی نەفام، ژنی کەم ئەقڵ.

**مَجْلِس** شوێنی دانیشتن، ئەنجومەن.

**مَجْمَع** جێگەی کۆبونەوە، ئەکادیمیای زانستی و وێژەیی وهونەری.

**مَجْموع** کۆ، کۆی کۆمەڵێك ژمارە یان شتی پەرتەوازە.

●**مَجَنَ ١/الهيةَ**؛ ڕەق وسەخت بوو، سوعبەتی کردو ئابڕوی کەم بویەوە.

**مِجَنّ** قەڵغان، سووپەر.

**مِجْنَب** قەڵغان، سوپەر.

**مَجْنون** دێوانە، بێ ئەقڵ، شێت.

**مَجُوس** نەتەوەیەکن ئاگریان هەمتاو(خۆر) دەپەرستن، زەردەشت پێغەمبەر.

**مَجوسی** زەردەشتی، وشەیەکە بەعەرەبی کراوی وشەی "میخ گوش"ی فارسیە کەبەمانای "دووگوێ بچوك)دێت، هەروەها لەبەرانبەر زاناو داناو فەیلەسوفیشدا بەکاردێت.

**مُجَوَّف** پیاوی ترسنۆك، پیاوێك هێندە نەوێرو ترسنۆك بێت وەك ئەوەی دڵ لەناوسکیدا نەبێت وناوسکی خاڵی بێت.

**مِجهار** کەسێك نەریتی وابێت بەدەنگی بەرز بدوێت، بڵندگۆ.

**مِجْهَر** وردبین، میکرۆسۆپ.

**مَجْهُول** نادیار، نەناس، فرمانێك بکەرەکەی نادیار بێت.

**مَجید** بڵندپایە، سەربەرزو خاوەن گەورەیی، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە.

**مَجیدی** پارچە زیوێکی پاڵفتە بوو لەسەردەمی عوسمانیەکاندا نرخی(٢٠قرش) بوو بەناوی عبدالمجیدی یەکێك لەسوڵتانەکانی عوسمانیەوە ناونرابوو.

**مَجیء** هاتن.

**مَحَّ** کۆن بوو، کۆن بوو و بەکەڵك نەما.

**مُحّ** پاڵفتە لەهەرشتێك، سەرگوڵ وسەرتۆپی هەرشتێك.

**مَحّ** جلکی کۆنە، پۆشاکی کۆن.

**مَحَا** پاکی کردەوە و ئاسەواری نەهێشت.

**مَحّاج** درۆزن.

**مَحّاح** زۆر درۆزن، کەسێك بەقسەکانی قایلت بکات نەك بەکردەوەکانی.

**مُحادَثة** گفتوگۆ، هەمپەیفین، دیالۆك، ئاخاوتن.

**مُحَاسَبَة** لێپرسینەوە، ژمێریاری، حسابداری.
**مَحاسِن** کردەوە جوانەکان، ڕەوشت و کردارەچاکەکان.
**مَحاش** کەلوپەلی ناومالّ، شمەك.
**مُحاش** سوتاو.
**مِحاش** کۆمەڵێکن لەهۆزی جیاجیا کۆدەبنەوەو لای ئاگرێکدا پەیمان دەبەستن.
**مَحّاص** درەخشاو، بریکەدار.
**مُحاضَرَة** کۆ وتار.
**مِحَال** فرِوفێلّ، تەڵەکە، سزاو ئەشکەنجە، توانااداری وبەهێزی، لەناوبردن و لەناوچوون، دوژمنایەتی.
**مَحّال** شەیتان، فێڵباز، فرِوفێلّ کار.
**مُحال** ئەستەم، زۆر نارەحەت، مەحالّ.
**مَحَالَة** فێلّ، تەڵەکە.
**مُحاماة** دەستەی بەرگری کار لەبەرانبەر دەستەی داواکاردا، پیشەی پارێزەری.
**مُحامی** پارێزەر.
**مُحاوَلَة** هەولّ، کۆشش.
**مُحِبّ** خۆشەویست.
**مِحْبَرة** قوتوی لەشوشە دروست کراوی مرەکەب، مرەکەفدان.
**مَحَبّة** خۆشەویستی.

●**مَحُتَ ٨/اليوم:** سەخت وگەرم بوو.
●**مَحَتَ ٨/فلاناً:** پڕی کرد لەقین، بەتەواوی تورەی کرد.
**مَحْت** ڕۆژی گەرم وسەخت، سەخت و توند لەهەر شتێك، پیاوی ژیرو ئاقلّ، پالّفتە لەهەر شتێك.
**مُحتَرِف** پیشەوەر، دەست ڕەنگین، پرۆفیشنالّ.
**مُحْتَضَر** کەسێك لەساتەوەختی گیان دەرچوندا، کەسێك لەسەرەمەرگدا.
**مُحْتَمَل** چاوەڕوان کراو، هەرچیەك ئەگەری ڕودانی هەبێت.
**مَحّ** درۆی کرد، ڕاستی نەگوت.
●**مَحَحَ ٨/** پەلەی کرد، خێرای کرد. **٢/ت و الريح الأرضَ:** خۆڵی لەسەر لابرد. **٣/اللبن:** ژەندی، ماستی ژەند.
**مَحَجّة** ڕێی ڕاست، ڕاستە شەقام.
**مُحّ، مُحّة** زەردێنەی هێلکە.
**مُحْدَث** تازە، نوێ، نۆ.
**مُحَدَّد** دیاری کراو.
**مَحْدود** سنوردار، خاوەنی ئەندازەو سنور.
**مِحْراب** جێگەی پێش نوێژی کردنی مامۆستا لەمزگەوتدا، میحراب، لانەی شێر، ئازارو چاو نەترس، قیبلە.

**مِحراث** گاسن، ئامرازی کێلآنی زەوی.
**مُحَرِّك** ماتۆڕ، بزوێنەر.
**مَحروق** سوتاو، سوتیاگ.
**مَحروم** بێ بەخت، بێ بەش، بێ بەشکراو.
**مَحْسُوس** هەست پێکراو، زەویەك توشی لێشاوی کوللە بوبێت.
**مَحْشَر** جێگەی کۆکردنەوەی خەلکی بۆ لێپرسینەوە لەدوای زیندوبونەوە لەقیامەتدا.
● **مَحَصَ ١/الشيءَ:** لەهەموو ناتەواوی ولەکەیەك پاکی کردەوە.
● **مَحَّصَ ١/الشيءَ:** لێی کەم کردەوە. **٢/ه عنه:** دوری خستەوە وپاکی کردەوە. **٣/الرجلَ:** تاقی کردەوە.
**مَحِص** زێی نەرم وناسکی کەمان.
**مِحْصَد** ئامرازی دروێنەکردن، داس، دارێ.
**مَحصول** وەدەست هێنراو، بەرهەمی دەغڵ.
**مَحْضَ** نەژادی پاك وبێ لەکەبوو.
**مَحَضَ** شیری پالفتەی خواردەوە.
● **مَحَضَ ١/الرجلَ:** شیری پالفتەی پێدا تابیخواتەوە.

**مَحض** شیری پالفتەی بێ ئاو، هەرشتێکی پالفتەوبێ خەوش.
**مَحض** شیری پالفتەی بێ تێکەڵەو ئاو.
**مَحضَر** جێگەی ئامادە بون، ئامادەگی، ئیفادەی دەستنوسی گەواهی دانی پیاوی پۆلیس یان ئاسایش بۆ دادگا، کۆنوسی هەر دانیشتن وئیفادەو بڕیارێ.
● **مَحَطَ ١/الوتَرَ:** پەنجەی بەسەردا گێڕا بۆ وەی چاکی بکات.
**مَحط** ئاوی لوت، چڵم، ئاوی خەستی کەپۆ.
**مَحَطَّة** وێستگە، وێستگەی شەمەندەفەر، ئێستگە، ئێستگەی ڕادیۆیی یان تەلەفیزیۆنی.
**مَحْفَظَة** کیف، تورەکەی چەرمین بۆ شت تێخستن، جزدان، جانتا.
**مَحفَل** ئەنجومەن، جێگەی کۆبونەوە، کۆمەڵگە.
● **مَحَقَ ١/الشيءَ:** پوچەڵی کردەوە، بەتاڵی کردەوە. **٢/فلاناً:** لەناوی برد. **٣/الحرُّ الشيءَ:** سوتاندی.
● **مُحِقَ ١/الرجلُ:** لەمەرگ نزیك بویەوە.
**مَحق** تۆقێ دارخورمای لەنزیك یەکەوە نێژراو.
● **مَحَّقَ ١/الشيءَ:** پوچەڵی کردەوە.

**مَحَقَة** تیاچوون، لەناوچوون.
**محَك** پێومر.
**مُحْكَم** سەقامگیر، توندوتۆڵ.
**مَحْكَمَة** دادگا، جێگەی یەکلایی کرنەوەی ناکۆکیـەکان و لێپرسـینەوەی تـاوان وحوکمدان بەسەر تاوانبارانداا.
● **مَحَلَ ١/الشيءَ:** درێژی کردەوە.
● **مَحِلَ ١/المكانُ:** بێ بەرو بوم بوو.
**مَحْـل** برسـێتیەکی زۆر، سـەختی و تەنگانـە، بـێ بـەروبومی و وشکەسـاڵی و بێ بارانی، تەپوتۆز، فروفێڵ، تەڵەکە.
**مَحْلَة** زەویەك بەروبومی نەبێت.
**مَحَلَ** جێگە، شوێن، شوێنکار.
**مَحْمِـل** کـەژاوە، سـندوقی زل کەلەسـەر پـشتی بارەبـەر دادەنـراو بنیـادەمی تیاسوار دەبوو.
**محمول** هەڵ گیراو، سوارکراو.
**مَحمـوم** تـادار، کەسـێك توشـی تـا(بەرزبونـەوەی پلـەی گـەرمی لەش)هاتبێت.
● **مَحَنَ ١/فلاناً:** تاقی کردەوە، ئازمودەی کـرد. **٢/الفِضَةَ:** بـەئاگر پاڵفتـەی کـرد. **٣/الناقةَ:** بەڕۆشـتن هیلاکی کـرد، بـەڕێ بڕین شەکەتی کرد.
●**مَحُـنَ ١/الأديمَ:** نـەرمی کـرد و درێـژی کردەوە.
**مَحِـن** نـەرم لەهەرشـتێك، نـەرم ونـۆڵ، دیاریی، بەخشین.
**مُحَنَّك** ئـازمودەکراو، کەسـێك ئـەزمون و تاقی کردنەوە کردبێتیـە پسپۆڕو داناڵـە کاروباردا.
**مِحنَـة** تـاقی کردنـەوەو بـەلا، سـەختی و تەنگانە.
**مَحْو** پاك کردنەوە، ڕاماڵین، لەناو بـردن و نەهێشتن.
**مِحْوَر** تـەوەر، تیرۆکـی ئانـەوا کەهـەویری پێ پان دەکاتەوە.
**مَحْـوَة** عـەیب، عـار، بـاران، بـای بـاکور کەهەورەکان ڕادەماڵێت.
**مَحْيا** جێگەی تێدا ژیان.
**مُحيط** ئۆقیانوس.
**مُخّ** ناواخنی ئێسقان، مۆخ، مێشکی سـەر، بــەزی چـــاو، پاڵفتــەو بـــێ خـــوش لەهەرشتێك.
**مُخَّة** پارچەیەك لەمۆخ.
**مُخاط** چلم، ئاوی خەستی لوت.
**مَخـاطِر** مەترسـیەکان "بـەم سـیغەیە وشەکە دەستەواژەی جەمعەو تاکی نیە".

**مُخاطِئ** هەرچیەك لەسیفەتدا لەچڵم بچێت، لیق، لینج.
**مُخالِف** سەرکێش، سەرکەش، پێچەوانەکار، هەرکەسێك پێچەوانەی یاسا بجوڵێتەوە.
**مُخالَفَة** پێچەوانەی یاسا جوڵانەوە.
**مَخْبَأ** حەشارگە، پەناگە.
**مُخْتار** هەڵبژاردە، هەڵبژێردراو.
**مُختال** خۆپەسەند، خودپەسەند.
**مُختَبَر** تاقیگە، جێگە تاقیکاریە زانستیەکان، ئازمایشگا.
**مُختَفي** پەنهانی، پەنامەکی.
**مُختَلّ** ناتەواو، ناکامڵ، تێکچوگ.
**مُختَلَق** ڕەوشت پەسەند.
● **مَخَّخَ ١/العظمَ**: مۆخەکەیی لێ دەرهێنا.
**مُخَدِّر** هەرگیایەکی بێ هۆش کەر.
**مَخَدَّرات** مادە بێهۆشکارەکان وەك: تریاك، هیرۆین.
● **مَخَرَ ١/الذئبُ الشاةَ**: ورگی مەڕەکەی هەڵدڕی. **٢/السابحُ**: لەکاتی مەلەکردندا بەدەستی ئاوی لەت کرد.
**مَخرَت** ڕێگەی ڕون وئاشکرا.
**مَخْرَة** بۆنی پیس کەلەدەم دەردەچێت.
**مُخْرَة** ئەوشتەی هەڵی دەبژێریت، هەڵبژاردە.
**مَخْرَج** ڕێگەی چونەدەرەوە و دەربازبون، دەلاقەی دەربازبون.
**مُخرِج** دەرهێنەری فیلم وبەرنامەو شانۆو. . . هتد، ڕێژسیور.
**مَخْزَن** ئەنبار، گەنجینە، عەمار.
**مَخَض** ماستی ژەند، مەشکەی ژەند.
**مَخَض** ماست ژەندن، مەشکەژەنین تاکو ماستەکە دەبێتە دۆو کەرێی لێ دەکەوێت.
● **مَخَطَ ١/** چڵمی داکرد. **٢/ ة بيدهِ**: لێیدا، پیایدا کێشا. **٣/الرجلُ في الأرضِ**: بەپەلە ڕۆشت.
**مَخْط** پۆشاك و قوماشی کورت.
**مَخْفَر** بنکەی پۆلیس، مەخفەر، جێگەیەکە پۆلیس یان سەربازی تێ دەکرێت بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ یان سەرسنورەکان.
**مِخْلَب** چنگاڵی شێرو پەلەوەر، چڕنوك.
**مَخلوع** داماڵراو، لەسەرکار لابراو.
● **مَخَنَ ١/** گریا. **٢/البئرَ**: ناوی لێ دەرهێنا.
**مَخَنّ** پیاوی بالابەرز.

**مُخَنَّث** ناپیاو، ژنانی، ژن سیفەت، پیاوێ سیفەتی لەژن بچێت.

**مِخْنَقَـة** خشلی ڕازاندنەوەی گەردن، ملوانکە.

**مِخَنَّة** ژنی بالاّ بەرز.

**مَخُوف** ترسناك، ترس بەخش.

**مَخِيض** ماستی ژەندراو، دۆ.

**مُخَيَّمٌ** ئۆردوگا، جێگەیەك چادرو خێوەتی تێدا هەڵبدرێت، خێوەتگا، چادرگە.

● **مَـدَّ ١/الشيءَ:** ڕای کێشا، ڕای خست، درێژی کرد. **٢/الحرفَ:** درێژی کردەوە. **٣/الرجلَ:** هاوکاری وکۆمەکی کرد. **٤/الجُنْدَ:** پشتگیری وکۆمەکیکردن بەکۆمەڵێك سەرباز لەغەیری خۆیان.

**مَـدّ** درێژکردنەوە، ڕاکێشان، هەڵکشانی دەریا، نیشانەیەکی تایبەتە لەسەر پیتی ئەلیف دادەنرێت و بەهۆیەوە ئەو پیتە لە خوێندنەوەدا درێژ دەکرێتەوە، نیشانەی (~).

**مَدائِن** شارۆچکەیەکە لە نزیك بەغدا، شارێك بوو لەنزیك بەغدا ئەیوانی کیسرا لەوێندەر بوو، پایتەختی ئەنوشیروان بوو.

**مِداد** مەرەکەبی پێنوس.

**مَدَّاد** پێنوسی مەرەکەب.

**مُدافِع** بەرگری کار، بەگری کەر.

**مُـداواة** دەرمان، دەرمانکردن، چارسەرکردن.

**مُـداهِن** چەورە، ڕوپامایی کەر، ماستاوچی.

**مُداهَنَـة** چەورەیی کردن، ڕوپامایی کردن.

● **مَدَحَ ١/هُ:** مەدحی کرد، ستایشی کرد، بەچاکە باسی کردو ناوی برد.

**مَدح** بەچاکە باسکردن، ستایش.

**مَـدَخ** پارمەتیدا پارمەتیەکی تەواو و ڕێك وپێك.

**مَدخ** گەورەیی، مەزنی.

**مَدخَل** جێگەی چونە ژورەوە.

**مَدْخَنَـة** دوکەوڵکێش، لولەی دوکەڵ کردنە دەرەوە.

**مَـدَد** کۆمەك، پارمەتی، هاوکاری، هاریکاری وپشتگیری.

**مَدَرَ** ورگی زل بوو.

**مَـدَر** قوڕی خەستی بێ تێکەڵ، شاروشارۆچکەو گوند.

**مَدراء** ژنی ورگ زل.

**مُـدَرَّب** ئازمودە، تاقی کراوە، ئازمودەکراو.

**مُدَرِّب** ڕاهێنەر، فێرکاری هونەرە وەرزشیەکان.

**مُدَرِّس** فێرکار، مامۆستای قۆناغی ناوەندی و دواناوەندی، فێرمەند، سەید.

**مِدْرَس** ئەو پەرتوکەی وانەی تێدا دەخوێندرێت، جێگەی وانە خوێندن.

**مَدرَسَة** قوتابخانە، فێرگە، جێگەی فێربون، شوێنی ڕاهاتن، دەرسخانە.

**مُدَرَّعَة** زرێ پۆش، تانك، کەشتی جەنگی کە بەپۆلا ڕوپۆشکراوە.

**مَدْرَعَة** پۆشاکێکی لەکەتان دروست کراوە گەورە حاخامەکانی جولەکە لەبەری دەکەن.

**مُدرِك** دەرك کەر، پەی بەر، کەسێك زۆر پەی بەشت بەرێت.

**مَدَرَة** تۆپەڵێك قوڕی بێ خەوش، خانەو لانەی پیاو.

**مِدْرَى** شانە، ددانە دارێ کەسەرو ڕیشی پێ دادەهێنن.

● **مَدِشَ ١/من الطعام** کەمی خوارد، کەمێکی خوار.

● **مَدِشَ ١/ت عينه** لەبرساندا یان لەگەرماندا چاوی تاریك بوو، بەرچاوی ڕەش بوو.

**مَدَش** سستی بینین، بەرچاو ڕەش بون بەهۆی برسێتی یان گەرماوە، کەم فامی، قلیشانی قاچ، لەری مەمکەی ژن.

**مَدَش** کەم لەوەی دەبەخشرێت، دیاریی کەم.

**مَدَشَ** بەخشی.

**مُدَّعي** شکایەت کەر.

**مِدْفَا** زۆپا، سۆپا.

**مِدْفَع** تۆپ، ئامێری تۆپ تەقاندنی سەربازان لەجەنگدا.

**مِدْفَعِيَّة** تۆپخانە، جێگەی ئەسپەردەکردن، گۆڕ.

**مدمَع** جێگەو ڕێڕەوی فرمێسك.

● **مَدَنَ ١/المدائن** دروستی کردن، ئاوەدانی کردن.

**مَدَنيّ** شارستانی، شارنشین، پێچەوانەی لادێیی.

**مُدَوَّر** خڕ، بازنەیی.

**مُدهِش** سەرسامکەر، هەرشتێك مرۆڤ سەرسام بکات.

**مَدْهُن، مُدْهُن** ڕۆندار، چەوری دار.

**مُدَّة** ماوەیەك لەکات ئیتر درێژبێت یان کورت.

**مِدَّة** کێم و زوخ کەلەبرینندا کۆدەبێتەوە، زرینچکاو.

**مَدَّة** یەکجار قەڵەم نقوم کردن لەناو مرەکەبداندا بۆ نوسین.

**مَدْیَة** شەفرەی گەورە، کارد.

**مَدْیح** ستایش.

**مَدْیحَة** قەسیدەی ستایش ئامێز.

**مَدیخ** گەورە، مەزن وبەرێز.

**مَدید** تەمەنی درێر، تولانی.

**مَدِید** درێژ.

**مُدَیْدَة** ماوەیەکی کورت.

**مُدیر** بەڕێوەبەر.

**مَدِیْن** شێری بێشە وجەنگەڵ، بەندە، کۆیلە، قەرزدار.

●**مَدینَة** ١/ شار، پێچەوانەی لادێ، شاری یەسریب. ٢/**السلام:** نازناوی شاری بەغدایە، شاری ئاشتی.

**مَذّاع** کەسێك نهێنی نەپۆشێت، بێ وەفا، بێ ئەمەل، درۆزن، ناسەقامگیر.

**مَذّاق** کەسێك دۆستایەتیەکەی بێ خەوش نەبێت، ڕیاکار، دۆستی بەتەماع.

**مَذاق** چێژ، تام، مەزە.

**مَذْبَح** جێگەی سەربڕین، کوشتارگا، جێگەی سەربڕینی قوربانی.

**مُذَبْذِب** دودڵ، پیاوی ڕاڕا، نابەرقەرار لەڕادا.

**مَذِر** کەندەڵ، بۆگەن.

**مَذِرَة** ژنی قێزەون، ژنی چڵکن وپیس وپلۆخ، هێلکەی بۆگەن کردو.

●**مَذَّرَ** ١/**الشيءَ:** پرژوبڵاوی کردەوە، پەرتەوازەی کرد.

●**مَذَعَ** ١/**الفلانٍ:** هەندێك هەواڵی پێداو هەندێکی تری لێ شاردەوە. ٢/**ت المیاه:** لەبەرزایی شاخەکاندا ڕژاو داچۆڕا.

● **مَذَقَ** ١/**اللبنَ:** شیری تێکەڵاوی ئاوکرد. ٢/**فلاناً:** شیری تێکەڵ بەئاوی پێدا تابیخواتەوە. ٣/**الودّ:** نادڵسۆزی تێکەڵ بە دڵسۆزی کرد.

**مَذق، مَذیق** ئاوەکی، شیری تێکەڵ بەئاو.

**مُذَکَّر** نێر، نێرینە، پیاو.

**مُذَکَّرَة** یاداشت، یاداشتنامە، تیانوسی یاداشتەکان.

●**مَذَلَ** ١/**بسرّه:** توشی ڕاڕایی هات ونهێنیەکەی ئاشکرا کرد.

**مَذِل** ئاشکراکەری نهێنی، دەم شڕ.

**مُذْلَة** ناوکی خورما.

**مَذْموم** لۆمەکراو، سەرکۆنە کراو.

**مَذَمَّة** هەق وحورمەت.

**مُذنِب** گوناهکار، هەڵەکەر، تاوانبار.

**مُذَنَّب** ئەستێرەی کلکدار، تەنی ئاسمانی کەبەر بەرگی هەوایی زەوی دەکەوێت

تیـــــشکێکی درێـــــژی لێ دەبێتــــەوەو بەخێرایی تێ دەپەڕێت.

**مَذهَب** ئایین، ڕێباز.

**مَـذی** شـلەیەکی لینجـی ڕەنـگ ئاویـە لەئەنـدامی نێرینـەی پیـاو دێتـە دەرێ لەکاتی یاری کردن یان دەستبازی لەگەڵ ئافرەتدا، ئاوێکە بەرلە مەنی لەئەنـدامی نێرینـەی پیـاو دێتـەدەرێ و لەشـەرعدا لەش پیس ناکات، مەزی.

**مَذّی** مەزی هاوردەوە.

**مـذیاع** ڕادیـۆ، ئـامێری بڵاوکردنـەوەی هــــەواڵ وگــــۆرانی و ڕۆشـــــنبیری هەمەچەشن.

**مَـذیل** دەم شـڕ، بڵاوکـەرەوەی نهێنــی، کەسێك نهێنی نەپارێزێت.

●**مَرَّ** ۱/ڕۆشت، گـوزەری کـرد، تـێ پـەڕی، تاڵ بوو. ۲/**الـبعیرَ** گوریسەکەی لێ تونـد کرد.

**مَرّ** حەبل، گوریس، بێڵ.

**مُـرّ** تـاڵ، تـەحل، تـامی هـەرە نـاخۆش، پێچەوانەی شیرین.

**مَرئیَـات** هەرشـتێك لـەگروپی بینـراوو هەست پێکراوەکان بێت بەچاو.

**مَرْآة** دیمەن، شێوە، شیاو، شایستە.

**مِرْآة** ئاوێنـە، قودیـك، عەینـەك، نـەینك، نەینوك، جام.

**مُراجِــع** ژنێــك مێردەکــەی بمرێــت وبگەڕێتـــەوە مـــاڵی بـــاوانی خـــۆی، بێوەژنێـك لـەماڵی باوانیـدا بـژی نـەك لەماڵی خەزورانی.

**مُراجَعَــة** دووبـارە سـەردان کردنــەوە، سەرلێدانەوە.

**مِراح** شادومانی، خۆشحاڵی.

**مُراد** ئامانج، مەبەست، مراد.

**مَراد، مَرّاد** مل، گەردن.

**مُراسِل** هەواڵنێر، هەواڵدەر، پـەیامنێری ئاژانسە هەواڵدەریەکان.

**مِـراس، مَرَاسَـة** هێـزو تونـدی، قـووەت وتوانا.

**مَـرّاش** زۆرکەسـابەت کـەر، کەسـێك زۆر کاسب بێت.

**مَراغَــة** جێگەیــەك چـوارپێ و ئــاژەڵ خۆیی تیابگەوزێنێت.

**مَرّاغَة** گەزوین، گەوزاندن.

**مُرافَعَــة** دادخــواهی، بەرزکردنـــەوەی داواکاری لەدادگا.

**مُراقِب** چاودێر.

**مَراقّ** نەرمایی وتەنکایی سك.

**مَرام** خواست، مراد.

**مُرامِـر** نـەرم وناسـك، پـوچ وباتـڵ، پێچەوانەی هەق وڕاستی.

**مِـران** دووبـارە كردنـەوەی نـیش، كـار ئاموزی.

**مُـرّان** درەختێكـە ڕمـی لێ دروسـت دەكرێت.

**مَرَايـا** وشـتری پڕشـیر، ڕەگێـك پڕبێـت لەشیر(وشەكەجەمعە).

● **مَـرأَ ۱/الطعـام فلانـاً**: خـۆش بـوو بەلایەوەو سودی پێ گەیاند.

**مَرْأَة** ژن، ئافرەت.

**مُرَبَّع** چوارگۆشە، هەرشتێكی چوار پاڵو.

●**مَرَتَ ۱/الشيءَ**: نەرمی كرد.

**مَرْت** دەشتی بێ ڕوەك وگیا، پیاگێ موو بەبرۆكانیەوە نەبێ.

**مُرتـاح** ئاسودە، بێ خەم وخەفەت.

**مَرتَـان** دووجار، دووكەڕەت.

**مَرتَبَة** پلە، جێگەو پایە.

**مُرتَزِقـة** كۆمـەڵێك خـەڵك كـەڕۆزی خۆیانیان وەرگرتبێت، كۆمەڵێكی یاخی.

**مَرْتَج** ڕێگەیـەكی زۆر تەسـك بـەجۆرێك لەتەسكیدا وابێتە بەرچاو كەداخراوە.

**مُرتَج** جێگەیەك ڕوەكی زۆر بێت.

**مُرتَفَع** بەرز، بڵند.

**مُرتَفِق** پڕ، پێچەوانەی خاڵی.

●**مَـرَثَ ۱/الشيءَ**: نـەرمی كـرد، نـەرمی كردەوە.

**مَـــرِث** بـــەئارام بـــوو لەبەرانبـــەر دوژمنەكانیدا.

**مَرِث** كەسێكی بەئارام لەدوژمنایەتیدا.

**مَرْج** زەوی فراوانی پڕلەگیاو ڕوەك.

●**مَـــرَجَ ۱/الدابـــة**: لـەزەوی فراوانـــی پڕلەگیاو ڕەوەكدا ئاژەڵەكانی لەوەڕانـد.

**۲/الشيءَ بالشيءِ**: تێكەڵ وپێكەڵی كردن.

**مَرجَان** مرواری بچكۆلە، جۆرێ مـوروی سورە بۆ خشڵ.

**مَرْجِع** خوارەوەی دەفەی شان.

**مِرْجَـــل** شـــانە، شـــانەی قـــژداهێنان، ددانـەداری سـەرو ڕیـشی پـێ دادەهێـنن، قازانگ، قابلەمە، قابلمە.

●**مَرِحَ ۱/الرجلُ**: زۆر شادومان بـوو تـاكو ڕادەی خـــۆڵێ گـــۆڕان و خۆبـــادان.

**۲/السحابُ**: بارانی داكرد.

**۲/الزرعُ**: گوڵی كرد.

●**مَـــرَّحَ ۱/الرجـلُ**: چـوو بـۆ جـەنگ.

**۲/الجلدَ**: ڕۆنی تێوەدا، چەوری كرد.

**مَرَح** چالاكی وخۆشی.

**مَـرِح** شـادان، شـادومان، كەسـێك لەبـەر شـادومانی خـۆی لێ بگۆڕێـت و فیزبكـات، مایەی شادومانی.

**مرحاض** پارچە تەختەیەکە لەکاتی جل شۆردانداا پێی دەدرێت لەجلەکە بۆوەی پاکبێتەوە، ئاودەست.

●**مَرحَبَ ١/ فلانا وبه:** مەرحەبایی کرد، پێی گوت: مەرحەبا.

**مَرحباً** مەرحەبا، وشەیەکە لەتوشی یەکتربونا دەیڵێن واتا: جێ گوشادە، بەهاتنت سەغڵەت نیم، بەخێربێت، بەخێرهاتی.

**مَرْحَمَة** بەزەیی، سۆز، دڵسۆزیی.

**مرحی** ئافەرین، وشەیەکە لەکاتی سەرسوڕماندا بەو تیرهاوێژە دەگوترێت کەنیشانە دەپێکێت.

●**مَرِخَ ١/** شۆخی کرد، گاڵتەو سوعبەتی کرد. **٢/جسدَهُ بالدهن:** چەوری کرد.

**مَرِخ** گەمژە، نادان وگێل وکەم فام، هەر درەختێکی نەرم وناسك.

**مَرْخ** دارێکە زوو گردەگرێت بۆ سوتاندن وەکاردەبرێت.

**مُرْخ** کلك، کلکی ئاژەڵە چوارپێکان.

●**مَرَّخ ١/ه:** چەوری کرد، ڕۆنی لێدا.

●**مَرِدَ ١/الشيء:** بڕیی، لەتی کرد. **٢/مرودا:** سەرکەش ویاخی بوو، لەسنوری هاوشانەکانی خۆی دەرچوو.

●**مَرِدَ ١/الغلام:** ماوەیەك بەکۆسەیی مایەوەو پاشان ڕیشی دەرکرد.

**مَرُدَ** سەرکەش ویاخی بوو، لەسنوری هاوشانەکانی خۆی دەرچوو.

**مَرَّدَ** لقەدرەختەکەی لەگەڵا ڕوتاندەوە، گەڵای لەپەلی درەختەکە ڕوتاندەوە، گەڵای بەلقی درەختەکەوە نەهێشت.

**مِرداس** بەردێکی چکۆلانەیە فڕێ دەدرێتە ناوبیرەوە بۆ وەی بزانرێت ئاو لەبیرەکەدا هەیە یان نا جا ئەگەر بیرەکە قوڵتەی لێوەهات ئەوە نیشانەی بوونی ئاوە لەبیرەکەدا وبەپێچەوانەشەوە.

**مَرداء** درەختی بێ گەڵا، زەوی بێ ڕەوك و گژوگیا، کچێ ڕوخساری جوان و تابان بێت.

**مُرَدِّد** دودڵ، ڕا ڕا وناسەقامگیر.

●**مَرَزَ ١/الرجلَ:** لەکەداری کرد، بەدەست لێیدا. **٢/ه** بڕیی، لەتی کرد. **٣/الشيءَ:** بڕیی، لەتی کرد.

**مَرزوق** بەبەخت، بەخت دار، ڕۆزی دراو، کەسێك شانسی باش بێت.

**مَرْزَة، مِرزَة** پارچە، بەش لەهەرشتێك.

●**مَرَسَ ١/الدواءَ:** لەئاودا تواندیەوە، بەدەست خەریکی بوو تاکو لەئاودا تواندیەوە.

**مَرس** ڕۆشتنی بەردەوام، یەکبینە ڕێ کردن.

**مَرِس** کارزان لەشەڕدا، کەسێکی بەئەزمون لەجەنگدا.

**مَرسا** جێگەی وەستان و لەنگەرگرتنی کەشتی، لەنگەرگەی پاپۆڕ.

**مِرساة** لەنگەر گری کەشتی، لەنگەرگری پاپۆڕ.

**مُرْسَل** نێردراو، نوماینده، باڵوێز.

**مُرسِل** نێرەر، ڕەوانەکەر.

**مَرسوم** فەرمانی والی، دەست خەت، نوسراو.

**مَرَسَة** گوریس، حەبل.

●**مَرَش ١/وجهَهُ** ڕوشاندی. **٢/هُ** بەقسە ئازاری دا، بەقسە عەزیەتی پێ گەیاند، ڕەنجاندی. **٣/الملَهُ** ڕژا.

**مَرْش** زەویەك باران ڕوپۆشەکەی ڕوشاندبێت، دامێنی کێو کەناوی لێوە دەڕوات.

**مرشاء** هەرئاژەڵێکی گەزندە، هەرگیانلەبەرێك بگەزێت، زەوی پڕلەگزوگیای هەمە جۆر.

**مُرَشَّح** کاندیدکراو، پاڵێوراو، بەوکەسە دەگوترێت کەخۆی بۆ هەڵبژاردن دەپاڵێویت، پلەیەکی سەربازیە هاوشانی پلەی(ئەسبیران)ە.

**مِرْشَح** پۆشاکێك دەخرێتە سەرپشتی چوارپێ بۆ وەی ئارەقی پشتی هەڵمژێت.

**مُرشِد** ڕێنمونی کەر، ڕێنما، رابەر.

**مِرَشَّة** ئامێرێکی سادەیە بۆ پژاندنی ئاو، مەسینەی تایبەت بەئاو پرژێن.

**مرصاد** کەمین گا، جێگەیەك کەمینی تیابگیرێت، ڕێگە، ڕێ.

**مَرصَد** جێگەیەك بۆتەی تێدا بگیرێت، کەمین گا، جێگەیەك لێیەوە چاودێری جێگەیەکی تربکرێت، قوللەی چاودێری کردن.

**مُرصِدة** زەویەك کەمێك گزوگیای تێدابێت.

**مَرِضَ** نەخۆش کەفت، لەپاش لەش ساغی تەندروستی تێك چوو.

**مَرِض** نەخۆش، بیمار، ناتەندروست، ناساغ، ناساغڵەم.

**مَرْض، مَرَض** نەخۆشین، بیماری.

●**مَرَّضَ ١/هُ** نەخۆشی خست، چارەسەری کردو لەنەخۆشینەکەیدا گرنگی پێدا. **٢/فی الأمر** تەمبەڵی تێداکرد.

**مُرضِعة** ژنێ شیربدات، ئافرەتی شیردەر.

●**مَرَطَ** ١/**الشعر**: هەڵی کەند. ٢/**الرجل**: خێری کرد. ٣/**فلاناً**: پەنایدا.

**مُرْط** تیرێك پەڕی پێوەنەبێت.

●**مَرَّطَ** ١/**الشيء**: کۆی کردەوە.

**مُرط** دز، گورگێ توکی هەڵوەری بێت "وشەکەجەمعە".

**مَرِطَ** ڕیش وبرۆی تەنك بوو.

**مُرَطِّبَة** هەر خواردنەوەیەك گەروو پاراو بکات، ساردی.

**مَرَعَ** قژی داهێنا، پرچی بەشانە کرد.

●**مَرِعَ** ١/کەوتەناو نازو نیعمەتەوە. ٢/**المكان**: بەفەڕو پیت بوو.

**مُرَعَة** پیو، بەمز، باڵندەیەکە بەقەبارەی چۆلەکەیەك دەڵێن گوایە تەنها لەباراندا دەردەکەوێت.

**مَرْع** گژوگیا.

**مَرعى** گژوگیاو ئاڵف، لەوەڕگا.

**مَرعى، مَرع** لەوەڕگا، جێگەی لەوەڕاندنی ئاژەڵان.

**مَرَغَ** ئاژەڵەکە گژوگیای خوارد، لەوەڕا.

**مَرْغ** لیکی دەم، ئاوی دەم، لیق.

**مُرْغ** باخ، مێرگوزار.

●**مَرَّغَ** ١/**ه**: لەناخۆڵدا هەڵی گێڕایەوە، لەناوخاکدا گەوزاندی.

**مِرغاة** کەفگر، کەفگری سەری شیر، ئەو ئامێرە سادەیەی کەفی سەری شیری پێ دەگرن.

**مِرفاع** ئامێرێکە لەچەکە ئاگریەکاندا بەکار دەهێنرێت بۆوەی باش بپێکێت.

**مَرفَا** بەندەر، لەنگەرگای کەشتی، جێگەی لەنگەرگرتنی کەشتی.

**مِرْفَع** هەرچیەك شتی پێ بەرز بکرێتەوە.

**مَرْفَق** ئەنیشك، ئانیشك، جومگەی پێکەوەگرێ دانی قۆڵ وباڵ، جومگەی نێوان دەفەی شان ومەچەك.

**مِرْفَق** ئەنیشك.

**مُرْفِق** بەکەسێك دەگوترێت لەهەرشتێك زیاد لەپێوستی هەبێت.

**مَرْفِق** هەرچیەك تۆ سودی لێ وەربگریت.

**مَرفوع** بەرزەوەکراو، جۆرە ڕێ ڕۆشتنێکە، فەرمودەیەکە لەسەنەدەکەیدا ڕەفع هەبێت.

●**مَرَقَ** ١/**الطائر**: ڕیقنەی کرد. ٢/**من الدين**: لەئاین دەرچوو بەهۆی گومڕایی یان بیدعەیەکەوە.

**مَرْق، مِرق** خوری یان پێستەی بۆگەن کردگ.

**مَــرَق** ئاوێــك گۆشــتى تياكولێنرابێــت وچــەوربوبێت، ئــاوى گۆشــت، گۆشــتاو، شله.

**مرقَــاة، مَرْقــاة** پله، نمره.

**مَرْقَــب** جێگەيــەكى بــەرزە پاســەوان وچــاودێرتيايدا دادەنيــشن، بــورجى ديدەوانى.

**مِرقَــب** تەلــسكۆپ، تيلــسكۆب، ئــامێرێكى ئــاڵۆزە بـۆ دۆزينــەوەو چاودێرى كردنــى كەهكەشــان وهەســارە دورەكــان زانايــانى گەردونناسى بەكارى دێـنن ورۆڵێكـى زۆر گرنگـى هـەبوە لـەپێش خـستى زانـستى گەردونناســيدا، دوربينـــى زەبـــەلاحى ئەستێرە ناسان.

**مَرقَد** جێگەى خەوتن، گۆڕ، قەور.

**مُرْقِد** دەرمانێكە هەركەس بيخوات وەك تريـاك سـەرخۆش و بـێ هۆشـى دەكـات، ڕێگەى ڕون و ئاشكرا.

**مَرَقَة** گۆشتاو، ئاوى گۆشت، شله.

**مَرْقى** پله، نمره.

**مَركَب** هەرهۆكارێكى لێ سوار بـوون، وەك ترۆمبيل و فڕۆكەو ئەسپ. . . هتد.

**مَركَز** چەق، ناوەند، سەنتەر، ناوەڕاست، نێوەند.

**مَرمــار** هەنارى پڕلەئاو، كيـژى جـوان و نەرم ونۆڵ.

**مَرْمَرَة** بارانى زۆر.

**مَرْمَر** هەنارى پڕئاو، بەردى مەڕمەڕ.

●**مَرْمَرَ** ١/تـوڕە بـوو، ڤينـى داهـات، ڕقـى هەستا. ٢/**الشيءُ**: تاڵ بوو، تامى تاڵ بوو.

**مَرمــى** جێگـەى تيرمنــدازى، گـۆڵ، ئــەو جێگەيـەى لـە گۆڕەپـانى تۆپانێـدا يـارى كــەران هــەوڵ ئــەدەن تۆپەكــەى پيــادا بكەن.

●**مَــرَنَ** ١/خـوى گـرت. ٢/**الجلدَ**: نـەرمى كرد.

**مَــرِن** چــەرمى نــەرم، جــۆرە پۆشـاكێكە، كەنارولاپاڵ، بەخشيش.

**مَرِن** خوو، نەريت، نـەرم ونـۆڵ، جـەنگ وشەڕو شۆڕ.

●**مَــرَّنَ** ١/**الـشيءَ**: نـەرمى كـرد. ٢/**فلانــا على الأمرِ**: ڕاى هێنا.

**مَرو** بەردى چەخماخ.

**مَروت** زەوى بێ گژوگيا.

**مَروُح** مەى، شەراب، ئەسپى چالاك.

**مِروَحَــــة** پانكــە، بزوێنــەرى هــەوا، ئامێرێكى كارەباييە بۆ جوڵاندنى هـەواو پاڵپێوە نانى بەرەوپێشەوە.

**مَــــروُخ** مەڵهــەم، مەرهــەم، هــەتوان، هەرچيەك لەشى پێ چەوربكرێت.

**مُرور** گوزەر کردن، تێ پەڕین، پەڕینەوە، ڕۆشتن، هاتوچۆ.

**مُـرور** گوزەرکردن وتێ پەڕین، مۆڵەتی پەڕینەوە، ترانزێت.

**مُرُوط** خێرایی ڕۆشتن وتێ پەڕین.

**مُرونَة** نەرمی، نەرم و نیانی.

**مُـرُوءَة** پیاوەتی، سیفەتی پیاو، جوانمەردیی.

**مُرْهَق** هەرزەکار، کەسێك سیفەتی کەم ئاوەزیی و نەفامی درابێتە پاڵ، دەست گوشادوبەخشەر، کەسێك لەڕوی دینداریەکەیەوە تۆمەتی لەسەربێت.

**مَـرْهَم** مەڵهەم، هەتوان، مەرهەم، مەڵحەم، ئەوەی زامی پێ چەور دەکەن.

**مُرهَـة** ڕەنگی سپی بێ لەکە، ڕەنگێکی سپی کە هیچ تێکەڵەیەکی تری نەبێت.

**مَرَّة** جارێ، جارێك، یەك کەڕەت.

**مُرَّة** تاڵ، ڕوەکێکە بەرەکەی دەخورێت، ڕژدوبەغیل.

**مَرَّة** جار، کەڕەت.

**مِرِّيح** شادومان، زۆرخۆشحاڵ.

**مِـرِّيخ** نادان، گەمژەوکەم فام، ناوی یەکێك لەهەسارە گەڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆرە.

**مَرِيد** خورمایە دەگرێتە ناوشیرتاکو نەرم دەبێتەوە وپاشان دەخورێت، سەرکەش، شەڕانگێز.

**مِرِّيد** زۆر سەرکەش، شەڕانگێزو بەدرەفتار.

**مَرِير** پیاوی بەهێزو توانا، عەزیمەت وبەهێزی.

**مَـرِيض** نەخۆش، بیمار، ناتەندروست، پێچەوانەی تەندروست ولەش ساغ.

●**مريضَة ١/ من الرياح،** بای بێ هێزو خاو. ٢/خۆرێ ڕوناکی لاوازبێت. ٣/زەمینێك زۆر ئاشوب و شەڕوشۆڕی تیابێت. ٤/ ژنی ناساغ.

**مَرِيط** تیری بێ پەڕ، هەرگیاندارێکی بێ موو.

**مَرِيع** بەپیت، بەفەڕ، پڕلەخێرو بێر.

**مَرينا** جۆرێکە لەمارماسی.

**مَرِيَّة** وشتری پڕلەشیر.

**مُرِيَـة** جەدەل، گفتوگۆ و موناقەشە، گومان ودودڵی.

**مَرِيْء** ڕێڕەوی خۆراك لە گەروەوە تاکو گەدە، خاوەن سیفەتی پیاوەتی، کەسێك پیاوەتی تیادابێت.

**مَرِیءَ** وەکو ژن دووا یاخود وەك ژنی لێهات، وەك ژنی لێهات لەڕوخساردا یان لەقسەکردندا.

**مَرُءَ** خاوەنی سیفەتی پیاوەتی بوو.

**مَرء** پیاو، پیاگ، پێچەوانەی ژن.

**مَرْؤوس** کەسێك ژێردەستەی سەرۆکێك بێت.

● **مَزَّ ١/الرجلُ** بەڕێز بوو، ڕێزداربوو. **٢/الشیءُ** زۆر بوو، زیاد بوو. **٣/الطعمُ** تامی ترش وشیرین بوو. **٤/الشیءَ** مژیی.

**مَزّ** نارەحەت، دژوارو سەخت.

**مِزّ** ڕێزو حورمەت، زۆرو زەوەندێتی.

**مُزّ** هەرشتێك تامی ترش وشیرین بێت، مێ خۆش.

**مِزاج** خوو سروشتی ئادەمیزاد، ڕەفتارو ئاکـــار، ئەوبنەمایـــەی مرۆڤـــی لەسەردروست کریاگە وەك خوو ڕەوشت ولەش ساغی ونەخۆشین و. . . هتد.

**مَـزّاج** درۆزن، پیاگێ لەسەر تەوەرێکی ڕەوشتی نەوەستێت.

**مُـزاح، مَزاحـة** گاڵتەوگەپ، سوعبەت وشۆخی.

**مَزاد، مـزادة** تێشەدان، ئەو هەگبەیەی توێشووی تێ دەکرێت.

**مَزار** سەردان، جێگەی سەردان، مەزاری پیاوچاکان، زیارەتگا.

**مُزارِع** جوتیار، فەلا، کشتیار.

**مَزّاع** زیزگ، ژیژك، ژیژۆك، ژیشك، ژژو، ژیـژۆ، ژیـژی، ژیـژو، ژوژك، گیانداریکـە پشتی بەپەڕیکی زۆر تیـژی وەك دەرزی داپۆشـراوەو لـەکاتی هەسـت کردنیـدا بەمەترسی خۆی گرمۆڵەدەکات وبەڕۆژدا خـۆی وون دەکـات وبەشـەودا هاتوچـوی زۆر دەبێت.

**مُزاعَة** وردەو ڕیزەی هەرشتێك.

**مَزْبَلَة** جێگەی زباڵە، سەلوێنك.

**مَـزْج** تێکـەڵ کـردن، ئاوێتـە کـردن، هەنگوین.

**مَزْح** گوڵە گەنم.

**مَزَحَ** سوعبەتی کرد، گاڵتەو گەپی کرد.

**مَزْد** سەرماو سۆڵە، ساردی.

**مُزْدَحِم** قەرەباڵغ، پڕلەخەڵك، ئاپۆڕەدار.

**مَزَرَ** تامی شیری کرد، کەمێك شیری بۆ تامکردن خواردەوە.

**مَزِر** پیاوی ڕوخۆشی زیرەك.

**مِزر** نـادان، گەمـژە، بنـەڕەتی هەرشـتێك، ئاوی جۆ، بیرە.

**مِزراب** جۆگەلەی ئاو.

**مَزرعَة** جێگەی کشتوکاڵ کردن، کێڵگە.

**مَزْرَة** یەك جار مژین.

**مَزّ** زۆریی وزەومەندی، لەسەرخۆ.

●**مَزَعَ ١/القطن:** بەپەنجەکانی لۆکەکەی شی کردەوە.

●**مَزَّعَ ١/الشيءَ:** پرژوبڵاوی کردەوە.

**٢/القطن:** بەپەنجەکانی شیکردەوە.

**مِزعَة** کڵۆیەك لۆکە.

**مُزعَة** پارچەیەك گۆشت یان پیو، قومێك ئاو.

●**مَزَقَ ١/الثوبَ:** دڕاندی، دڕیی.

**مِزَق** پۆشاکی دڕیاگ.

**مِزقَة** پارچەی جلکی دڕاو.

**مِزلاج** کێلونی درگا، ئەوشتەی بۆ داخستنی درگا بەکاردەهێنرێت.

**مِزمار** نەی، جۆرە شمشاڵێکە، بلوێر.

**مُزَمِّل** کەسێك پۆشاك و لێفەی لەخۆیەوە پێچابێت وئاڵاندبێت.

**مُزمِن** دێرین، نەخۆشی درێژخایەن.

●**مَزَنَ ١/ فلاناً:** مەدح و ستایشی.

**٢/القربة:** پڕی کرد.

**مُزن** هەور، هەوری پڕلەباران، هەورێ بارانی پێوەبێت.

**مَزَن** خو، ڕەوش، شێوە، حاڵەت.

**مُزنَة** باران، واران، هەوری سپی.

**مَزهَرِيَّة** گوڵدان، دەفرێکە گوڵی تێدەکرێت و بۆجوانی دادەنرێت.

**مَزهُو** خۆ بەمزلزان، لوت بەرز.

**مَزَّة** مەزە، شەرابی بەتام، یەکجار مژین.

**مَزِيج** تێکەڵاو، تێکەڵ، ئاوێتە.

**مَزِيد** زیاتر، زیاد.

**مَزِير** پیاوی ڕوخۆش، دڵ ڕەق.

**مُزَيِّن** ئارایشگەر، ڕازێنەرەوە، سەرچاککەر.

**مَزِيَّة** تایبەتمەندی، شایستەگی.

●**مَسَّ ١/الشيءَ:** دەستی لێدا، دەستی پیادا خشاند، توخنی کەوت.

**مُسّ** توشی شێتی بوو.

**مَسّ** سەرشێتی، دەست لێدان، توخن کەوتن.

**مِسّ** مس، پاقر، کانزایەکی سورە دەفرو زۆر ئامرازی لێ دروست دەکەن.

**مَسا** بێ باکی، بێ دەربەستی.

● **مَسَأَ ١/الرجلَ:** بەقسە یان هەرشتێکی تر پیاوەکەی خەڵەتاندو نەرمی کرد.

**مَسَّاح** ئەندازەگری زەوی، ڕوپێوکاری زەوی، مەساح.

**مِساحَة** ڕووبەر.

**مِساد** خیکی ڕۆن وهەنگوین.

**مَسّار** تاوێری زلە، بەردی زەبەلاح.

**مَسار** ڕێڕەو.
**مَسّاس** زۆر دەست لێدەر.
**مَساك** ڕژدیی، چاوچنۆکی وبەغیلی، جێگەیەك ئاوگل بداتەوە.
**مُساهِم** بەشدار، هاوبەش، سەهم دار.
**مُساهَمَة** بەشداریی کردن، هاوبەشی کردن.
**مَساء** ئێوارە، ئێوار، ئێوارێ، تەنگەی خۆر ئاوابون، شێوان.
● **مَسا ١/هـ** پێی گوت ئێوارەت باش.
**مُسَبَّج** پۆشاکی پان وپۆڕ.
**مُسَبَّح** پۆشاکێ زوو نەدرێت وبەرگەگرو بەهێزبێت.
**مَسبَح** مەلەوانگە، جێگەی مەلەکردن.
**مُسَبِّحة** پەنجەی شایەتومان.
**مِسبَحَة** تەسبیح، تەزبیح.
**مُستَبِد** ستەمکار، دیکتاتۆر، خۆسەپێن.
**مُستَتَر** شاردراوە، پەنهان، نائاشکرا.
**مُستَحَمّ** جێگەی خۆشۆردن، گەرماو، حەمام.
**مُستَحِيل** نەستەم، مەحاڵ، هەرشتێك نەگەری دروست بون وسەرهەڵدان و بەئاکام گەشتنی نەبێت.
**مُستَخدَم** بەکار براو، بەکارهێنراگ.
**مُستَخدِم** بەکارهێنەر، ئەوەی شتێك بەکار دێنێت.
**مُستَشرِق** ڕۆژهەڵاتناس.
**مُستَشار** ڕاوێژکار.
**مُستَشفى** نەخۆشخانە، خەستەخانە، بیمارستان.
**مُستَطِير** پەڕاکندە، پرژوبلاو.
**مُستَعجِم** لاڵ، کەسێك نەتوانێت بەباشی بدوێت وزمانگربێت.
**مُستَعرِبَة** بەوکەسانە دەگوترێت کەلەبنەڕەتدا عەرەب نین و وپاشتر بونەتە عەرەب واتە بێگانەن بە خەسڵەت وزمانی عەرەبان.
**مُستَعمِر** ئاوەدان کەرەوە، داگیرکەر.
**مُستَعِير** ئەسپی قەڵەو وپڕگۆشت.
**مُستَغِل** ژێربارخەر، ئیستغلال کەر.
**مُستَغَلّات** بەروبوم وداهاتی موڵك وزەوی.
**مُستَقبَل** پاشەڕۆژ، ئاینندە، داهاتوو.
**مُستَلقي** بەپشتدا خەوتگ، کەسێك بەپشتدا خەوتبێت.
**مُستَمِيت** گیان لەسەر دەست، کەسێك لەشەڕدا گوێ بەمردن نەدات.
**مُستَنَد** هەرچیەك پشتی پێ ببەسترێت، پاڵپشت، سەنەد.

**مُستَنْقَع** ئاوگر، جێگەیەك ئاوی تێدا کۆببێتەوە، زەلکاو.

**مُستَوْدَع** جێگەی پاراستن، سپاردەگا، جێگەی تایبەت بۆ سپاردنی کەلو پەل یان هەرشتێکی تر، جێگەی منداڵ لەسکی دایکیدا، مندالأن، منالْدان.

**مُسْتَوصَف** نەخۆشخانەی بچکۆلە کەبۆ جۆرەهانەخۆشی راوێژ پێشکەش دەکەن.

**مُسْتَوْقَد** ئاگردان، جێگەی ئاگر.

**مُسْتَوِی** ئاست.

**مَسْجون** زیندانی، بەندکراو.

●**مَسَحَ ١/الشيءَ** سڕیی، مالّیی، ڕایمالّی. **٢/الإبلَ** هیلاك وشەکەتی کرد. **٣/فلاناً** لێیدا. **٤/مَسْحاً** درۆی کرد. **٥/الأرضَ** پێوانە ودابەشی کرد.

●**مَسَّحَ ١/فلاناً** قسەی چاکی بۆکرد بۆ وەی بیخەڵەتێنێت.

**مِسح** پەلاس، بەڕە، بەڕەکۆن، بەڕەی لەسەر دانیشتن.

●**مَسَخَ ١/هُ** وێنەو شێوەیی گۆڕی بۆ شێوەو وێنەیەکی دزێو و ناشیرینتر. **٢/الكاتبُ** لەنوسیندا هەڵەی زۆری کرد.

**مَسخ** نەسخ بونەوە، لەبەشەکانی تەناسوخە وهەلگرانی ئەم تێزە پێیان وایە گیان لەلەشی مرۆڤەوە دەگوازرێتەوە بۆ لەشی ئاژەڵێکی تر بەمەرجێك ئاژەڵەکەو مرۆڤەکە لەسیفەتدا هاوتابن، واتە گیانی مرۆڤێکی ئازا دەگوازرێتەوە بۆ ناولەشی شێر، مرۆڤی ترسنۆك گیانی دەخرێتە جەستەی کەروێشك و. . . هتد.

**مُسَخَّر** ژێربارخراو، دەستەمۆکراو، بێگار پێکراو.

**مَسْخَرَة** هەرشتێك شیاوی گاڵتە پێکردن بێت.

**مَسْخَط** هەرچیەك ببێتە هۆی تورە بوون.

**مَسْخُوط** بێزراو، تەرێز لێکراو، نەخوازراو.

**مَسَد** گوریس لەلیفی خورما.

**مُسَدَّس** روبەری شەش پالو، دەمانچە.

**مُسَدَّل** پرچێکی زۆر درێژ.

**مَسْرَب** ڕێڕەوی ئاو، جۆگە یان هەر ڕێڕەوێکی تر.

**مِسْرَح** شانە، هەرشتێك پرچی پێ دابهێنرێت.

**مَسْرَح** تەختی شانۆ، جێگەیەکە بۆ پیشاندانی شانۆگەری سازدەکرێت.

**مَسْرَحِيَّة** شانۆگەری، نمایشی سەرتەختی شانۆ.

**مسرور** شادومان، شاد، پێچەوانەی دڵتەنگ وغەمگین.
**مَسَرَّة** شادی، خۆشی.
●**مَسَطَ ١/فلاناً:** بەقامچی لێیدا، بەشەلاق لێیدا.
**مَسْطَرة، مِسْطَرة** ڕاستەی خەت کێشان، ڕاسە، یەکێکە لەپێویستیەکانی قوتابی.
**مَسْقَبَة** برسێتی وتەنگانە.
●**مَسْفَلَة ١/** خوارو، بەشی خوارەوە.
**٢/الجبل:** دامێنی کێف، دامێنی شاخ.
**مَسْقط** باڵی پەلەوەر، باڵی باڵندە.
**مَسْقَط** جێگەی کەوتن، ئەوجێگەیەی منالْ تیایدا لەدایك دەبێت، زێد.
**مَسْقَی** کاتی ئاودان، وەختی ئاودێران.
**مَسْك** پێستە، پێست.
**مُسْك** ئاوەزێکی گەورە، ئەقڵێکی فراوان.
**مِسك** میسك، بۆنێکی خۆشە.
**مُسُك، مُسُكة** ڕژد، بەغیلْ، چاوچنۆك.
**مَسکَن** ماڵ، خانوو، لانەی مرۆڤ، خانگ.
**مُسَکِّن** ئارامی بەخش، هێمن کەرەوە.
**مَسْکَنَة** هەژاریی، نەداری وسەرشۆڕی، کەم توانایی و لاوازی.
**مُسَکَة** ڕژد، چاوچنۆك، بەغیلی بەرچاوتەنگ.
**مِسْکین** هەژار، نەدار، دەستکورت، بێ نەوا، بەکەسێك دەگوترێت ئەوەندەی نەبێت بیدات بەماڵ ومنداڵی تا کومساییان بێت.
**مَسَل** ڕێڕەوی ئاو.
**مِسَلّة** سوژن، سوزن، دەرزی گەورە.
**مُسَلَّح** چەکدار.
**مَسْلَخ** قەسابخانە، جێگەی تایبەت بەسەربڕین وقەڵغ کردنی ئاژەڵ.
**مَسْلَك** ڕێگە، ڕێ.
**مسلول** کەسێك دوچاری نەخۆشینی سیل بوبێت، شمشێری بڕندە.
**مِسمار** مێخ، بزمار، بسمار.
**مِسْمَع** گوێ، گوێچکە.
**مُسَمّی** دیاریکراو، دیاری کریاگ، ناولێنراو، ماوەیەکی دیاریکراو.
**مَسَنَ ١/هـ:** لێیدا تاکو بکەوێت، ئەوەندەی پیاکێشا تاکو بکەوێت.
**مُسِنّ** بەساڵاچووگ، پیر، بەتەمەن.
**مُسَوَّدة** ڕۆژگاری خەفەت هێنەر، ڕۆژانی خەمگینی.
**مُسَوَّدة** ڕەش نوس، دەست نوسی بۆچاپ ئامادەکراو.
**مُسْهِل** دەرمانی ڕەوانی، دەرمانێك مرۆڤ ڕەوان بکات وقەبزێتی نەهێڵێت.

**مَسيح** ناوى حەزرەتى عيسايە (د. خ)، كەسێك زۆر گەشت وگەڕان بكات، جوان ڕوخسار، پارچەيەك زيو، هاوڕێ، هەڤاڵ ودۆست، برادەر، كوێر، نابينا، زۆر درۆزن.

**مَسيحى** شوێنكەوتوى ئاينى عيسا پێغەمبەر، فەلە، گاور، فلە، خاچپەرست.

**مَسيخ** بێ مەزە، بێ تام، چێشتى بێ خوێ، گەمژەو نادان، هەركەسێكى ناشيرين وناجوان.

**مَسيط** قوڕ، ناوى لێخن كەلەبنكى حەوزدا دەمێنێتەوە.

**مُسَيْطِر** چاودێر، زاڵ.

**مُسِيف** هەژار، نەدار، دەست كورت، فەقير.

**مَسيك** ڕژد، چاوچنۆك وبەخيل.

●**مَشَّ ١/الشيءَ** لەئاودا خوساندى تاكو تواندیەوە. **٢/فلاناً** دوژمنايەتى وركابەرى لەتەكدا كرد. **٣/الناقةَ** وشترەكەى دۆشى وهەندێك شيرى لەگوانيدا هێشتەوە. **٤/يَدَه** سڕيى بۆ وەى چەوريەكەى لێ بكاتەوە.

**مُشارَكَة** بەشداريكردن، بەشدارى.

**مَشَارة** پارچە زەويەك كەبۆ كێلان دەست بدات.

**مُشَاش** زەوى نەرمەڵان، بنەڕەتى هەرشتێك، سروشت.

**مُشان، مَشَان** جۆرێك خورمايە، لەهەرە باشترين جۆرەكانى خورمايە.

**مَشأمَة** بەدبى، شومى.

**مُشَبَّك** جۆرە شيرينى يەكە، هەرشتێكى شەبەكەدار.

**مَشْبُوه** گومانلێكراو.

●**مَشَجَ ١/ه بكذا** تێكەڵى كرد، ئاوێتەى كرد.

**مَشْج، مِشْج، مَشَج، مَشيج** تێكەڵ، ئاوێتە.

**مُشْجِر** جێگەيەك درەختى زۆر بێت، پڕلەدرەخت.

**مُشَجَّر** هەرشتێك لەشێوەى درەختدا بێت، نوسينى خەڵكى چين وژاپۆن كەلە شێوەى درەختدايەو تێكەڵ وپێكەڵ وپێكدا ئاڵاوە، خەتى نوسينى چين وژاپۆن.

**مَشْحون** پڕ، بارگاوى كراو.

**مِشْذَب** داسى تايبەت بەقرتاندنى پەل وپۆى زيادەى درەخت.

●**مَشَرَ ١/الشجرُ** پەل وپۆى سەوزى ناسكى دەركرد.

●**مَشَّرَ ١/الشيءَ:** دابەش وپرژوبلاوی کرد. **٢/الشجرُ:** پەل وپۆی سەوزی ناسکی دەرکرد.

**مَشَر** شوێنەوار، ئاسەوار.

●**مَشْرَة ١/**پەل وپۆی سەوزی ناسکی درەخت. **٢/الأرض:** ڕوەك وگژوگیای زەوی.

**مَشْرَب** ئاو، جێگەی خواردنەوە، هەنوکە ئەم وشەیە لەبەرانبەر هەوەس و ئارەزودا بەکاردەبەن.

**مُشَرَّد** ئاوارە، دەربەدەر، تەرە، هەڵوەدا، دورلەزێنگەی خۆی.

**مُشرِك** هاوبەش پەرست، کەسێك هاوبەش بۆ خوای گەورە بڕیار بدات، کەسێك بڕوای بەبونی هاوبەشێك بۆخودا لەخوایەتیدا هەبێت ئیتر ئەم بڕوایە بەدەم دەربڕێت یاخود لەکردەوەکانیدا ڕەنگ بداتەوە.

**مَشْروب** خواردنەوە، هەرشتێك بخورێتەوە.

**مَشروع** شەرعی، دروست، ڕەوا.

●**مَشَطَ ١/الشعرَ:** پرچی شانەکرد، قژی بەشانەکرد.

**مَشط، مِشط، مَشِط** شانەی پرچ داهێنان، ددانەدارێ بۆ قژ ڕەهاکردن.

**مُشْط** ئامرازێکی چنینە، جۆرە ماسیەکە.

**مشطَة** جۆرێ لە قژ داهێنان.

**مَشْظ، مِشْظَة** دڕکێ چوبێت بەدەست یان قاچدا.

**مَشْظَة** هەواڵی پەنهانی، هەواڵی پەنامەکی کەنەزانرێت ڕاستەیان نا.

●**مَشَعَ ١/الشيءَ:** بەدەستی هێنا، دزیی. **٢/القطن:** شیکردەوە. **٣/الرجل:** نەرمە ڕەوتی کرد.

**مَشْعَب** ڕێگە، ڕێ.

**مَشْعَر** نیشانە، ئامـاژە، جێگەی مەناسیکەکانی حەج، درەختێك سێبەری پێ بکرێت.

**مَشْعَلْ** مەشخەڵ، مەخشەڵی ئاگر کەبەدەست هەڵدەگیرێت بۆ ڕێگە ڕوناك کردنەوە.

**مَشْعُوف** شێت وسەرگەردان.

**مِشعَة، مِشيعَة** پارچەیەك لۆکەی هەلاجی کراو.

●**مَشَغَ ١/ه:** لێیدا، لەکەداری کرد، عەیبداری کرد.

**مشْغ** قوڕی سور، قوڕە سورە.

**مشغَة** پارچە قوماش وپۆشاکی کۆنە.

**مُشفِق** دڵسۆز، بەبەزەیی.

● **مَشَقَ ١/الشعرَ** شانەی کرد. **٢/الثوبَ** دڕاندی. **٣/ه بالسوط** لێیدا. **٤/في الكتابة** پیتەکانی درێژ کردەوە، پەلە پەلی تێدا کرد.

**مُشِقَ** درێژو باریك بوو.

**مَشْق** قوڕی سور، قوڕە سورە.

**مَشِقَ** هەردوو ڕانی بەریەکتری کەوتن ولێك خشان وبەهۆیەوە بەینی ڕانی سوتایەوە.

**مُشقَة** سوتانەوەی نێوان هەردوو ڕان بەهۆی لێك خشانیانەوە.

**مَشَقَّة** نارەحەتی، ڕەنج ودەردەسەری.

**مُشْكِل، مُشكِلَة** گرفت، هەرمەسەلەیەکی قورس ودژوار، هەرمەسەلەیەك ڕون نەبێت.

**مَشْل** شیری کەم، شیرێکی کەم.

**مِشْمِش** قەیسی، درەختی قەیسی، زەردالۆ، دنکە خۆشەی زەردالۆ.

**مُشَمَّع** موشەمما، موشەما، هەرچنراوێکی لەلاستیك کەباران و ئاو دانەدات.

**مَشْمَعَة** جێگەی دروستکردن یان فرۆشتنی مۆم.

● **مَشَنَ ١/ه** ڕنیی، ڕوشاندی. **٢/ه بالسوط** بەشەللاق لێیدا. **٣/ه بالسيف** بەشمشێر لێیدا و پێستەکەیی ڕوشاند.

**مَشْنَقَة** سێدارە، پەتی سێدارە، ئەو جێگەی تاوانبارانی تێدا لەسێدارە دەدەن و دەیان خنکێنن.

**مَشُوب** تێکەڵ، ئاوێتە.

**مَشْوَرَة** مشورەت، ئامۆژگاری، ڕاوێژ.

**مَشُوش** دەسماڵ، دەسڕ، دەستەسڕی دەست، دەسڕە، دەرسۆك.

**مُشَوَّش** بزرکاو، شڵەژاو، ئاڵۆسکاو، ئائاسایی، حەپەساو.

**مَشْهَد** جێگەی کۆبونەوەی خەڵك، دیمەن و کەفاڵ.

**مَشهور** ناودار، بەناوبانگ، شۆرەت دار.

**مَشي** بەرێدا ڕۆشت.

**مَشّي** دەرمانێ مرۆ ڕەوان بکات.

**مَشيج** تێکەڵ، ئاوێتە.

**مَشيئَة** خواست، ئارەزوو، ویست.

**مَشْؤم** نەحس، شوم، بەد، نەگبەت.

**مَص، مُصّ** مژین.

**مُصابَة** بەدبەختی، بەلا.

**مصاحات** پێستەی بێچوی مردوی وشتر کە پڕدەکرێت لەگیاو دەخرێتە بەردەم وشترەکە بۆ وەی واگومان بەرێت کەبێچوەکەی خۆیەتی و نەمردوە.

**مُصَاخ** گیایەکە بەتەواوی لەپیاز دەچێت.

**مَـصَاد** قوللـەی کێـو، لوتکـەی شـاخ، گردۆلکەی بەرز.
**مَصَارّ** ریخۆلە.
● **مُصارِع** ١/ زۆرانباز. ٢/**الثیران** گاباز، کەسێك گابازی بکات، کەسێکە ململانێ لەگـەڵ گـادا دەکـات لەبـەردەم جەماوەرێکدا.
**مُصارَعَة** زۆرانبازی.
**مُـصاص** پوختـەو پاڵفتـەی هەرشـتێك، کەسێك زۆر نەژادی پاك بێت.
**مَـصاص** کەسـێك زۆر بمـژێت، مـژەر، کەلەشاخگر.
**مُصّان** قامیشی شەکر.
**مَصّان** ناچیزە، کەلەشاخگر.
**مـصاعِب** نارەحەتیـەکانی ڕۆژگار(وشەکەجەمعە).
**مصافَحَة** تەوقەکردن.
**مصالَحَة** ئاشتی، ئاشتەوایی کردن.
**مُصالَة** ئاوێ لەزام بتکێت.
**مَصَبّ** جێ ڕژێنگەی ئاو.
**مصباح** چرا، گلۆپ.
**مَصبَغَة** خۆبەزلزانین، لوت بەرزیی.
**مصبوغ** ڕەنگین، ڕەنگ کراو.
**مَصَحّ** ڕۆشت، ڕۆیی.
**مُصْحَف** قورئانی پیرۆز.

●**مَـصَخَ** ١/**الـهیءَ لنفسه،** شتەکەی بـۆ خۆی بچڕی.
**مَصْد، مَـصَد** گردۆلکەی بـەرز، سـەختی سـەرما، قرچـەی گـەرما، بـاران وچەخماخە.
**مَصَد** مژیی.
**مصدر** چاوگ، سەرچاوە، ژێدەر.
**مُصَدَّر** شێری بێشەو جەنگەڵ، گورگ، پیاوێ سنگی گەورەبێت، پیاگێ سنگی بەهێز بێت.
**مصدوع** سەرپەشاو، کەسێك توشی ژانـە سەر بوبێت.
**مَصْدَة** باران، واران.
**مِصر** بەربەستی نێوان دووشت، سنوری نێـوان دووزەوی، شـار، نـاوی ولاتێکـی گەورەی عەرەبیە، جۆرە خۆڵێکی سورە.
**مِصران** کوفە وبەسرە.
●**مَصَرَ** ١/**القوم،** پرژوبلاو بونەوە.
**مَـصْرَع** جێگـەی لەناوچـون وکـەوتن، لەناوچوون و سەرنگوم بوون.
**مُصطفی** هەڵبژێردراو.
**مَصْع** بازاڕ، شوێنی سەداو مامەڵە.
**مَصِع** کەسێك بەشمشێر بجەنگێت.
**مـصْنَعَد** سـەرخەر، ئامێرێکـە بـەکارەبا دەبزوێـت بەشـێوازی شـاقولی دەخرێتـە

ناو ئەو ئەپارتمانانەی نھۆمی زۆریان هەیە ومرۆڤ وکەل و پەلی پێ سەر دەخرێت بۆ نهۆمە بەرزەکان و بەپێچەوانەشەوە.

**مِصقَل** وتاربێژی زمان پاراو وقسەزان.

**مسکوکات** هەرجۆرە پارەیەك لەسکە درابێت، لەسکەدراو.

●**مَصَلَ ١/مالهُ:** ماڵ وسامانی خۆی لەشتێکدا سەرف کرد کەخێری تێدا نەبوو. **٢/الجرح:** کەمێك زرینچکاوی لێ تکی.

**مُصْلِح** چاکساز، ڕیفۆرمیست.

**مَصْلَحة** بەرژەوەندی، خێرو بەرژەوەندییەك بەچاکە بگەڕێتەوە سەر مرۆڤ خۆی یان نەتەوەو هۆزەکەی.

**مَصْلِيّ** گۆشتی برژاو، گۆشتی برژیاگ.

**مُصَلَّى** جێگەی نوێژ کردن.

**مَصْنَع** کارخانە، کارگە، ئەو جێگەیەی ئاوی بارانی تیاکۆ ببێتەوە.

**مُصَنَّف** پەڕاوی نوسریاگ.

**مَصْنوع** دروست کراو، وەدی هێنراو.

**مَصوُر** وشترێ خاوەخاو شیر لەگوانی بێتە دەر، کەم.

**مُصَوِّر** وێنەگر، وێنەکێش، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە.

**مُصَوَّرة** کامێرای وێنەگرتن.

**مِصْهَر** کوورە.

**مُصّة** پاڵفتە وپوختەی هەرشتێك.

**مُصيب** کەسێك ڕاستی بپێکێت، پێچەوانەی هەڵەکار.

**مُصِيْبَة** موسیبەت، بەڵا وسەختی، هەر پێشهاتێکی ناخۆش وبێزراو کەتوشی ئادەمیزاد دەبێت.

**مِصْيَد** هەرچیەك ڕاوی پێ بکرێت.

**مَصير** جێگەیەکە لەدوای گەدە خواردنی پێدا دەڕوات.

**مَصير** چارەنوس، مەسیر، سەرەنجامی هەرکارێك، کۆتایی هەرمەسەلەیەك.

**مَصيص** شێدار، تەڕونماك.

**مَصِّيص** جۆرە دەزویەکی بەهێزە.

**مَصيف** هاوینەهەوار، هاوینگە، هاوینەوار، وار، جێ ژیانی خێڵات لەزۆزان.

●**مَضَّ ١/الجرح فلاناً:** ئازاری پێگەیاند. **٢/الخَلُّ فاهُ:** سرکەکە دەمی ئەوی سوتاند.

**مَضاض** سوتان.

**مَضّاض** سوتێنەر.

**مُضَاض** ئاوێك لەبەر سوێری نەخورێتەوە، ژانی چاو یان

هەرجێگەیەکی دیکەی بەمئازار، پوختە و باڵفتەی هەرشتێك.
**مُضَاغَة** نادان، گەمژە، گەلحۆ.
**مَضاء** توندیی وتیژیی.
**مَـضّاء** کەسـێك زۆر ویـست وخواسـتی بەهێزبێت.
**مَضجَع** جێگەی خەوتن وهەلاَ ژیان.
● **مَـضَحَ ١/عِرضَـهُ**: لەکـەداری کـرد، ناموسـی کەسـێکی عەیبـدار کـرد. **٢/تِـو الـشمسُ**: تیـشکەکەی بەسـەر زەویـدا بلاّوبویەوە.
**مَضَخّة** ترومپای ئاو.
**مَضَرّة** زیان، زەرەر.
**مِضْغَط** دەستگای پێوانی فشاری هەوا.
**مُـضغَة** پارچـەیەك گۆشـت، پارچـە گۆشتێکی بچوك.
**مَضمون** نـاوەڕۆك، چـەمك، ئـەو مانایـەی لەڕستەیەك دەفامرێتەوە.
**مَضَّة** شیرو ماستی ترش.
● **مـضی ١/الـشيءُ**: ڕۆشـت وڕابـورد، تـێ پەڕی وگوزەری کرد. **٢/سبيلهُ**: مرد.
● **مَضَى ١/الامرَ**: جێ بەجێی کرد.
**مُضيء** ڕۆشن کەرەوە، ڕوناك کەرەوە.
**مِضياف** میوان نەواز، مێڤان دۆست.
**مَضيف** میوانخانە.
**مَضيق** تەنگە، تـەنگایی، جێگـەی تەسـك بونەوەی دەریا.
● **مَطَّ ١/الشيءَ**: درێژی کردەوە. **٢/الدلوَ**: ڕای کێشا. **٣/خَدّهُ**: لوت بەرزی نواند.
**مَطَا** لەرێ ڕۆشـتندا پەلـە پـەل وخێـرای کرد.
**مَطا** پشت، لەدواوە لەشان ڕا تاسەر ڕان.
**مطاخ** نادان، گەلحۆ، کاڵ فام، لوت بـەرز، خۆبەزلزان، درۆزن.
**مَطـار** فڕۆکەخانـە، فڕگـە، جێگـەی نیشتنەوەو لێوەهاتنی فڕۆکە.
**مَطار، مَطَارَة** بیروچاڵێ دەمەکەی پـان بێت.
**مَطـارِد** ڕمـی کـورت، نێـزەی کـورت (وشەکەجەمعە).
**مُطارَدَة** ڕاوەدونان.
**مَطـاط** لاسـتیك، پلاسـتیك، لاسـیق، لاستیق، جـیر، جیـل، مادەیـەکی نەرمـەو کێشی دێت و دەتوانرێت بەپێی پێویست ڕابکێشرێت وکاریگەری گـەورەی بەسـەر ژیاری هەنوکەی مرۆڤایەتیەوە هەیە.
**مَطّـال** کەسـێك زۆر بژاردنـەوەی قـەرزدوابخات، کەسـێك دەسـی دەسـی بەدانەوەی قەرزبکات، قەرزکوێر.

**مَطْبَخ، مُطَبَّخ** چێشتخانە، جێگەی ئاشکردن، جێگەی چێشت دروست کردن.
**مَطْبَع، مَطْبَعَة** چاپخانە، جێگەی چاپکردنی پەڕاو و چاپکراوەکان.
**مِطْبَع** دەستگای چاپکردن، ئامێری چاپکەر، ئامرازی چاپکردنی کتێب و. . . هتد.
**مَطْحَنَة** ئاش، جێگەی هارینی دانەوێڵە.
●**مَطَحَ ١/ هُ بِيَدِه** لێیدا. **٢/ عِرضَهُ:** شەرەف و ناموسی ئەوی لەکەدار کرد.
●**مَطَرَ ١/ الشيء:** بەرز بویەوە، بڵند بویەوە.
**مَطَر** باران، واران، دڵۆپە ئاوێ لەهەور بێتە خوارێ.
**مُطْر** خوو، نەریت، گوڵی گەنمە شامی.
**مَطِر** باراناوی، ڕۆژێکی باراناوی.
**مُطْرِب** گۆرانی بێژ، ستران وێژ.
**مِطْرَد** ڕمی کورت، نێزەی کورت.
**مِطْرَح** ڕمی درێژ، نێزەی درێژ.
●**مُطَرَّد ١/ من الأيام:** ڕۆژی درێژ، هەر ڕۆژێکی درێژ.
**مُطْرِد** هەر فەرمانێکی گشتگیرو بێ ڕێزپەڕ.
**مَطْرَدَة** ناوەڕاستی ڕێگە.
**مُطْرِف** ماڵ وسامانێك تازەکی بەدەست هێنرابێت.
**مِطْرَق** چەکوش، چەکوچ، دەستگایەکی تایبەت وسادەیەو زۆرێك کاری پێ دەکرێت.
**مِطْرَقَة** چەکوش.
**مَطْرَة** خوو، نەریت، ناوەڕاستی حەوز.
**مُطْرَة، مَطْرَة** خوو، نەریت.
**مَطْعَم** چێشتخانە، جێگەی نان خواردن، خۆراك.
**مَطَلَ** دەسی دەسی کرد، موماتەڵەی کرد.
**مُطْلَة، مَطْلَة** ئاو لەبنکی حەوزدا، پاشماوەی ئاو لەبنکی حەوزدا.
**مَطْلَب** داخوازی، داواکاری.
**مَطْلَع** سەرەتای خۆرکەوتن، یەکەم کۆپلەی هۆنراوە.
**مَطْلِع** ئەو جێگەیەی ئەستێرەی لێوە هەڵدێت.
**مُطْلَق** ڕەها، ئازاد، بێ سنور، بێ بەندوباو.
**مُطْمَئِن** ئاسودە، ئارام، دڵنیا.
**مِطْو** گوڵی گەنمە شامی، هاوڕێ وهاوشان.
**مَطْوَة** چەقۆ، قەڵەم تاش، قەڵەم دادەر.

**مَطهَـرَة** جێگەی پاکی وپاك کردنەوە، هۆکاری پاکژی وخۆپاك کردنەوە.

**مَطهَـر** دەڵێن گوایە جێگەیەکە دەرونە پاکەکانی تیادا دادەنرێت لەدوای مردن وماوەیەك سزادەدرێن بۆ وەی باشترپاك ببنەوە.

**مَطیلـة** پارچە ئاسنێکە گەرم دەکرێت ولێی دەدرێت وپان دەکرێتەوە.

**مَطیّة** حوشتری سواریی ئیدی نێربێت یان مێ.

● **مَطّ ٨/ه:** لۆمەی کرد، تانەو تەشەری لێدا.

**مَظّ** هەنار.

**مُظاهَرَة** خۆپیشاندان بۆ پشتگیری ڕێك بخرێت یان بۆ پرۆتستۆ کردن.

**مُظلَة** پاشماوەی گژوگیا.

**مظعان** ئەسپی نەرمەڕەوت.

**مظفار** کەسێك هەوڵی بۆ هەر شتێکدا سەرکەوتوبێت تیایدا، کەسێك سەرکەوتوبێت لەهەوڵەکانیدا.

**مُظلِم** تاریك، نوتەك، تار.

**مَظلَمَة** زەوت کراو، هەرچیەك بەستەم لێت داگیر کرابێت.

**مِظَلّـة** چادری گەورە، چەتر، سەیران، شتێ کەبۆ پارێز لەهەتاوی گەرم وباران بەسەریانەوە دەگرن، پاراشوت، پەڕەشوت.

**مِظَلّی** ئەوکەسەی بەپاراشوت لەفرۆکەوە خۆی هەڵدەداتە خوارێ.

**مَظهَر** ڕواڵەت.

**معاد** ڕۆژی قیامەت، جیهانی ئاخیرەت.

**مَعاد** نەخۆشینی گەدەیە.

**مَعاذ** پەناگە.

● **مَعـاذ ٨/الله:** پەنابەخوا، پەنا بەخوادەگرم، خودا جێگەی پەنایە.

**مَعار** لاف لێدەر، گەزاف لێدەر.

**مُعـارِض** نەیار، دوژمن، دوشمن، ئۆپۆزسیۆن، بەرهەڵستکار.

**مَعارِف** زانست وزانیاری، ڕوخسار، شێوە، جوانیەکانی ڕوخسار(وشەکەجەمعە).

**مَعاز** شوانی بزن، خاوەنی بزن.

**مَعـاش** ڕۆزی، هۆکاری ژیان، معاش، بژێوی.

**مُعالَجَـة** چارەسەر، دەرمان، دەوا، چارەسەرکردن.

**مُعامَلَة** مامەڵە، سەوداو مامەڵە.

**مَعان** خانو، مەنزڵ.

**مُعاهَدَة** پەیماننامە، پەیمان وبەڵێن، پرۆتۆکۆل.

**مَعـــایر** ناتـــەواوی وکـــەم وکورپیـــەکان، عەیبەو بەدیەکان.

**معاء** ڕیخۆڵە، ڕۆخلە، ڕۆدی، روفی.

**مَعْبَـد** پەرستـگا، جێـگە بـەجێ هێنـانی پەرستش، جێگەی خواپەرستی کردن.

**مَعاً** پێکەوە، بەیەکەوە، لەگەڵ یەکدیـدا، لەتەك یەکتردا.

**مَعْبَر** گوزەرگا، جێگەی لێوە گوزەرکردن و پەڕینەوە.

**مُعْتَدِل** میانە ڕەو، ناوەڕاست.

**مُعْتَرّ** هەژار، نەدار.

**مُعَتَّر** پیاوی قەڵەوی گۆشتن.

**مُعْتَزّ** سەرفراز، سەربەرز.

**مُعْتَصَم** جێگەی پەناگرتن.

**مُعْتَقَد** باوەڕ، بڕوا.

**مَعْـج** جـەنگ، شـەڕ، پـشێوی ونائـارامی، هەلکردنی بابەهێمنی.

● **مَعَـجَ** ١/بـەخێرایی ڕۆشـت. ٢/**البحـرُ**: شەپۆلیدا.

**مُعْجِب** خودپەسەند، لەخۆڕازی.

**مُعْجِـــزَة** مـــوجیزە، مـــۆجیزە، هـــەر ڕوداوێکی نائاسایی کـەمرۆڤ دەستەوسـان بێـت لـەوەی بتوانێـت لاسـایی بکاتـەوە، ئەوکارانەی خودا کارمکتەری خولقێنەرو هەڵسوڕێنەری ڕاستـەقینەیان بوگـەو بـۆ پـــــشتگیری پێغەمبـــــەران "د. خ" وســـەلماندنی ڕاســـتی بانگەشـــەکانیان نیشانی مرۆڤایەتی داون، قورئان چونکە بۆخۆی مۆجیزەیە.

**مُعْجَـم** فەرهـەنگ، پـەڕاوی لێکدانـەوەی زمان.

**مَعجَـنة** سـەرەتاو دەسـتپێکی هەرشـتێك، ترۆپکـی گـەنجی، تـافی لاوێتـی، هـەرەتی لاوی.

**مُعِـدَ** گـەدەی ژانـی کـرد، مەعیـدەی هاتەئێش.

● **مَعَـدَ** ١/**الـشيءَ**: دزیـی، بەپەلـەو خێـرا ڕای کێشا. ٢/**الشيءُ**: خراپ بوو.

**مَعْـد** وشـتری تیـژڕەو، حوشـتری خێـرا لەڕۆشـتندا، قـەوی وقـۆڵ، تـەڕو تـازە، میوەی تەڕوتازە.

**مَعَدَ** سك، زگ، ورگ، هورگ.

**مَعِـدة، مِعْـدَة** گـەدە، مەعیـدە، شـوێنی هەرسـکردنی خـواردن لـەزگی مـرۆڤ وئاژەڵدا.

**مَعْدَن** کانزا، کان.

**مُعَدِّن** کانزاچی.

**مَعْدوم** نەبو، شتێك نەهاتبێتە بوون.

**مَعديَ** دەرمانی بەهێزکردنی گەدە.

**مَعْدِيَ** ستەم لێکراو، ستەمبار.

**نَثَرَ** به توندی ڕایکێشا.
**نَثِر** سستی لەکاردا.
**نَثِرَ** خراپ بوو.
**نَتَشَ** موی هەڵ کێشا، کەسابەتی بۆ ماڵ ومنداڵی کرد.
**نَتَحَ** کەم کەم خوێن لە زامەکە یان ئاو لە کانیەکە هاتە دەر.
**نَتَغَ** غەیبەتی پیاوەکەی کردو بەخراپ باسیکرد.
**نَتَفَ** موی هەڵکەند.
**نَتَقَ** بەرزی کردەوە.
**نَتْل** هێلکەی وشترمر.
**نَتَنَ** بۆگەنی کرد.
**نَتِنْ** بۆگەن.
**نَتیجة** بەرەنجام، بەرهەم.
**نَتیلة** وەسیلەو هۆکار.
**نَثَّ** هەواڵی بڵاوکردەوە.
**نِثـــاث** ڕۆنـــێ زامـــی پـــێ بمالرێـــت، چەوریەك برینی پێ چەوربکرێت.
**نَثّاث** کەسێك زۆر ڕاز ئاشکرا کەر بێت، ئاشکراکەری نهێنی.
**نِثـــار** هـەر شـتێ لەشـایی وزەماوەنـددا بکرێت بە سەر ئامادەبواندا.
**نَثْر** پەخشان، تۆز بەباداکرن.
**نَثَرَ** پەخشانی گوت یان پەخشانی نوسی.

**نَثِر** قسە زۆر کەر، بڵاوکەرەوەی ڕازان.
**نَجا** ڕزگاری بوو.
**نَجابَة** نەجابەت و ڕێزداریی.
**نُجاث** لێکۆڵەرەوە لەشتان.
**نَجاح** سەرکەوتن لەهەوڵدا.
**نَجاحَـــة** ئـارامگریی، بەدەسـت هێنـانی سەرکەتن لەهەوڵدا.
**نَجّـــاد** دروســتکەری فــەرش ودۆشــەك وسەرین، لەحافدۆز.
**نِجادة** پیشەی لەحافدۆزی.
**نُجار** ئەصڵ وبنەڕەت، نەژاد.
**نَجّار** دارتاش.
**نُجارة** دارتاشی، پیشەی دارتاش.
**نِجار** ڕەنگ.
**نَجاز** بەدەست هێنانی پێداویستی.
**نَجاسَة** پیسی وپڵۆخی.
**نَجّاش** ڕاوکەر.
**نَجّاشي** کەسێکە نێچیر هەڵدەستێنێت بـۆ وەی نێـچیرەکە بەبـەردەم ڕاوکـەردا بـڕوات تـا ئـەمیش ڕاوی بکـات، نازنـاوی پادشایانی حەبەشە.
**نَجاة** ڕزگاریی، دەرباز بوون.
**نَجُبَ** خاوەنی نەجابەت بوو.
**نُجْب** بەخشندەو دەست گوشاد.
**نَجَثَ** بەدویدا گەڕا، توێژینەوەی بۆ کرد.

**نَجَحَ** سەرکەوت، لەهەوڵەکانیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.
**نُجْح** سەرکەوتن.
**نَجَخَ** شانازی کرد.
●**نَجَدَ ٨/هُ** یارمەتیدا، فریای کەوت.
**نَجْد** ڕێگەی بەرز، مەمکە، هەرجێگەیەك درەختی تێدا نەبێت.
**نَجُدَ** ئازاو دلێر بوو لەکارێکدا کەکەسی تر نەیدەتوانی توخنی بکەوێت.
●**نَجَّدَ ٨/البیتَ** ڕازاندیەوە.
**نَجَذَ** گەستی، پێداگری کرد.
**نَجَرَ** ڕۆژەکە گەرم بوو.
**نَجْر** گەرمی، بنەڕەت ونەژادی هەر شتێ، ڕەنگ.
**نَجَر** تینوێتی وشترومەڕ.
**نَجَزَ** بەدەستی هێنا.
**نَجِس** پیس وپلۆخ.
●**نَجَّسَ ٨/هُ** پیسی کرد.
**نَجَس** پیسی، چەپەڵی، پلۆخی.
**نَجَشَ** بەدویدا گەڕا، لەدوێی پەرتەوازەیی کۆی کردەوە.
**نَجْع** گوندی گچکە، چادری پەشمین.
●**نَجَعَ ٨/القومُ** ڕۆشتن بۆ هێنانی گیا.
**نَجَفَ** دارەکەی لەبنەوە بڕی.

**نَجَفْ** هەرجێگەیەك بڵند بێت وئاوی بۆ سەر نەکەوێت، شارێکی عێراقە مەزارگەی حەزرەتی عەلی لێیە.
**نُجفَة** هەر شتێکی کەم.
**نَجَلَ** دەریخست، زەوی کێڵا.
**نَجْل** کوڕ، کار، گرۆیەکی زۆر.
**نَجَمَ** دەرکەوت وهەڵهات.
**نَجْم** ئەستێرە، بنەڕەت.
**نَجوع** ئاوی تێکەڵ کراو لەگەڵ ئاردا کە بۆ قەڵەو بون دەدرێ بە ئاژەڵ.
**نَجو** نهێنی نێوان دوو کەس.
**نَجوی** نهێنی.
**نَجوُء** پیاوێ زۆر چاوی پیس بێت.
●**نَجيَ ٨/هُ** ڕزگاری کرد.
**نَجِيّ** دۆستی گیانی بەگیانی.
**نَجیب** ڕەسەن، وشیار، جوانمەرد ونەجیب.
**نَجیث** نهێنی، نیشانەی وەستاو، سست لەکاردا.
**نَجیح** ژیرو دانا، ئارامگر.
**نَجید** ئازاو دلێر، شێری بێشە وجەنگەڵ.
**نَجیع** خوێنی ڕەشباو.
**نَحات** سروشت.

**نَحَّات** سەنگ تاش، پەیکەرتاش، سەنگ تەراش.

**نِحَاتَة** تراشکاری، پیشەی سەنگتراشی.

**نِحاز** بنەڕەت.

**نُحاز** نەخۆشیەکە توشی سییەکانی وشتر دەبێت.

**نَحّاس** مسگەر، مس فرۆش.

**نُحاس** مس، کانزایەکی زەردە.

**نِحاسَة** مسگەریی.

**نُحاط** پەنگ خواردنەوەی گریان لەسنگ وگەرودا.

**نَحّاط** لوت بەرزی خۆبەزلزان.

**نَحافَة** لاوازی.

**نَحّال** پەروەردەکەری هەنگ.

**نَحّام** پیاوی ڕژد، شێری بێشەوجەنگەڵ.

**نَحَبَ** دەنگی بەگریانەوە بەرزکردەوە.

**نَحْب** خەو، درێژی، گریانی بەکوڵ، کۆکە، مەرگ.

**نَحْت** سروشت.

●**نَحَتَ** ١/ه دای بەئەرزدا.

**نَحر** بەشی سەرەوەی سینگ، سەربڕین، قوربانیکردن.

**نِحْر** زیرەك، دانا.

●**نَحَرَ** ١/ه سەری بڕی.

**نِحرِير** زیرەك ودانا.

**نَحِزَ** کۆکی، کۆکەی کرد.

**نَحْس** بای سارد، خراپ وبەد.

**نَحَصَ** وشترەکە زۆر قەڵەو بوو بەجۆرێ قەڵەوێتی یەکەی ڕێگەی نەدا ئاوس بێت.

**نُحص** بنی کێو.

**نَحَضَ** گۆشتی لە ئێسقان کردەوە، کڕاندیەوە.

**نُحِضَ** گۆشتی پێوە نەما.

**نَحُضَ** گۆشتی زیاد بوو.

**نَحَطَ** نرکاندی لەتاو هیلاکی.

**نَحْط** پەنگ خواردنەوەی گریان لەسینگدا.

**نَحُفَ** لاواز وکەم گۆشت بوو.

**نَحَلَ** لەشی لاواز ولات بوو بەهۆی نەخۆشیەوە.

**نَحْل** هەنگ، مێشەنگوین.

●**نَحِلَ** ١/القاصرُ قصيدةً، هۆنراوەیەکیان دایە پاڵی کەلەڕاستیدا هینی ئەم نیە.

**نُحْلَة** لاوازیی.

**نِحْلَة** دیاری.

**نَحَمَ** ناڵەو ئاهی کێشا.

**نَحْمَة** کۆکە.

**نَحن** ئێمە، هێمە.

**نَحْـو** وەكـو، ڕێگـە، زانـستی، زماننـاسـی عەرەبی.
**نُحُول** سستی و لاوازی.
**نَحوِيّ** زانای زماننـاسی زمانی عەرەبی.
**نَحَى** لایدا، ڕای مالّی.
**نَحْي** تیرێکی پانە.
**نحيت** ناچیزە لەهەرشتیَ، بێگانە لە نـاو هۆزێکدا.
**نَحِير** سەربڕاو، کۆتاشەوی هەیڤ.
**نَحيرة** یەکەم ڕۆژی مانگ.
**نَحيزة** سروشت.
**نَحيف** لاواز وکەم گۆشت.
**نَحيم** قۆڕەی سك.
**نَحيّة** ئامانج، مەبەست.
**نَخَّ** بە توندی ڕۆشت.
**نَخّ** ڕاخەری درێژ.
**نخاب** پەردەی دلّ.
**نَخّاس** کۆیلە فرۆش، ئاژەلّ فرۆش.
**نَخَاسة** کۆیلە فرۆشتن، ئاژەلّ فرۆشتن.
**نُخاع** دڕکەپەتك، ڕەگێکی تایبەتـە لەناو بڕبڕەکانی گازەری پشتدا درێژدەبێتەوە.
**نُخاعة** چلّم، بلغەم.
**نِخاف** کەوش"خوف".
**نِخَال** جێگەیەك دارخورمای زۆر لێبێت، کەسێك ئارد ببێژێتەوە.
**نُخَالة** سۆسی ئارد.
**نُخامة** چلّم وبەلغەم یان هەرشتیَ مـرۆڤ لەسنگ ولوتیەوە بیکاتە دەرێ.
●**نَخا ۸/الرجل**: مەدح وستایشی کرد.
**نَخْبْ** ترسنۆك.
**نَخْبَة** ترسنۆك.
**نُخبة** بژاردە، هەلّ بژاردە.
**نَخِرَ** پوارتکا، خراپ بوو.
**نَخَّرَ** قسەی کرد.
**نَخِر** خراپ، پوارتکا.
**نُخِسَ** گۆشتی کەم بویەوە.
**نَخَشَ** بزواندی، هانیدا.
**نَخَطَ** چلّمی داکرد.
**نَخَلَ** ئاردی بێژایەوە.
**نَخْل** دارخورما.
**نَخَمَ** گۆرانی گوت، وازی کرد.
**نَخْمَة** چلّم، ئازایەتی.
**نَخوة** نازو لوت بەرزی.
**نُخَة** شەراب.
**نَخَّة** بارانی کەم.
**نَخيب** پیاوی ترسنۆك.
**نخيسَة** شیری بزن ومەڕ تێکەلّ کرابیَ، کەرێ.
**نَخِيلَـة** سروشـت، ئامۆژگاری پاکـتـەوبیَ گەرد.

**نَدّ** گردۆلکەی بەرز.

**نِدّ** هاوتا، هاوشان وهاووێنه.

**نَدئة** سورێتی هەور ساتیخۆر ئاوابوون یـان خـۆر هـەڵاتن، خەرمانـەی دەوری مانگ.

**نَـدّاف** زۆرخـۆر، شـیکەرەوەی لۆکـە، هەلاج.

**نَدامة** پەشیمانێتی.

**نَداوة** تەڕی وشێداریی.

**نِداء** بانگ، دەنگ، نزا.

●**نَدَأ ١/ه** ترساندی.

**نَدَبَ** بۆ مردوو گریا.

**نَدَبْ** ئاسەواری برین.

**نُدبَـة** لاواندنـەوەی مـردوو، ژمـاردنی چاکەکانی مردوو بەدەم گریانەوە.

**نَدْح** شتێ لەدوورەوە بەدی بکرێت.

**نَدْح، نُدْح** فراوانی، زۆری وزەوەندی.

**نَدَحَ** فراوانی کرد.

**نَدْر** دەگمەن.

●**نَدَرَ ١/الشيء** دەگمەن بویەوە.

**نُدْرة** دەگمەنێتی.

**نَدَس** زیرەکێتی.

**نَدْس** دەنگی کپ وشاردراوە، کەسێ خێرا گوێ بیستی دەنگی شاردراوە ونزم ببێت، گوێ سوك، زیرەك.

**نَدَش** بەدوی شتدا گەڕا.

**نَدَص** بەخێرایی چوە دەری.

**نُدْغَة** سپیایی بنی نینۆك.

**نَـدَف** خواردنەکـەی خـوارد، لۆکەکـەی شیکردەوە.

**نُدْفَة** شیرێکی کەم.

**نَدْل** پیسی.

**نَدِمَ** پەشیمان بویەوە.

**نَدْم** پیاوی زیرەك.

**نَدَم** شوێنەوار.

**نَدوة** کۆڕ.

**نَدَه** بەبانگ دەری کرد.

**نَدْهَة** دەنگ.

**نُدْهَة** زۆریی ئاژەڵ و وڵاخ

**نَدِیَ** تەڕبوو.

**نَدّى** تەڕی کرد.

**نَدَی** باران، گژوگیا، شەونم، بەز.

**نَدِيّ** تەڕو نمناك.

**نَدِيّ** پیاوی دەست گوشاد.

**ندیان** تەڕ، نمناك.

**ندید** هاوتا، هاوشان.

**ندیم** هاوەڵ، هاوڕێ، هاونشین.

**نَذالَة** نامەردیی، ڕەزالەت وبێ شەرمی.

**نَذَرَ** شتێکی لەسەر خۆی فەرزکرد، نەزری کرد.

**نَذْر** هەر شتێ کەسێ لەسەر خۆی فەرزی بکات بۆ ڕەزامەندی خودا.

**نُذْر** ترس وبیم.

**نَذُلَ** ناچیزەو کەم نرخ بوو.

**نَذْل** کەسێك لەئاینداریدا یاخود لەنەژادو ڕەچەڵەکیدا ناچیزە بێت.

**نَذیر** ترسێنەر، ئاگادارکەر، زڕەی کەوان، پێغەمبەر.

**نَرجِس** نێرگس، گوڵێکی بۆنخۆشی بەهاریە.

**نَزَّ** ئاسکەکە ڕایکرد، دورکەوتەوە.

**نَزَأَ** نێوانی خەڵکی تێکدا.

**نَزار** کەمی.

**نِزار** ئاکۆکی وکێبەرکێ.

**نِزاع** کێشەو ململانێ، ئاکۆکی.

**نُزّاع** ئامۆو هەژاران.

**نَزاعَة** دوژمنایەتی.

**نَزّاغ** ئەو کەسەی خراپە دەخاتە نێوان خەڵکەوەو بەینیان تێکدەدات.

**نَزّاك** زۆر عەیبدارکەر، کەسێك زۆر خەڵکی لەکەداربکات.

**نَزاهَة** پاکیزەیی، دووریی لەخراپەوە.

**نُزاء** جۆرێ نەخۆشی مەڕە.

**نَزَحَ** دورکەوتەوە، ئاوارە بوو.

**نُزُح** بیرە ئاوێك ئاوی کەم تیادا بێت یاخود تێیدا نەمابێت، بیری وشك.

**نَزَرَ** ئەوەی پێی بوو کەم کەم دەری هێنا، لەداواکردندا پێداگری کرد.

**نَزْر** کەمی بێ نرخ، کەم، وەرەمێکە لە گوانی وشتردا.

**نَزِرَة** ژنی کەم شیر یان کەم منداڵ.

**نَزِعَ** مووی قژی لەلای هەردوو قەنافسیەوە کەم بویەوەو هەڵوەری.

**نَزع** داماڵین، داماڵینی چەك، چەککردن.

●**نَزَعَ** ١/گەشتە حاڵی سەرە مەرگ. ٢/منه: لێیداماڵی.

**نَزعَة** ڕێگە لەشاخدا.

**نَزعَة** هەست، ئارەزوی لایەنگری کردن.

●**نَزَغَ** ١/ه: غەیبەتی کرد.

**نَزْغ** ئەو قسەیەی خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێت، دڵڕاوکەی شەیتان.

**نَزَفَ** ئاوی بیرەکەی هەموو دەرهێنا، خوێنی بەربوو.

**نُزِفَ** سەرخۆش بوو، ئەقڵی لەسەردا نەما.

**نُزْف** لاوازی وبێ هێزی بەهۆی خوێن بەربونەوە.

**نَزَقَ** غاریدا.

**نَزَق** همر جێگەیەکی نزیك.

●**نَـزَك** ١/ه عەیبداری کردو بەناهەق قسەی دەربارەکرد.

**نُزَك** عەیبدارکەر.

**نَزَل** دابەزی، لەهەمقی‌خۆی هاتەخواریْ.

**نُزُل** خواردنی بەبەرەکەت.

**نَزَل** باران، واران.

**نُـزْل** میوانخانـه، هـەر شـتێ بـۆ میـوان ئامادە بکریْ.

**نَزِ، نَزِير** بێ ئۆقرە، کەسێ لەجێیەکدا ئۆقرە نەگرێت، بێ تاب.

**نُـزوح** ئـاوارەبوون، دورکەوتنـەوە و وازهێنان لەنیشتمان.

**نَزُور** ژنی کەم شیر یان کەم مندالّ.

**نَـزوَة** کـورت، شـالاّوی ناگـەهانی، شەبەیخون.

**نَزَه** دورکەوتەوە لەخراپە.

**نَـزُهَ** پـاك و بێگـەرد بـوو، دورکەوتـەوە لەخراپە.

**نَزَه** دوور لەخراپەو گوناه.

**نُزَه** پاکدامێن.

**نُزهَة** پیاسەو گەشت.

**نَزِيَ** خوێنی لێ ڕۆشت

**نَزِيح** دوور

**نَزِير** کەم و بێ نەرزش.

**نَزِيلَة** هەور، دەمی تیژی تەور.

**نَزِيع** دوور، ئاوارە، بێگانە.

**نَزِيعَـــة** ژنێـــك لەناوخزمەکانیـــدا شوونەکات بەڵکو مێرد بەبێگانە بکات.

**نَزِيفَة** قسەو وشەی بەد.

**نَزِيـــف** خـــوێن بـــەربوون، مەســـت، سـەرخۆش، کەسـێك هێنـدە تینوبێـت زمانی وڕەگەکانی وشك بوبێتەوە.

**نَزِيل** میوان، خواردنی بەبەرەکەت.

**نَزِيه** پاکداوێن.

●**نَسَّ** ١/النَّخِيرُ نانەکە وشك بویەوە.

**نَـــسَّاب** پیـــاوی زۆر زاناڵەرەچـــەڵەك ناسیدا.

**نَسَابَة** خزمایەتی.

**نَسَّاج** درۆزن، کەسێك جلك یان درۆچنی بکات.

**نِساجَه** پیشەی چنین.

**نَسَّاسَة** ناوێکی مەککەی پیرۆزە.

**نَـسَّاف** باڵندەیەکـە دەنـوکێکی گـەورەی هەیـە زیادەیـەك لـە شـێوەی شـاخ بـە سەردەنوکیەوەیە.

**نِساء** ژنان.

**نَسَاء** درێژی تەمەن.

**نَسَّاء** کەسێ زۆر شتی لەبیربچێتەوە.

**نُسْأَة** دواخستن.

●**نَسَبَ ١/ه** باسی نەژادو ڕەچەڵەکی ئەوی کرد.

**نَسَب** نەژاد، خزمایەتی.

**نِسبَة** خزمایەتی، ڕێژە، وا بەستەگی نێوان شتان.

**نَسَجَ** چنی.

**نَسْج** ڕێژەی وردەی خورماو توێژاڵەکەی.

**نَسَخَ** پوچەڵی کردەوەو ڕایماڵی.

**نَسْخ** ڕونووس گرتنەوە، پوچەڵکردنەوە.

**نُسْخَة** ڕونووس.

**نَسْر** داڵ.

**نَسَّسَ** ولاخەکانی لێخوڕی.

**نَسَعَ** درێژبوویەوە.

**نِسع** جۆرە گوریسێکی پانە باری پێ دادەبەستن.

**نَسَغَ** غەیبەتی کرد، شیری تراوکرد.

●**نَسَّغَ ١/ت الشجرة** لە دوای بڕینی ڕوایەوە.

**نَسَفَ ١/**خاپووری کرد. **٢/الإناء:** دەفرەکە پڕ بوو لێی ڕژا.

**نَسَقَ** ڕێکی خست.

**نَسَق** هەر شتێ لەسەر یەک شێوازوسیستەم بێت، ڕەوش وشێواز.

**نُسك** خودا پەرستی، هەر هەرقێ هینی خودا بێت.

**نُسُك** قوربانی بۆ خودا، هەرچیەك بۆ پەرستش بەخودا ببەخشرێ، خودا پەرستی، خوێن.

**نَسَكَ** خودا پەرستی کرد.

**نَسْل** وەچە.

**نَسَل** ئەو ئاوە شیرباوەی لەهەنجیری سەوزی نەگەیوودێتەدەر.

**نَسَلَ** لەڕۆشتندا پەلەی کرد، منداڵی زۆربوو.

**نَسَمَ** با هەڵی کەند.

**نَسمَ** گۆڕا.

**نَسَّمَ** دەستی پێکرد.

**نَسَم** بۆنی شیرو ڕۆن، بای نەرم، بای شەماڵ.

**نَسَمَة** مرۆڤ، گیاندار، دانیشتوانی وڵات.

**نَسناس** هەوڵ وکۆشش ونارامگرێتی مرۆڤ، جۆرە مەیمونێکە.

**نِسناس** برسێتی زۆر توند.

**نُسُوع** درێژیی.

**نَسْوَة** ژەمێ شیر.

**نِسوة** ژنان.

●**نَسِيَ** لەبیریچوو، دەماری ڕانی هاتە ئێش.

**نسيئة** دواخستن.

**نَسيء** شیری تراو.

**نِسيان** لەبیرچوون.

**نَسيب** مێرووله گەر یەك بەدوای یەك بڕۆن، ڕێچکه مێرووله، ڕێگەی مێروولەومار.

**نَسيج** قوماشی چنراو.

**نَسيس** برسێتیەکی زۆر.

**نَسيسَة** قسه هێنان وبردن بۆ تێك دانی نێوانیخەڵك.

**نَسيف** قسەی پەنهانی.

**نَسيق** ڕێکوپێك، هەرشتێ لەسەریەك شێواز ڕێکخرابێت.

**نَسيك** زێڕ، زیو.

**نَسيل** هەنگوینێ جۆرابێتەوەوله شانه ومۆمەکەی جیابوبێتەوە، ڕینگاڵی هەنگوین.

**نَسيم** بای شەماڵ، بای نەرم.

**نَسي** لەبیرکراو، فەرامۆشکراو.

**نَشَّ** گۆشتەکە لەسەر ئاور جزەجزی کرد.

**نَشّ** نیوی هەرشتێ.

**نَشّاب** تیر.

**نَشّاب** تیر هاوێژ.

**نَشّاش** زەویەك ڕوەکی لێ نەڕوێت.

**نَشّاص** سوپا، هەورێ هەندێکی لە سەرهەندێکی تری بەرزوکەڵەکە بێت.

**نَشاط** چالاکی.

**نُشاعَة** هەر شتێ بەدەست بیبچڕیت وئینجا تورِی بدەیت.

**نُشافَة** هەر شتێ بەگەرمی لەمەنجەڵ دەربهێنرێت.

**نَشّال** گیرفان بڕ.

**نَشّاة** درەختی وشك.

**نَشاء** بۆنی خۆش.

**نَشَأَ** سەری هەڵدا، گەشەی کرد.

●**نَشَّأَ ٨/ه** پەروەردەی کرد.

**نَشْأة** هەر ڕوەکێك سەری لەزەویدەرهێنا بێت وهێشتەرناسك بێت، گەشەکردن، پێگەیشتن.

**نَشِبَ** هەڵواسرا، چەسپا، لکا، هەڵایسێنرا.

●**نَشَبَ ٨/ت الحرب** جەنگ هەڵایسا، بەرپابوو.

**نُشبَة** ناوێکی ڕەگەزی گورگه.

**نَشَجَ** مەنجەڵەکە کولاّو قوڵتەی لێوەهات.

**نَشَج** ڕێڕەوی ئاو.

●**نَشَدَ ٨/ه بالله** سوێندیدا بەخودا، داوای لێکرد سوێند بخوات بەخوا.

**نَشَد** ستایش ومەدح.

**نِشدَة** دەنگ.

**نَشْر** بڵاوكردنەوەو پەخش كردن، بۆنیخۆش، هۆزێكی پەرتەوازە كە سەرۆكێ نەبێ كۆیان بكاتەوە.

**نَشْرَة** پەخشنامە، پەڕەیەك شتێكی تیادا نوسرابێت وبەناو خەڵكیدا بڵاوكرابێتەوە وەكو ڕۆژنامە.

**نُشْرَة** نوشتە كەبۆ چاككردنەوەی نەخۆش یان شێت دەنوسرێت.

**نَشَزَ** بەرزبویەوە.

**نَشْز، نَشَز** جێگەو شوێنی بەرز.

**نَشَصَ** هەورەكە بەرزبویەوە.

● **نَشَّصَ ١/هـ:** بەرزی كردەوە.

**نَشَطَ** كوریسی گرێدا.

**نَشِطَ** چالاك بوو، چالاكی نواند.

**نَشَطَ** گەستی لەناكاو.

**نَشَغَ** گەشتە سەرە مەرگ وئینجا ڕزگاری بوو.

**نَشَغ** ئاوێ تامی خراو بوبێت.

**نَشَغَ** بەمشت ئاوی خواردەوە، ئاوەكە لە بەری ڕۆشت.

**نَشَفَ** هەڵیمژی، وشكی كردەوە.

**نَشَّفَ** بیرەكە لەناو برا، وشكی كرد.

**نَشِقَ** هەناسەی قوڵی هەڵمژی، بۆنی كرد.

**نَشَق** بۆنكردن.

**نَشَلَ** گۆشتی پێوە نەماولاواز بوو، دزیی.

**نَشَل** گۆشتی پوختەی بێ داوودەرمان.

**نَشِمَ** گایەكە خاڵی سپی ورەشی تێدا بوو، گایەكە بەڵەك بوو.

**نَشِم** گای بەڵەك.

**نَشْوان** سەرخۆش، مەست.

**نُشُور** ناوی ڕۆژی قیامەت.

**نَشُوع** ئەودەرمانەی دەكرێتە دەمی نەخۆشەوە.

**نَشْوَة** سەرەتای مەست بوون، بۆن.

**نَشِيَ** سەرخۆش بوو.

**نَشِيج** دەنگ.

**نَشِيد** بەرزكردنەوەی دەنگ، سرود.

**نَشِيط** چالاك، چاپوك.

**نَشِيل** ئاوێ تازە لە بیردەرهێنرابێ، شمشێری تەنك وسوك.

**نَشْيَة** بۆن.

**نَصَّ** بەرزی كردەوەودەری خست.

**نَصّ** تێكست، دەق، دەقی ئایەتەكانی قورئان.

**نِصاب** ئەسڵ وبنەڕەت، سەرەتای هەرشتێك، دەسكی چەقۆ، لەزمانی یاساییەكانیشدا بەوە دەگوترێت ژمارەی ئامادەبوانی كۆنگرەیەك یان نیو بێت

يان كەمێك لەنیو زیاتر بێت بۆ وەی شەرعیەتی یاسایی هەبێت.

**نَصّاب** كەسێك خۆی لەكارێ وەربدات كەداوای لێ نەكرابێ.

**نَصَبَ** داینا وسەقامگیری كرد.

**نَصِبَ** هیلاك بوو.

**نَصِب** نەخۆش، هیلاك.

**نَصَب** بەیداخی چەقێنراو، ڕەنج ونارەحەتی.

**نَصب** نیشانەی فەتحە لەڕێنوسی عەرەبیدا، بەلا.

**نُصب** پەیكەر، بت.

**نِصب** بەخت.

**نُصُب** نەخۆشی، بەلا.

**نَصَتَ** بێ دەنگ بوو، گوێی بۆقسەكانی وی ڕادێرا.

**نَصَحَ** ئامۆژگاری كرد.

**نُصح** ئامۆژگاریی.

**نَصَرَ** هاوكاری كرد، پشتگیری كرد.

**نَصر** سەركەوتن، كۆمەك وپشتگیریی، باران.

**نَصَعَ** پاڵفتەوخاوێن بوو.

**نَصع، نِصع، نُصع** هەرپێستە یان جلكێكی زۆرسپی.

**نِصَع** ڕاخەرێكە لەپێستە دروسكراوە لەبەرپێی كەسێكدا ڕادەخرێت كە فەرمانی سەربڕین یان ئەشكەنجەدانی توندی بەسەردا درابێت.

**نَصَفَ** گەشتە نیوە.

**نِصف** نیو، داد.

**نَصَف** پیاوی پەنجا ساڵە، ژنی چل وپێنج یان پەنجا ساڵە، كەسێ لەنیوەی تەمەنیدا بێت.

**نَصَلَ** دەرهات.

**نَصْل** شمشێر یان چەقۆی بێ دەسك، سەرە ئاسنەكەی تیرو ڕم.

**نَصو** ژانێكی سكە.

**نَصوح** ئامۆژگاری كەر، پاڵفتەو بێ خەوش.

**نَصّة** چۆلەكەی مێچكە، چۆلەكەی دایكانە.

**نَصیب** بەخت، بەش.

**نَصیحة** ئامۆژگاری، پەند.

**نَصیر** پشتیوان.

**نَصیّة** هەڵبژاردەی ناو خەڵك وناو وڵاخ

**نَضّ** كاری خراپ، درهەم ودینار.

**نَضْ** ئاوەكە كەم كەم ڕژا، باڵندەكە باڵی ڕاوەشاندوبزواند.

**نَضّاح** بارانی خوڕ وبەلێزمە.

**نُضار** زێڕ، ئاڵتون وزیو.
**نِضار** باشترین تەختە بۆ دروستکردنی دەفر.
**نَضارة** نەرمی، تەڕوتازەیی.
**نُضاض** هەڵبژاردەی کۆمەڵ.
**نُضاضَة** پاشماوەی ئاو، دوایەمین کوڕی پیاو.
**نِضال** کۆشش، خەبات.
**نُضاوة** بەو وردە خەنەیە دەگوترێت کەلەکاتی خەنە تێگرتنی ئەندامێکدا هەڵدەوەرێت.
**نَضَبَ** مرد، کۆچی دوایی کرد.
**نَضِجَ** پێگەیی، پێگەیشت.
**نُضج** پێگەیشتنی میوەوگۆشت، کامڵ بوونی ئەقڵ.
**نَضَحَ** ماڵی ئاو پرژێن کرد.
**نَضَح** حەوز.
**نَضَخَ** پرژاندی، ئاوەکە فوارەی کرد.
**نَضْخ** ئاسەواری بۆنی خۆش وعەترکە بەجلکەوە دەمێنێتەوە.
**نَضَدَ** کەل وپەلەکەی ڕێکوپێک کرد، شمەکەکانی ڕیزکرد.
**نَضَد** حوشتری قەڵەو، نوێن، هەوری کەڵەکەبوگ.
**نَضَرَ** تەڕوتازەبوو.
**نَضْر** زێڕوزیو.
**نِضْر** ژنی مێرد دار.
**نَضِر** زێباو تەڕو تازە.
**نَضَفَ** خزمەتی کرد.
**نَضِف** پیس وپۆخڵ.
**نَضِلَ** لاوازوهیلاك بوو.
**نِضو** تیرێك لەبەر زۆر تەقاندنی بەکەڵك نەمابێ، ئاژەڵی لاواز.
**نَضوح** جۆرێ بۆنی خۆشە.
**نَضِيّ** ئاژەڵی لاواز.
**نَضِيد** کەلوپەلی ڕیزکراو.
**نَضِيف** پیس، پۆخڵ.
**نَطَّ** درێژی کردەوە، بەستی وتوندی کرد.
**نِطارة** پاسەوانێتی باخو بێستان، باغەوانێتی.
**نِطاسِيّ، نَطَاسِيّ** پزیشکی زیرەك ودانا.
**نَطّاط** زۆر بێهودە گۆ، ئەو کەسەی پڕوپاگەندەی شتێ بۆ خۆی بکات کە تیادا نیە.
**نِطاب** سەر.
**نَطّاع** کەسێ زۆر بەقوڵی قسەبکات وزمانی بۆبخاتە ئاسمانەی دەمیەوە.
**نُطاعة** تیکەیەك نیوەی بخورێت ونیوەکەی دیکەی بخرێتەوە سەرسفرەکە.

**نُطافة** کەمێ ئاوی پاشماوەی ناو سەتڵ.
**نِطاق** پشتوێن، کەمەربەند، چوارچێوە.
**نِطاقَة** نامەو کاغەزی بچوکی نوسراو.
●**نَطَحَ ا/هـ** بەشاخ لێیدا، بەقۆچ لێیدا.
**نَطْحَة** یەکجارقۆچ وەشاندن.
**نَطَرَ** پاسەوانی باغوبێستانی کرد.
**نَطْس** داناوزانا.
**نُطُس** پزیشکانی داناوزیرەك(وشەکە جەمعە).
**نُطِعَ** رەنگی گۆڕا.
**نَطْع** ڕاخەرێکی چەرمینە لەبەرپێی کەسێکدا دادەخرێت کەفەرمانی سەربڕین یان ئەشکەنجە دانی بەسەردا درابێت.
**نَطَفَ** ئاوەکە کەم کەم لەبەری ڕۆشت، بە لەکەیەك عەیبدار بوو.
**نَطَفَ** عەیبداری کرد.
**نَطِف** پیس.
**نُطْفَة** ئاوی پیاو یان ژن، ئاوی پاکژ ئیدی زۆربێت یان کەم.
**نُطَفَة** مرواری ساف.
**نُطلاء** بەڵاوسەختی.
**نُطْل** توێکلی ترێ، شیری کەم.
**نَطَّلَ** بەئاوی گەرمی دەرماناوی شۆردی.
**نُطو** دووریی.
**نَطول** ئاوێ داودەرمانی تێدا بکوڵێنرێت وبکرێت بەسەرهەرئەندامێکدا کەتوشی نەخۆشی بوە.
**نَطِيّ** دوور.
**نِظار** فیراسەتوبیرتیژی.
**نَظّارة** چاویلکە، عەینەك.
**نَظافَة** پاکژیی، پاقژی، خاوێنی.
**نِظام** ڕەوشوشێواز، ڕژێم.
**نِظامِيّ** سوپای نیزامی، هەرشتێ بەگوێرەی ڕەوش ویاسابێت.
**نَظَر** بینایی.
**نَظَر** هاو وێنە، هاووەك.
**نَظْرَة** ڕەحمەتوبەزەیی، عەیبولەکە، یەکجار سەیرکردن، سەرنج.
**نَظِرَة** کەمتەرخەمی ودواخستن لەکاردا.
**نَظَرِيَّة** بیردۆز، تیۆر.
**نَظَري** تیۆریی.
**نَظُفَ** پاکەوەبوو.
**نَظَّفَ** پاکی کردەوە.
**نَظْم** هۆنراوە، ڕشتەی مرواری.
**نَظُورَة** دیدەوانوپێشەنگی لەشکر.
**نَظير** هاوتا، هاوشان.
**نَظيف** پاکژ، خاوێن، پاك.
**نَعّاب** بێچوی قەلەڕەشکە.
**نَعّابَة** حوشتری مێینەی تیژڕەو.

**نَقّار** یاخی، بولبولی زەرد.

**نَقّارة** ژنی دەم بەهاواری بێ ئابڕو

**نُعــــاس** ســــەرەتای خەولێکــــەوتن، خەوەنوچکە.

**نَعّاق** زۆرهاوارکەر.

**نَعّال** نەعل بەند.

**نَعامَة** وشترمر.

**نَعَــبَ** بانگوێژەکــە ملــی درێــژکردەوە وسەری لەقاند بۆبانگدان.

**نَعَتَ** وەسفی کرد.

**نَعت** وەسف، خەسڵەت.

**نَعْثَلَ** کۆی کردەوە.

**نَعْثَلْ** پیاوی پیری بێئەقڵ.

**نَعَج** سپی بێخەوش.

**نعجَة** مەڕ، مێ.

**نَعْــس** بــێڕەواجی بــازاڕ، ســستی وداهێزرانی لەش.

**نَعسان** خەوالۆو.

**نَعشَ** لەسەرداردەمەیت بەرزکرایەوە.

**نَعْش** مانەوە، داردەمەیت، تابوت.

●**نَعَشَ ١/هـ** بەرزی کردەوە.

**نَعَصَ** بزواندی.

**نَعفْ** جێگەی بەرز.

**نَعَفَة** پۆپەی کەڵەشێر، پۆپنە.

**نَعَقَ** قەلەڕەشکە قیڕاندی

**نَعلَ** نەعلی کردە پێ، کەوشی لەپێ کرد.

**نَعْل** نەعل، قۆندەرە، کەوش.

**نَعَمَ** ژیانی خۆش بوو.

●**نَعَّمَ ١/الشيءَ** شتەکەی نەرم کرد.

**نَعْم** خۆش گوزەرانی، نەرمیوناسکی.

**نَعَم** بەڵێ.

**نعمَة** شادومانی، ئاسودەگی، بەرەکەت.

**نعومَة** نەرمێتی.

**نَعي** هەواڵی مەرگیدا.

**نَعِيّ** هەواڵی مەرگ.

**نَعير** هاواروهەڵای شەڕ.

**نَعيــق** هــاواری شــوان لــە مێگەلەکــەی، قوولەی شوان.

**نَعيم** ماڵوسامان، خۆشگوزەرانی.

**نَغّاز** زۆر تێکدەری بەینی خەڵك.

**نَغّاش** زۆرکورتە باڵا، گرگن.

**نَغّاض** هەورێ یەك بەدوی یەکدا بجوڵێ، پیاوی ورگ پان.

**نُغَر** چاوگی ئاوی سوێر.

**نُغَر** بولبول، بەچکە چۆلەکە.

**نَغَّرَ** منداڵەکەی ختوکەدا.

**نَغَزَ** مندا لەکەی ختوکەدا

●**نَغَصَ ١/هـ** نەی هێڵائاوبخواتەوە.

**نَغَضَ** جوڵاولەرزی.

●**نَقَضَ ١/الشيءَ** جولاندی.
**نَغَلَ** بۆگەنی کرد.
**نَغِل** پێستەی بۆگەن کردوو لەدەباغیدا.
**نَقَلَة** قسەهێنان وبردن بۆتێکدانی نێوانی خەڵك.
**نَغْم، نَغَم** ئاوازی خۆش، گۆرانی، قسەی پەنامەکیوشاردراوە.
●**نَغَمَ ١/في الشراب** کەمی لێ خواردەوە.
**نُغوص** حوشتری مێینەی سەرکۆڵ زل، وشترێکی مێنگە کە قوچەکەکەی سەرپشتی گەورە بێت.
**نُغولة** حەرام زادەیی.
**نُغوم** ئاواز خۆش، دەنگ خۆش.
**نُغوَة** قسەی جوان.
**نغيل** منداڵێك زۆڵ بێت، زارۆیەك باوکی نەناسرێت.
**نُغيَة** قسەی جوان، سەرەتای هەواڵ کەهێشتر مرۆڤ لەراستی وناڕاستیەکەی دڵنیانیە.
**نَفَّ** تۆوی کردبەزەویەوە.
**نَفّاث** جادوکەر.
**نَفّاج** لاف لێدەر، خۆبەزلزان، شانازی کەر بەشتێکەوە کەلەخۆیدا نیە.
**نُفّاخة** بلقی سەرئاو.
**نَفاد** تەواو بوون.

**نَفّاذ** جێبەجێ کەری هەموو کاروبارەکانی.
**نُفارة** ئەوەی سەرکەوتوو لەژێرکەوتوی دەسێنێت.
**نِفاس** منداڵبوون، خوێنی منداڵ بوون، زەیستانی، زەیسانی.
**نَفّاش** نارنج، خۆبەزلزان.
**نُفاص** نەخۆشینێکی مەڕە.
**نِفاض** شەرواڵێکی منداڵانەیە.
**نَفّاط** دەرهێنەری نەوت.
**نَفاطة** ئەوجێیەی نەوتی لێیە.
**نَفاع** سود، کەڵك.
**نِفاق** دووڕویی.
**نُفاء** ناچیزە، بێنرخ، پاشماوە.
**نَفَثَ** تفی کرد، فوی کرد.
**نَفَث** تفی خەست.
**نُفُج** قورس.
**نَفَجَ** بایەکە بەتوندی هەڵی کرد.
**نَفَحَ** بۆنی گوڵاوەکە بڵاوبویەوە.
**نَفَخَ** فوی کرد.
**نَفْح** شانازی کردن، خۆبەزلزانین.
**نَفِدَ** تەواو بوو، کۆتایی هات.
**نَفَذَ** جێبەجێی کرد، ڕای پەڕاند.
**نَفَذ** جێبەجێکردن.

**نَفَــرْ** كۆمــەڵێ پیــاو لەســێ کەســەوە تاکودەکەس، کەس.

**نَفَرَ** دورکەوتەوە.

**نَفس** ڕۆح، خوێن، مەبەست.

**نَفَس** هەناسە، نەسیمی با.

**نُفسَة** موڵەت، دەرفەت.

**نَفَشَ** خوری شیکردەوە.

**نَفَــش** خــوریی شــیکراو، کەل‌وپــەلی شپرزوبلاوکراو.

**نَفِــشَ** حوشــتریان مەڕەکــە بەشــەودا بەبێ‌شوان لەوەڕا.

**نُفضَاء** لەرزوتا.

**نَفط** نەوت، نەفت، پترۆڵ.

**نُفطَة** کەسێك زوو توڕە ببێت.

**نَفع** سود، کەڵك.

●**نَفَعَ ٨/هـ** سودی پێ گەیاند.

**نَفعَة** کۆچان.

**نَفَق** تونێل.

**نَفَقَة** نەفەقە، خەرجی وبژێوی.

**نَفَلَ** سوێندی خوارد.

**نَفَلْ** دەست کەوت.

**نُفَل** شەوانی(٤و٥و٦)ی مانگ.

**نَفَــل** هــەرجۆرەکارێکی چــاك مــرۆڤ بیکاولەســەری فەرزنــەکرابێ، پەرســتــشی سوونەت.

**نُفُــوح** حوشــترێك بــەبێ دۆشــین شیرلەگوانی بێتەدەر.

**نُفُوذ** دەستەڵات، هەژموون.

**نُفُــور** بێــزاری، نــەفرەت، گــورێز، ڕۆژی سێیەمی جەژنی قوربان.

**نَفَهَ** ترسنۆك‌و بەددڵ بووە.

**نَفيَ** ئــەوپرزە ئاوانــەی کەبــەدەم هــەڵمی کوڵانی قابلەمەوە دێنەدەرێ.

**نَفى** نکولی کرد، نەرێی کرد.

**نَفــي** وەلامــی نــەرێ، ملەجــەڕێ، دورخستنەوە.

**نَفيذ** فەرمانی لەگوێگیراو وڕاپەڕێنراو.

**نَفير** هەستان‌وڕاپەڕینی خەڵکی بۆشەڕی دوژمنان، دەستە، شەیپور.

**نَفيس** گران بەها.

**نَفيش** شمەکی شپرز لەدەفردا.

**نَقّ** بۆقەکە قیڕاندی.

**نِقاب** پەچە، ڕوپۆشی ڕوخساری ژنان.

**نِقابَة** سەندیکا.

**نَقّاد** شوانی مەڕ.

**نَقّار** هەرکەسێك پیشەی هەڵکۆڵینی دارو بەردبێت.

**نَقّارَة** نەقارە.

**نُقــاز** نەخۆشــینێکی ئاژەڵانــەو لــەتاعون دەچێت.

**نَقاز** چۆلەکەی بچوك.

**نقاش** گفتوگۆ، دەمبەدمە.

**نَقّـــاع** کەســـێ زۆر پروپاگەنـــدە بـــۆ خەسڵەتانێ بکات کەلەخۆیدانین.

**نَقّاف** پیاگی خاوەن تەگبیروڕا.

**نقاف** پیاوی بەڕاوتەگبیر.

**نَقّـــال** گـــوازەرەوە، ئەوکەســـەی شـــتان دەگوازێتـــەوە لەجێیەکـــەوە بـــۆ جێیـــەکی تر، تەلەفۆنی باخەڵ، مۆبایل.

**نَقاوة** گیایەکە چلکی پـێ دەشـۆردرێت، پاڵفتەی هەرشتێ.

●**نَقا** ۸/ە: پاکی کردەوەوهەڵی بژارد.

**نقاة** هەڵبژاردەوپاڵفتەی هەرشتێ.

**نَقایَة** ئەوبەشەی خواردن کەتوڕدەدرێت وبەکەڵك نەماوە.

**نقاء** پاکیزەیی.

**نَقب** ڕێگە لەشاخدا.

**نَقَـــبَ** وەدوی هەواڵـــدا گـــەڕا یـــاخود هەواڵیدا.

**نُقبَة** ڕوخسار، ڕەنگ.

**نَقَـتَ** مـۆخی ئێـسقانی دەرهێنـا، قـسەی هاورد وبرد پێکرد.

**نَقْث** هێنان وبردنی قسە.

**نَقْد** ڕەخنە، پارەی کاش.

**نَقَد** جۆرەپەزێکی قاچ کورتە.

●**نَقَذَ** ۸/ە: دەربازو ڕزگاری کرد.

**نَقْذ** سەلامەتیوبێوەیی.

●**نَقَرَ** ۸/ە: لێیدا.

**نِقر** چاڵی بچوکی پشتی ناوکەخورما یان هەرناوکێکی تر.

**نَقر** توڕە.

**نَقْر** چەقەنە، دەنگی پل تەقاندن.

**نُقرة** پارچەی تواوەی زێڕوزیو.

**نُقز** بیر، چاڵەئاو.

**نَقز** لەقەم، نازناو.

**نَقَسَ** نێوانی خەڵکی تێکدا.

**نَقْـــش** شـــوێنەوار لەزەویـــدا، نـــەخش ونیگاری نەقشکراو لەسەرهەرشتێ.

**نَقَصَ** کەل بوو، لێی کەم بویەوە.

**نَقص** ناتەواوی.

**نُقـصان** کـەمی، ناوێکـە بـۆ ڕێـژەی کـەل بون وناتەواوێتی هەرشتێ.

**نَقَضَ** ڕوخاندی، هەڵی وەشاندەوە.

**نقض** بینای ڕوخاو.

**نَقَطَ** خاڵی لەسەر یان لەژێر پیتدا دانا.

**نُقطَـــة** خـــاڵ، نوختـــە، دڵۆپـــێ ئاویـــان خوێن.

**نَقَعَ** دەنگی بەرز کردەوە، جنێویدا.

**نَقـــع** جێگەیەکـــە لـــەنزیکی مەککـــەدا، تەپوتۆز، ئاوی گردەوە بوگ.

**نَقَفَ** جوجەڵەکە هێلکەکەی شکاندو لێی هاتەدەر، بەدوی شتدا گەڕا.

**نقف** جوجەڵەی بچکەڵە کاتێ لەهێلکە دێتە دەر.

**نَقَفَة** تەختاییەکی بەرتەسکە لەلوتکەی کێودا.

**نَقَلَ** گواستیەوە، نوسراوی وەرگێڕا، قسەی گێڕایەوە وگواستیەوە لەبوێژەکەیەوە.

**نَقَل** پەڕێ لەتیرێکەوە بگوازرێتەوە بۆ یەکێکی تر، دارو پەردوی خانوی ڕوخاو.

**نُقل** ڕێگەی کورت، کەوش، گواستنەوە، وێزانەوە، نقڵ.

**نقلَة** ژنێ لەبەر پیرێتی کەس مارەی نەکات.

● **نَقَمَ** ١/ تۆڵەی کردەوە، سزایدا. ٢/**الشيء** بەپەلە شتەکەی خوارد.

**نَقَم** ناوەڕاستی ڕێگە.

**نقمَة** تۆڵەو سزا.

**نقود** پارە، سکە.

**نَقُوق** هاوارکەر، بانگ کەر.

**نَقيّ** پاك، خاوێن، پاکژ.

**نقي** مۆخی ئێسقان، بەزی چاو لەقەڵەوێتیدا.

**نَقيب** ئەو ئەفسەرەی پلەی لەبەرامبەر (**کابتین**)دا بێت.

**نَقيذَة** ئەسپ وزرێ وهەر شتێکی تری ڕزگار کراو لەدەستی دوژمن.

**نقيص** ئاوی شیرین و سازگار.

**نَقيصة** عەیبەو کەم وکورتی، خوی بەد.

**نقيض** پێچەوانە.

**نقيع** هاوار.

**نقيف** گوژاڵکی لەتکراو.

**نَقيق** قیرەی قربۆق.

**نُقيّة** پەیف ووشە.

**نَكّات** زۆر تانەو تەشەر دەر لەخەڵك، نوکتەچی.

**نكاح** مارەکردن، مارە بڕین.

**نكارة** زیرەکی، نەفامی.

**نُكاف** نەخۆشیەکە توشی ملوقورگی وشتر دەبێت وزۆر کوشندەیە.

**نَكّال** سزا، هەر شتێ ببێتە هۆی ئەوەی کەسانی تر پەندی لێ وەربگرن.

**نَكب** بەلاَ وموسیبەت.

**نَكبَ** لەڕێگە لایدا.

**نُكبَ** توشی بەلاَبوو، توشی نسکۆ بوو.

**نَكبَة** بەلاَ ونارەحەتی، تەنگانە ونسکۆ.

**نُكبَة** بڕێ خواردن ڕێژەکەی دیاری نەکرابێ.

**نُكتة** خالی سپی لەڕوبەری ڕەشدا یان بەپێچەوانەوە، نوختە، خاڵ، پەڵە بەناوێنەوە، نوکتەوسوعبەتێ دلگوشاد بکات.

**نَکث** شکاندنی پەیمان.

**نَکح** عەورەتی ژن.

**نَکَحَ** مارەی کرد، مارەی بڕی.

**نَکد** پیاوی کەم خێر.

**نَکُرَ** ناڕەحەت و سەخت بوو.

●**نَکِرَ ١/الأمرَ** پێی ناشنانەبوو.

**نُکراء** خراپ وبەد، زیرەکی.

**نَکِرة** نەزانراو، ڕستەیەك بکەرەکەی دیارنەبێ.

**نِکز** بەتاڵ، پاشماوەی مۆخ لەناو ئێسقاندا.

●**نَکَزَ ١/هُ** لێیدا، پاڵی پێوە نا.

●**نَکَسَ ١/هُ** سەرەوخوار هەڵی گێڕایەوە، نگونساری کرد.

**نِکس** پیاوی ناچیزەی بێ خێر.

●**نَکَشَ ١/البئرَ** قوڕی نێو بیرەکەی دەرهێنا، بیرەکەی دەردا.

**نَکَصَ** گەڕایەوە سەر ئەو بارەی کەپێشتر تیایدا بوو.

**نَکَظَ** زۆری برسیی بوو.

**نَکَظ** کۆشش ورەنج، ناڕەحەتی سەفەر.

**نَکَع** ڕەنگی سوور.

**نَکَعَة** پیاوێ ڕەنگی سور بێت وتوێکڵی لوتی لەبەر سورێتیەکەی دابماڵرێت.

●**نَکَفَ ١/عن کذا** لێی دورکەوتەوە و وازی لێ هێنا.

**نَکْل** پیاوی بەهێز.

**نِکل** قەیدوبەندی سەخت وبەهێز، نیکڵ، کانزایەکی سپی جوانە.

**نَکِلَ** ترسا.

●**نَکَّلَ ١/بِهِ** کردیە پەند بۆخەڵکانی تر.

**نَکَهَ** بۆنی دەمی کرد.

**نَکیت** زەربە لێدراو.

**نَکیثة** سروشت، هێز، ئەوپەڕی کۆشش.

**نَکیر** هەر کارێکی قورس وزۆر ناڕەحەت.

**نَمّ** دەرکەوت، قسەی ڕازاندەوە بەدرۆ.

**نَما** گەشەی کرد، زیادی کرد.

**نَماص** دەزوی دەرزی، بەکرە.

**نُماص** هەیف، مانگ.

**نَمّال** زۆر قسە هێنەرو قسەبەر، زۆر قسە هەڵبەس.

**نَمّام** قسە هێنەرو قسەبەر، گیایەکی سەوزی بۆنخۆشە.

**نَمَرَ** سەرکەوت بەسەر شاخدا.

**نَمِرَ** تورە بوو ڕقی داهات.

**نَمْر، نِمْر** پلنگ.

**نَمَس** بۆنی ناخۆشی ڕۆن وشیر.

**نَمس** ڕۆنێ بۆنی ناخۆش بوبێت.

**نَمْش** قسەی ڕازاوە.

**نَمَّش** درۆی کرد، بەدرۆ قسەی ڕازاندەوە.

**نَمَسَ** هەڵی کەند.

**نَمَص** جوزی گیا

**نَمَط** شێواز.

**نَمْقَة** زۆرێتی ماڵ وسامان.

**نَمَقَ** نوسراوی نوسی.

**نَمُل** مێرووولە، مێرووچە، مێلورە.

**نَمْلَة** درز لەسمی ئاژەڵدا، یەك مێرووولە.

**نَمّ** قسە هێنەرو قسە بەر.

**نَمُوّ** گەشە.

**نَموذَج** نمونە.

**نموذِجي** نمونەیی.

**نَمی** گەشەی کرد، زیادی کرد.

**نَمیر** ئاوی پاکیزەو ڕۆشن.

**نمیمَة** هێنان وبردنی قسەوبردنی بۆ تێکدانی بەینی خەڵك، جوڵە، خشەی پێنوس لەکاتی نوسیندا.

**نَواجِذ** ددانی ئەقڵ گرتن.

**نُواس** تۆڕی جاڵجاڵۆکە.

**نَوَاسَة** فتیلە، چراوك.

**نَواصي** ئەشرافی خەڵك.

**نَواعِج** ژنانی سپی وسۆڵ.

**نَوال** بەخشش ودیاری، بەش، پاداشت.

**نَوّام** پیاوی خەواڵو.

**نَواة** تۆو.

**نَوْب** هێز، توانایی، نزیکی.

**نوبَة** بەڵاو ناڕەحەتی.

**نَوبَة** هەل، سەرە.

**نُوتيّ** کەشتیەوان، دەریاوان.

**نَوح** ژنانی شین و واوەیلاکەر.

**نُوح** ناوی پێغەمبەرێکە.

**نَوَّرَ** ڕوناك بویەوە

**نَور** گوڵ، گوڵی سپی.

**نُور** ڕوناکی.

**نُوريّ** وێنگەرد، درەخشان و تابان.

●**نَــوَسَ ١/بالمكـان**، تیایــدا مایــەوە ونیشتەجێ بوو.

**نَوْص** کەری کێوی.

**نُوص** ڕاکردن وهەڵاتن.

**نَوْض** دۆڵ، شیو، ڕێڕەوی ئاو.

**نَوَّطَ** هەڵی واسی.

**نَوط** هەر شتێ هەڵواسرابێت، مەدالیا.

**نَوْطَة** چیقڵدانی مریشك.

**نَوع** جۆر.

**نُوع** تینوێتی.
**نُوعَة** میوەی تەڕو تازە.
**نُوف** دەنگ، بەشی خوارەوەی کلك.
**نُوْفَل** دەریا، گەنجی جوان، پیاوی دەست گوشاد.
**نُوَق** سپییەك کەمێ سوری تێکەڵاو بێ.
**نُوقَة** دانایی لە هەموو شتێکدا.
**نُولَة** هەرشتێ مرۆڤ بەدەستی بێنێت.
**نُوم** نوستن، خەوتن.
●**نَوَّمَ ١/ه** خەواندی، خەوی لێخست.
**نُـون** نازنـاوی یـونس پێغەمبـەر، حـوت، شمشێر، پیتی نون.
●**نَوَّهَ ١/الشيءَ** بەرزی کردەوە. **٢/بفلان** ستایشی کرد، بەدەنگی بەرزبانگی کرد.
**نُوْه** تەواو بون لەهەر شتێ.
**نَوَى** دووریی، ئەو جێگەیـەی سـەفەرکەر مەبەستیەتی بۆی بچێ.
**نَوِيّ** ئەو هاوڕێیەی کە هەمان مەبەستی تۆی هەیە.
**نُوِيص** هێزو توانا.
**نَـوء** بـاران، بەخـشش، ئەسـتێرەی ڕوو لەئاوا بوون.
**نَـوّ** لای دەریاوانـان بـرێتیـە لەبەسـەختی هەڵکردنی باو شەپۆلی دەریا.
**نَهَا** ڕێگەی نەدا، نەهی کرد.

**نِهائِي** کۆتـایی، هـەر فـەرمان وقـسەیەك کەیەکلایی بێت ومشت ومڕو گۆڕانکـاری هەڵنەگرێ، دوابڕیار.
**نَهّاب** زۆر تالانکەر.
**نَهّات** پیاوی زۆر هاوار کەر، گوێ درێـژێ زۆر بسەرێنێ.
**نُهاد** برِو ئەندازە.
**نَهـار** ڕۆژ، لـەنێوانی خـۆر هـەڵاتن تـاکو ئاوابونی خۆر.
**نَهَـــارِيّ** خواردنـــێ لەســـەرەتای ڕۆژدا بخورێ.
**نَهّاش** گازگر.
**نِهاض** خێرایی.
**نَهّاض** مل، گەردن، بەرز.
**نَهّام** شێری بێشەو جەنگەڵ.
**نُهام** قەشە لەکڵێسادا.
**نُهامِيّ** قەشە، ڕێگەی ئاسان.
**نَهـــاوش** ســـتەمەکان، تەنگانـــەکانی مرۆڤ(وشەکە جەمعە).
**نِهايَة** کۆتایی هەرشتێ.
**نِهـاء** کۆتـایی ومەبەسـتی هـەر شـتێ، بەرزبونەوەی ڕۆژ وئاو.
**نُهاء** بەرزبونەوەی ئاو، ئەندازە.
**نَهْب** تالانکردن.
**نَهِبَ** تالانی کرد.

**نَهَجَ** مەسەلەكەی ڕونكردەوە، ڕێگەكەی گرت ولەسەری ڕۆشت.
**نَهج** ڕێگەی ئاشكرا، پەیڕەو، ناوی پەرتوكی دانراوی ئیمام عەلیە.
**نَهد** هەرشتێكی بەرز، مەمكی ئافرەت، شێری بێشەوجەنگەڵ.
**نَهَدَ** ئافرەتەكە مەمكی كرد.
**نَهد** ڕوبار، چۆم، ناوی لەبەر ڕۆشتوی فراوان.
**نَهَر** فراوانی، گوشادی.
**نَهْز** بڕو ئەندازە.
**نَهِز** شێری بێشەو جەنگەڵ.
●**نَهَزَ ١/ه** بزواندی.
**نُهْزَة** هەل، فرسەت، دەرفەت.
●**نَهَسَ ١/اللحمَ** بە ددانەكانی پێشەوەی گرتی، گازی لێگرت.
**نَهَشَ** گازی گرت.
●**نَهَضَ ١/**هەستا، ڕاپەڕی. **٢/فلاناً** ستەمی لێكرد.
**نَهضَة** تواناو هێز، هەستان وڕاپەڕین.
**نَهِلَ** وشترەكە تینوی بوو.
**نَهَل** ئەو بەشەی خواردن كەخوراوە.
**نَهِمَ** خواردنی زۆر بوو، ئارەزوی بۆ خواردن زۆر بوو.
**نَهِم** زۆرخۆر، سكڕاو.

**نَهوس** شێری بێشەوجەنگەڵ.
**نَهوك** ئازاو دلێر.
**نَهَی** ژیری، ئاوەز.
**نَهید** كەرەی چڕ، تۆپەڵە كەری.
**نَهیر** زۆر، فرە.
**نَهِیرة** وشترێ شیری زۆر بێ.
**نَهیس** كەم گۆشت ولاواز.
**نَهیك** پیاوی ئازاو دلێر، شمشێری بڕندە.
**نَهیم** نەرەی شێر، دەنگی فیل.
**نَهي** نەهی كردن، داوای وازهێنان لەكردنی هەركارێ.
**نِهَی** شوشە.
**نَيّ** بەز.
**نِیابَة** كاری نماینده، كاری ئەندامی پەرلەمان.
**نَیّاك** زۆر گانكەر.
**نَیَّبَ** گازی گرت.
**نِیر** كەناری ڕێ.
**نَیْرَجْ** پیاوێ قسە بهێنێ وببات بۆ تێكدانی بەینی خەڵك.
**نَیْزَك** ڕمی كورت، نەیزەك، ڕوناكیەكە لەشێوەی ڕمێكی تیژڕەو بەشەوانی ساماڵدا لەعاسماندا دەبینرێت.
**نَیْص** جوڵەیەكی لاواز.

**نَيْط** جەنازە، مەرگ.

**نَيّق** پیاوی خۆش خۆر وجلوبەرگ جوان.

**نِيْل** هەور، ڕوباری نیل.

**نَيل، نَيْلة** ئەو شتەی کەبەدەست دەهێنرێت، دەستکەوت.

**نِيْم** جلی خەوتن، نازو نیعمەتی تەواو، فەروە.

**نَيُوب** وشتری مێینەی پیر.

**نِيَّة** مەبەست، نیاز، نیەت.

**نِيء** گۆشتی کاڵ، گۆشتێ ئاگری بەر نەکەوتبێ یان پێ نەگەشتبێ.

**نَوْش** پیاوی بەهێز.

**واو** پیتی عەتفە.

**وئام** پێکەوە ژیان، پێکڤەگونجان.

**وئید** کیژی زیندە بەچاڵ کراو، دەنگ وسەدای توند، تەپەی هەر شتێ کە بکەوێتە سەر زەوی.

**وَئیَة** مرواری، وشتری ورگ زل.

**وائر** ترسناك.

**وَأَبَ** شەرمی کرد.

**وأب** کاسەی گەورە، سمی پێکەوەچەسپاو.

**وابط** سست،لاواز، ترسنۆك وبەددڵ.

**وابل** بارانی ڕەهێڵ.

**وابور** کەشتی بەهەڵم کارکردوو.

**واتد** سەقامگیر، چەسپاو.

**واتن** سەقامگیر، ئاوی مەنگ.

**واثق** دڵنیا، متمانەدار.

**واثن** سەقامگیر، بەرقەرار.

**واجب** پێویست، زەروری، کوژراو.

**واجز** قسەیەك کورت بێت وخێرا مرۆڤ لێی حاڵی ببێت.

**واجس** ئەندێشە، خەیاڵ.

**واجف** هەرشتێکی لەرزاو وشڵەژاو.

**واجم** کەسێك بەهۆی خەفەت ودڵتەنگی زۆرەوە ڕوخساری تێك چوبێت.

**واجَهَ** دیدارو گفتوگۆی کرد، ڕو بەڕوبوو، بەرانبەر بوویەوە.

**واجهة** ڕوی پێشەوەی هەرشتێ.

**واجن** زەوی ڕەقی بەردەڵان.

**واحد** یەك، یەکتا، بێ هاوتا، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە.

**واحف** باڵێ پەڕی زۆر پێوە بێت.

**واحة** زەوی سەوزە زار، زەنوێر.

**وَأج** برسێتی یەکی زۆربرسێتی سەخت.

●**وَأَدَ ٨/البنت**: شاردیەوە لەخۆڵدا بەزیندویی، زیندە بەچاڵی کرد.

**وَأد** دەنگی گەورەی وەك دەنگی ڕوخانی دیوار، زیندەبەچاڵکردن.

**وادق** هەرشتێکی تیژ شمشێربێت یان هەرشتێکی تر.

**وادي** شیو، دۆڵ، نێوانی دوکێو، شێواز، ڕێباز، جۆری قسە.

●**وَأَرَ ٨/الرجل**: ترساندی.

**وارث** میراتگر، میراتبەر.

**وارد** ئازاو چاونەترس، ڕێگەقزی درێژوخاو.

**واردة** ئاوەردە.

**وارس** هەرجلکێکی ڕەنگ سور.

**وارق** درەختی گەڵادار.

**وارك** ئاوزەنگی.

**وارِم** باكردوو، ئاوساوهەڵاوساو.

**وارِه** فراوان، پان.

**وارِي** ئاگردان، پیوی قەڵەو، بەزی قەڵەو.

●**وازى ١/هـ** روبەروی بویەوە.

**وازِع** سالاری سوپا، بەڕێوە بەری کاروباری لەشکر، سەگ.

●**وازَقَ ١/القوم** لەیەك نزیك کەوتنەوە.

**وازِن** کێش دار.

●**وازَنَ ١/هـ** دەست خۆشی لێکرد لەسەرکارەکانی. ٢/ **بين الشيئين** سەرنجیدان کامیان کێشیان زیاترە.

**واسِط** درگا، کەسێك لەناوەڕاستی کۆمەڵێکدا دانیشتبێت.

**واسِطَة** واسیتە، میانگیری کەر، هۆکارو وەسیلە.

**واسِع** فراوان،پان، ناوێکە لەناوە جوانەکانی خوای گەورە.

**واسِل** کەسێك کارێکی کردبێت پێی نزیك کەوتبێتەوە لەخوای گەورە.

**واسِلة** پلە، نمرە، هەرشتێك بەهۆیەوە لەکەسێکی ترنزیك بکەوێتەوە، وەسیلە وهۆکار.

●**واسَمَ ١/هـ** لەخۆشرویدا لەگەڵیدا بەرانبەرکێی کرد.

**واشِ** قسە هەڵبەست، بەدگۆ، کەسێك قسەبهێنێ وقسە ببات.

**واشِج** تێکەڵ وبەنێو یەکداچوگ.

**واشِجَة** نزیکی وخزمایەتی، پەیوەست بەیەکەوە.

**واشَكَ** لەڕۆشتندا خێراو پەلەی کرد.

●**واشِل ١/** ئاوێك لەکێوەوە بدڵۆپێت. ٢/**الحظ** بێ بەخت، بێ شانس، کلۆڵ.

**واشِي** کەسێك کوڕو ولاخی زۆر بێت، بەڵەکی دەست وپێی ئەسپ.

**واصِب** بەردەوام، هەمیشەیی ئارامگر.

**واصِبَة** بیابان ودەشتی دورو درێژ کە مرۆڤ وازبێنێت کۆتایی نایەت لەبەر دورو درێژیەکەی.

●**واصَفَ ١/هـ** شتێکی پێ فرۆشت بەوەسف بۆ کردن بێ ئەوەی کڕیارەکە شتەکە ببینێت.

●**واصَلَ ١/الشيء** یەکبینە وبێ بچڕان بەردەوامی پێدا، بەردەوام بوو لەسەری وتیایدا.

**واصِل** گەیەنەر.

**واضِح** ئاشکرا، ڕون، بێ پەردەبێ تەموموژ، وشترێ سپی بێت بەڵام سپیەتیەکەی زۆر نەبێت.

**واضِحَة** ئەوددانانەی کەلەکاتی پێکەنیندا دەردەکەون.

●**واضَعَ ١/هـ** گرەوی لەگەڵدا کرد.

**واضِع** دانەر، ژنێك پەچەو خوماری بەسەرەوە نەبێت.

**واضِعَة** مێرگوزار.

**واضي** پاکژوجوان.

**واطِئَة** خورمای وەریوی لەسەر ئەرزو بەرپێدا کەوتوو.

**واطي** نزم، ناچیزە.

**واظِب** بەردەوام لەسەر کار، بەکەسێك دەووترێت لەسەر کارو فرمان بەردەوام بێت.

**واعِ** بەئاگا، وشیار، هۆشیار.

●**واعَدَ ١/هـ** بەڵێن و پەیمانیان بەیەکتریدا.

**واعِر** نارەحمەت، دژوار.

●**واعَسَ ١/ت الابل** وشترەکە لەڕۆشتندا ملی درێژو قوت وهەنگاوەکانی فراوان کرد.

**واعِظ** ئامۆژگاریکەر، کەسێك ئامۆژگاری و وەعزی خەڵك بکات.

**وافِد** وشتری پێشڕەو، وشترێ پێشی وشترەکانی ترکەوتبێت.

**وافِر** زۆر، زۆر و زەوەند.

**وافَقَ** قایل بوو، ڕەزامەندی نیشاندا.

**وافي** تەواو، لای هۆزانڤانان بەو کۆپلە هەڵبەستە دەگوترێت کەتەواو بێت وواتاکەی ئاشکراوبێ.

**واقِ** ئەسپێك بەهۆی ئازارێ لەسمیدا نەتوانێت بڕوات یان بەهۆی ئەو ئازارەوە کەلەسمیدایە لەڕێ ڕۆشتن بترسێت.

**واقِع** ڕوداو، واقیع، بوبەر.

●**واقَعَ ١/هـ** شەڕی لەگەڵدا کرد، لەتەکیا جەنگا.

**واقِعَة** بەلاًپێشهاتی خراپ، قیامەت.

**واقِعي** پەیڕەو کەری ڕێبازی واقیعیەت، ڕاستەقینەو واقعی.

**واقِف** وەستاو، ڕاوەستاو، لەسەرپێ وەستاو.

**واقِ، وقى** نیگابان.

**واقِه** فەرمانبەر، خزمەتگوزاری کلێسا.

**واقي** بەربەست وپارێزگاری کار، ڕێگر، قەلەرەشکە.

**واکا** دەستی لەکاتی نزاکردندا درێژو بڵند کرد.

**واکِر** باڵندەیە کەهاتبێتە ناوهێلانەکەیەوە.

**واکِف** بارانی ڕەهێڵ یان نەمەباران.

**واكِل** ئەسپێك لەكاتی ڕۆشتنندا پێویستی بەتێكوتین و لێدان هەبێت.

**واكِن** دانیشتوو.

●**وَألَ** ٨/**اليه**: پەنای بردەبەری.

**وَأل** پەناگا.

**والِ** ئوستاندار، والی، پارێزگارو دەستەڵاتداری هەرویلایەت و پارێزگایان وهەرێمێك.

**والِبَة** منداڵ و وەچە.

**والِجَة** دەردوزانی ناوسك یان جۆرە ئازارێكی سەختە.

**والِد** باوك.

**والِدَة** دایك.

**والِع** زۆر درۆزن.

●**والَفَ** ٨/**ە**: ئولفەتی لەگەڵدا كرت.

**والِه** كەسێك بەهۆی خەفەتەوە وای لێهاتبێت كەخەریك بێت ئاوەزی لەسەردا نەمێنێت، شەیدا.

**وَألَة** كۆبوەوەی پشقڵی وشترو مەڕ.

●**والى** ٨/یارمەتی وكۆمەك وپشتگیری كرد. ٢/**القدم**: هەندێكی جیا كردەوە لەهەندێكی تری.

**وَأمَ** ڕەزامەندی نیشاندا، قایل بوو.

**وَأم** خانوی گەرم، خانەو لانەی گەرم وكوڕ.

**وامِئَة** بەڵاو سەختی.

●**وامَقَ** ٨/**ە**: یەكتری یان خۆش ویست.

**وان** لاواز، سست.

**وانِي** كەسێك لەشی لاوازبێت.

**واهِ** سست، پوچ، ئەفسوس.

**واهِب** بەخشندە.

**واهِمَة** هێزی وەهم.

**واهِن** لاواز، سست.

**واهِنَة** لاوازی، بڕبڕەیەكە لەبڕبڕەكانی پشت.

**وَأي** گومان، وەهم، بەڵێن.

**وَأيَة** قازان وقابلەمەی فراوان، كاسەی فراوان.

**وَبّ** ئامادەبوو بۆ هێرشكردن لەجەنگدا.

**وَبَأ** پەتا، هەرنەخۆشینێكی درم وكشتگیر.

**وبائي** نەخۆشینی بەربلاو، پەتا.

**وبّاص** مانگ، هەیف، هەرشتێ ڕەنگی بریكەداربێت.

**وباط** سستی ولاوازی.

**وبَال** سەختی وتەنگانە، خراپی چارەنوس وناقیبەت.

●**وبَتَ** ٨/**بالمكان**: تیایدا نیشتەجێ بوو مایەوە.

وَبِدَ حالی تێك چوو پارەو سامانی كەم بویەوە.
وَبِد برسی.
وَبَد بەدحالْ وخراپ گوزەرانی.
وَبْد چالْ لەشاخدا.
●وَبَرَ ١/بالمكان: تیایدا مایەوە.
وَبِرَ پەشمی زۆر بوو،خوری زۆر بوو.
وَبَـــر پەشـــم وخـــوری وتـــوكی وشـــترو كەروێشك.
وَبِر وشترو كەروێشكی توكن وپرپەشم.
●وَبِـــشَ ١/الظفـــر: خـــالی ســـپی تیـــادا دەركەوت، نیتكەی سپی تیادا دەركەوت.
وَبْش،وَبَـــش نیتكـــەی ســـپی لەســـەر نینۆكدا.
●وَبَشَ ١/الكلام: قسەی قۆرو ناشیرین.
وَبَص بریكەی دایەوە، بریقەیدایەوە.
●وَبَـطَ ١/المرح: كردیـەوە، برینەكـەی كردەوە.
وَبِطَ سست ولاواز بوو.
وَبُطَ ترسنۆك ولاواز بوو، ڕێزی نەبوو.
وَبِقَ تیاچوو، لەناوچوو.
●وَبَـلَ ١/فلانـا: بەگۆچـان یـەك لـەدوای یـەك پیایـدا كێشا. ٢/ت السماء: بـارانی ڕەهێڵی داكرد.
وَبْل بارانی ڕەهێڵ، وارانی خوڕ.

وبیلَة عاسای قەوی، بەستەیەك دار.
وَتَـــح، وَتِـــح كـــەمی بـــێ نـــەرزش، هەرشتێكی كەمی بێ بابەخ ونرخ.
وَتَدْ مێخی دەوارو چادر، مێخ.
●وَتَـدَ ١/الوتـد: سـەقامگیرو تونـدوتۆڵ بـــوو. ٢/القـــوس: ژێـــی بەســـت بەكەوانەكەوە. ٣/فلانا: ترساندی.
وَتَر ژێی كەوان.
وِتْر،وَتْر تۆڵە كردنەوە یان ستەمكردن لەتۆڵە كردنـەوەدا، تـاك، تـەنها، ڕكاتێـك نوێژ لەدوا ساتەكانی شەودا.
وَتْش كەم لەهەرشتێك.
وَتِـــغَ گونـــاهی كـــرد، كـــەم فـــام بـــوو لەقسەكردندا.
●وَتَنَ ١/الماء: بەردەوام بـوو بچڕانی تـێ نەكەوت.
وُتِنَ ڕەگی دڵی ژانی كرد.
وَتِین شاڕەگی خوێنبەری دڵ.
وِثــاب نــوێن، جێگــەی لەســەر نوســتن، جێگـــەی لەســـەر دانیـــشتن، تـــەخت وكورسی.
وَثـــاق، وِثـــاق كـــوریس یـــان هەرشـــتێ كەشـــتی پـــێ شـــەتەك وقـــایم و بەنـــد بكرێت.
وِئـام سازكاریی، هەماهەنگی.

**وَثَبَ** راپەڕی وهەستایە سەرپێ، بازی هەڵدا.

●**وثَّبَ ١/ه:** لەسەر نوێن یان جێگەی دانیشتن دای نیشاند.

●**وَثَجَ ١/الفرس:** گۆشتی زۆری گرت وقەڵەو بوو. **٢/المكان:** گژوگیای تێدا زۆر بوو.

**وِثْر** نوێنی نەرم ونۆڵ.

●**وَثَرَ ١/الفراش:** پایماڵ ونەرم ونۆڵی کرد.

**وَثْر** نەرم.

**وَثْفَة** بارانی کەم.

**وَثِقَ** متمانەی کرد، بڕوای کردو دڵنیا بوو.

●**وَثَّقَ ١/بفلان:** بڕوای پێکرد، متمانەی پێکرد.

**وَثَلَ** ماڵ وسامانی کردەوە.

**وَثَمَ** شتێکی شکاندو وردی کرد.

**وَثَنَ** بەردەوام بوو لەسەر پەیمان وبەڵێن.

**وَثَن** بت، خودای لەدارو بەرد وخورما وکانزا دروستکراوی نەفامەکان.

**وَثَنِيّ** بت پەرست، کەسێك بڕوای بە خودایەکی دروستکراو هەبێت.

**وُثوق** توندو تۆڵی ومتمانەکردن.

**وَثِيج** چڕوپڕ.

**وَثِيجَة** جێگەی پڕ لەدرەخت.

**وَثِير** نوێنی نەرمونۆڵ.

**وَثِيرة** ژنی گۆشتن.

**وَثِيفَة** گژوگیای پێکداچووی هەمەچەشن، بارانی کەم.

**وَثِيق** توندوتۆڵ.

**وَثِيقَة** بڕوانامە، پڕۆتۆکۆل، توندو تۆڵی لەکاردا.

**وَثِيمة** بەرد، بەردی چەرخ.

**وَجَّ** خێراو پەلەپەلی کرد.

**وَحَّ** پەلەکردن، وشترمر.

**وجاء** هەرشتێکی بێ خێر وەك بیری بێ ئاو.

**وجَاب** ترسنۆك.

**وجَابَة** ترسنۆکی.

**وَجاح،وِجاح** پەردە.

**وَجّاد** کەسێك ڕق وتوڕەیی زۆر بێت.

**وَجار** کونە کەمتیار.

**وجازة،وجز** قسەی کورت وپوخت.

**وَجَاق** ئاگردان.

**وَجَاهَة** پلەو پایە مەقام.

●**وَجَبَ ١/الرجل:** کەوت ومرد. **٢/ت الشمس:** ئاوابوو.

**وَجُبَ** ترسنۆك بوو.

**وَجْــبَ** یــەك ژەم نــانی خــوارد لــەڕۆژو شەوێكدا.
**وجبة** ژەم، یەك ژەم نان خواردن.
**وَجَحَ** ئاشكرابوو.
**وَجَح** غار، شكەفت، ئەشكەوت، كەورگ.
**وُجِدَ** هێنرایە بوون، لەنەبونەوە هێنرایە بون.
**وَجَدَ** دۆزیەوە.
**وُجْــد** دەوڵەمەنــدێتی، دڵخۆشــیی، توانادارِیی.
**وَجِدَة** توانادارِیی، دەوڵەمەندیی.
**وَجــذ** چــاڵ لەشــاخدا كــەئاوی تیــادا كۆبێتەوە وگل بخواتەوە.
**وَجِرَ** ترسا.
**وَجْــر** هەرشتێ وەكو ئەشكەوت وابێت لەشاخدا.
●**وَجَرَ ۸/ە**: قسەیەكی دابەگەنێدا كەئەو پێی خۆش نەبوو.
●**وَجَزَ ۸/الكلام**: كورت وپوختی كردەوە.
**وَجْــز** قــسەی پوخــت وكــورت، پیــاوی بەپەلە وخێرا لەبەخشین وجموجوڵدا.
**وَجَسَ** ترسـالەوەی كەبیـستی یـان چـوە دڵیەوە.
**وَجْــس** تــرس وبــیم، دەنگــی نــزم وپەنامەكی.
**وَجَعَ** نەخۆش كەوت وئازاری چەشت.
**وَجَع** ئازارو ژان، نەخۆشین.
●**وَجَفَ ۸/الشيء**: شلەژا.
**وَجَل** ترس.
**وَجِلَ** ترسا یاخود هەستی بە ترس كرد.
**وَجِل** ترسیاو، ترساو، كەسێك لـە شـتێك ترسا بێت.
**وَجَمَ** بێدەنگ بوو نـەیتوانی قسان بكات بــە هــۆی تــرس یــان قینــی زۆرەوەدەموچــاوی تێكــچوو بــەهۆی دڵتەنگی زۆرەوە.
**وَجَم** نێرەیی بەر، ناچیزە، بەغیلّ.
**وَجِم** كەسێك بەهۆی دڵتەنگی وخەفەتی زۆرەوە ڕوخساری تێكچوبێت.
**وَجْمَة** یەك ژەم.
●**وَجَّنَ ۸/الجلد**: لێیداو شێلای بۆ ئـەوەی نەرم بێت.
**وَجْن، وَجَنْ** زەوی ڕەقەلانی بەردەلان.
**وجود** بوون، پێچەوانەی نەبوون.
**وجودیّــــة** ڕێبــــازی هەبونایــــەتی (ئەگزیستانــــــسیالیزم) لــــــەفیكرو فەلسەفەدا، بونگەرایی.
**وجُور** دەرمانێك بكرێتە دەمەوە.
**وجُوم** دڵتەنگی و خەفەت.

**وَجْـه** ڕوخساری مـرۆڤ نیـەت و نیـاز، مەبەسـت، کـەمێك ئـاو، جـۆرو بـەش، سـەرەتای ڕۆژگـار، ڕەزامەنـدی، قایلمەندی.

**وَجِه** خاوەن پلەو پایە.

●**وَجَّهَ** ١/ئاراستەی کرد. ٢/**البیت**: ڕوی ماڵەکەی کردە قیبلە. ٣/**لعهده**: پێی گوت تۆ لەدوای مردنم ئازادیت.

●**وجهَـة** ١/**النظر**: دیـد و بۆچوون، ڕاو بۆچوون.

●**وَجَی** ١/**الرَجُل**: سەرنجیدا هیـچ سودو کەڵکێکی تێدا نیە.

**وَجِي** پیاوێـك یـان کەسێك هیـچ سود و کەڵکێکی تێدا نەبێت.

**وَجِیذ** زەوی تەخت.

**وَجِیز** کورت و پوخت.

**وَجِیع** ئازار بەخش.

**وَجِیل** چاڵێك ئاو تێیدا گل بخواتەوە.

**وَجِیم** ڕۆژی زۆر گەرم.

**وَجِیه** بەڕێز و پایەدار، دەمڕاستی هۆز.

●**وَحَّـدَ** ١/ تـاکی کـردەوە. ٢/**الله تعالی**: خـودای بـەتاك وتـەنها زانـی، بـڕوای بەتـەنهایی خـودا هێنـا، گـوتی خـودا تاکوتەنهایە یاخود واژەی (**لا اله الا الله**)ی گوت.

**وَحْد** تەنها، تاك.

**وَحدانِيّ** تەنها، تاك.

**وَحدانِیّة** حاڵەتی تەنهایی، تاك بوون.

**وَحْدَة** یەکە، یەکتایی.

**وَحِرَ** بەهۆی خواردنی پۆخڵەوە ژەهراوی بوو.

**وَحْر** کینە، توند ترین تووڕەیی.

**وَحَر** کینە، قین.

**وَحِر** تووڕە، قین هەستاو.

**وَحَـرَة** ژنـی کورتـە بـاڵا یـاخود وشـتری کورت، جانەوەرێکی ژەهراویە.

**وَحْشَة** ترس و خەم، دڵتەنگی، تەنهایی.

**وَحش** دڕندە، ئاژەڵی کێوی.

●**وَحَـفَ** ١/ نزیـك کەوتـەوە. ٢/**الرَجُل**: دانیشت.

**وَحْف،واحِف** باڵی پڕ لە پەڕی باڵندە.

**وَحَفَ** پەلەی کرد، خێرای کرد.

**وَحِفَ** چڕبوو.

**وَحْفَة** دەنگ، سەدا.

**وَحَل** قوڕاو.

**وَحَم** بێزوو، ژن کاتێك منداڵی دەکەوێتە سـکەوە حـەزی زۆری دەچـێتە سـەر هەنـدێك خـۆراك و بـەو حاڵەتـەی ژن دەگوترێت بێزوو.

●**وَحِمَ** ١/**الشيءَ**: ئارەزووی کرد، حەزی چووە سەری. ٢/**تِ المرأةُ**: دەستی کرد بە بێزووکردن.

**وَحمَی** ژنی بێزووکەر.

●**وَحَی** ١/**الی فلانٍ**: نیگای پێدا، پەیغامی بۆ نارد. ٢/**الذبیحةَ**: بەپەلە سەری بڕی.

**وَحَی** دەنگ، ئاگر، پەلە، پەلەکردن، پادشا.

**وَحْي** نیگا، سروش، پەیام و نوسراو، پەیغامی خودا بۆ سەر پەیامبەرانی.

**وَحِید** تەنها، تاك، کەنارگیر، گۆشەنشین،نامۆ و بێکەس.

**وَخّاط** وشتری تیژ ڕەو.

●**وَخَزَ** ١/**هُ**: دەرزی ئاژنی کرد.

**وَخُشَ** بێ نرخ بوو، نرخ و بەهای نەما.

**وَخَّشَ** دیاری و بەخشینی کەم کردەوە.

**وَخْش** ناچیزەو بێ نرخ لەهەر شتێ.

**وَخَصَ** جموجوڵی کرد.

**وَخَطَ** لەکڕین و فرۆشتندا جارێك قازانجی کرد وجارێك زەرەری کرد.

●**وَخَفَ** ١/**الرَّجُلَ**: بەخراپ باسی کرد.

**وَخَم** حاڵەتی تەمبەڵی وخەواڵوێتی وحەزکردن لەنوستن.

**وَخَي** مەبەست ونیاز، ڕێگەیەك گیرابێتەبەر.

●**وَدَّ** ١/**هُ**: خۆشی ویست، خۆشەویستی بۆ دەربڕی.

**وُدّ** خۆشەویستی، خۆش ویستن.

**وِداج** ڕەگی لامل کەلەکاتی تورەبوندا هەڵدەئاوسێت.

**وِدَاس** گژوگیایەك ڕوپۆشی زەوی کردبێت.

**وَداع** خواحافیزی و ماڵئاوایی.

**وُداف** ئالەتی نێرینە، کێر.

**وَدّاك** چەوری فرۆش، فرۆشیاری بەزە وچەوری گۆشت بەتایبەت.

●**وَدَأَ** ١/**بِالقوم**: خراپە و زیانی پێ گەیاندن.

**وَدَأ** تیاچوون، لەناوچوون.

**وَدَب** بەد گوزەرانی، خراپی حاڵ و گوزەران.

●**وَدَجَ** ١/**الدابّةَ**: ڕەگی لاملی ئاژەڵەکەی بڕی.

**وَدَج** شاڕەگی گەردن، ئەو ڕەگەی لامل کە لەکاتی سەربڕینی ئاژەڵدا دەبڕدرێت و ئیتر ئاژەڵەکە گیانی تێدا نامێنێت.

**وَدَر** مەست بوو تا ڕادەیەك خەریك بوو لەهۆش بچێت.

●**وَدَسَ** ١/**بالشيء**: شاردیەوە.

**وَدَس** عەیبە و ناتەواوی.

●**وَدَعَ ١/الشيء:** وازی لێهێنا، دەستی لێ هەڵگرت. ٢/**مالا عنده:** ماڵی پێ سپارد.
**وَدْع** قەور، قەبر، گۆڕ.
**وَدفَة، وَديفَة** باخچە و مێرگوزاری سەوز.
●**وَدَفَ ١/الشحم:** بەزمکەتوایەوە، پیومکە توایەوە.
**وَدْق** باران، واران.
●**وَدَقَ ١/اليه:** نزیك کەوتەوە لێی.
**وَدْقَة** خاڵی سور کەلەناوچاودا دەردەکەوێت،نیتکەی سوری ناوچاو.
**وَدَك** چەوریی گۆشت وبەز.
**وَدك** چەورو قەڵەو.
●**وَدَنَ ١/الشيء:** کورتی کردەوە،تەڕی کرد.
●**وَدَّنَ ٢/الشيء:** نەمری کرد.
**وَدود** زۆر خۆشەویست، ناوێکە لەناوەجوانەکانی خوای گەورە.
**وَدوك** قەڵەوو بەزدار.
●**وَدَى ١/الشيء:** ڕژاو لەبەری ڕۆشت.
**وُدِيّ** دۆستانە.
**وَديد** دۆست، دۆستان وخۆشەویستان.
**وَديع** هێمن، ئارام، گۆڕستان، پەیمان وبەڵێن.
**وَديعة** سپاردە.
**وَديق** مێینەی بەکەڵ.
**وديقَة** سەختی گەرما،هەرجێگەیەك گژوگیای لێ بێت.
**وديكة** مریشکی قەڵەو، مامری گۆشتن وبەزدار، ئاردێ تێکەڵ بەچەوری کرياوێ.
**وَذَح** پشقڵ ومیزێ کەبەخوری پەزەوە وشك دەبنەوە.
**وَذِرَة** ژنێ بۆنی ناخۆش بێت، ژنی بۆگەن، ژنێ لچی ئەستورو قەوی بێت.
**وذماء** ژنی نەزۆك.
**وَذِيَة** ئازار، زان، ئێش، نەخۆشی، ناتەواوی وعەیب، ئاوێکی کەم.
**وراب** هەڵگەڕانەوەو لادان.
**وِراثَة** میرات گریی، میرات بردن، ئەوەی مردو لەپاش خۆی بۆ کەس وکارەنزیکەکانی بەجێ دێڵێت.
**وِراط** بیر، چاڵی ئاو، تیاچون، هەرمەسەلەیەك کەمرۆڤ نەتوانێت لێی ڕزگار بێت(وشەکەجەمعە).
**وِراق** کاتی گەڵادەرکردن، کاتێك درەخت گەڵا دەردەکات.
**ورّاق** خاوەن گەڵا، گەڵا فرۆش، پیاوێ ماڵ ودرهەمی زۆربێت.

**وراء** پشت، پشتەوە، دوا، دواوە، کوڕی کوڕ، کوڕەزا.
**وَرَأَ** پڕبو لەخواردن.
**وَرْب** دەمی کونی مشك، درگای کونی دوپشك.
**وَرِب** هەرشتێکی خراپ وبۆگەن کردو.
**وَرِب،وراب** لادان وکەچی.
**وَرِثَ** میراتی برد، میراتی بۆمایەوە.
● **وَرَّثَ ٨/النار:** بزواندی بۆ وەی باش گربگرێت.
**وِرْث** میرات، ئەو شتانەی مردوو لە پاش خۆی بەجێی دێڵێت بۆ کەسە نزیکەکانی، پاش مەرگ.
**وَرْث** تەڕو تازە لەهەرشتێك بێت.
**وَرِخ** هەرشوێنێك گژوگیای چڕی لێ بێت.
**وَرد** گوڵ، گوڵی هەردرەختێك، زەعفەران، هەر ئەسپێکی سوری زەردباو، شێری بێشەو جەنگەڵ، پیاوی ئازاو بوێرودلێر.
**وِرد** تینوێتی، سوپا، پۆلێ مەل وباڵندە.
**وَرَدَ** گوڵی کرد.
**وَرْدَة** سەرەتای شەو، یەك گوڵ.
**وَرديّ** گوڵی، هەرشتێ لەگوڵ بێت یان وەك گوڵ بێت.
**وِرْدیان** پاسەوان.

●**وَرِسَ ٨/الصخر:** قەوزەی لەسەر نیشت وڕەنگی سەوز بوو.
**وَرْس** هەرجلکێکی ڕەنگ سور.
●**وَرَشَ ٨/علیَ القوم:** چوە ناویان خەریکی نان خواردن بون بەڵام بانگیان نەکرد تاکو نانیان لەگەڵ بخوات.
**وَرِش** زۆر جموجوڵ کەر،چالاك.
**وَرِش** ژانێکی ناوسکە، ژانێکە لەناوسکدا دروست دەبێت.
**ورطة** گرفتاریی، بیری ئاو، تیاچون و گرفتاریی، هەر مەسەلەیەك مرۆڤ نەتوانێت لێی ڕزگارو دەربازببێت.
**وَرَعَ** دورکەوتەوە لەگوناه.
**وَرِع** کەسێك پارێزگاربێت و دور کەوتبێتەوە لەگوناه، ترسنۆك، لاواز.
**وَرُعَ** ترسا، لاوازبوو، دورکەوتەوە لەگوناه.
**وَرَع** دورکەوتنەوە لەگوناه و تاوان.
●**وَرَّعَ ٨/الفرس:** ئەسپەکەی بەلێڤاو بەستەوە.
**وَرِعَ** دەستی هەلگرت، دورکەوتەوە لەگوناه.
**وَرَفَ** درێژو فراوان بویەوە.
●**وَرَّفَ ٨/الأرض:** دابەشی کرد.

●وَرَقَ ١/الـشجرُ: گـەڵای کـرد، گـەڵای دەرکرد.
وَرَق گـەڵای درەخـت، مـاڵ و سـامان چ ئاژەڵ بێت یان درهەم.
وَرَق، وِرق، وُرْق درهەمی سکەلێدراو.
وَرِق درەختی گەڵادار.
وَرَقَـة کاغـەز، قاقـەز، پـاپیرۆس، کلۆیـان پارچەخوێن.
وَرِقَة کەم وکوڕی وناتەواوی لەکەواندا.
وَرِمَ ئاوسا، هەڵاوسا.
وَرَم ئاوساویی بەهۆی نەخۆشیەوە.
وَرِهَ گەمژەو نادان بوو.
وَرِهَة ژنێ بەزی گیانی زۆر بێت.
وَرِه هەورێ بارانی زۆر بێت.
●وَرِیَ ١/الشیءَ: شاردیەوە.
وَرِیّ پیـوی قەڵـەو، میـوان، دراوسـێ، ئاوسێ، ماڵاوسێ، گۆشتی قەڵەو.
وَرْقاز، باڵدارێکی سپی زەلامـە گۆشـتی دەخورێ.
وَزّاب دزی زۆر زیرەك ولێزان.
وِزام خێرایی.
وَزّان قەپاندار.
وِزان هاوکێش.
وِزْر گوناھ، تاوزان، باری قورس.
وُزِرَ گوناهبار بوو.
وَزْر پەناگا، شاخی سەخت وبڵند.
وَزْرَة بەروانکە.
وَزَّعَ دابەشی کردبەشی کرد.
وَزْغ لەرزە، پیاوی ترسنۆك.
وَزَفَ پەلەی کرد، خێرای کرد.
وَزَّفَ زۆر پەلەپەلی کرد.
وَزَمَ گازێکی سوکی گرت، قەپێکی بچوکی گرت، لەرۆژێکدا ژەمێ نانی خوارد.
وَزْم برێ ئەندازە.
وَزْمَة برو ئەندازە، یەك ژەم نان خواردن لەرۆژێکدا.
●وَزَنَ ١/الـشیءَ: کێـشای، کێـشی تـاقی کردەوە.
●وَزُنَ ١/الـشیءُ: قـورس بـوو، کێـشی پەیداکرد.
وَزْنَة ژنی ژیر وخاوەنی ڕای بەهێز.
وَزْن کێش، قورسایی.
وَزَّة قازی مێچکە.
وَزَی پیاوی کورتە باڵا.
وَزیر وەزیر، شالیار.
وَزیم گۆشتی پارچە کراوی وشك کراوە.
وَزین گران، سەنگین، قورس.
وساخَة چڵك وچەپەڵیی.
وَسَاد، وِسَـاد نـوێن، پێخـەف و دۆشـەك، سەرین وپشتی.

**وَساطَة** میانگیری، ناوەندگیری کردن لەنێوان دوو لایەنی دژبەیەکدا یا. . . هتد.
**وساع** ئەسپێ هەنگاوی پان بێت.
**وِسام** مەدالیای ئازایەتی ودڵسۆزی کەدەدرێت لەسەرسنگی کەسێك کاری باش راپەڕاندبێت.
**وَسامَة** جوانی وجەماڵ.
●**وَسَبَ ١/المكان:** گژوگیای زۆر بوو.
**وِسْب** گژوگیا.
●**وَسِبَ ١/الثوب:** چڵکن بوو.
**وَسَبْ** چڵك وچەپەڵی.
**وَسَجَ** وشترەکە بەخێرایی ڕۆیی.
**وَسْج** ڕۆشتنی خێراو پەلەی وشتر.
**وَسَخَ** چڵکن بوو، چڵکی لێ نیشت.
**وَسِخ** چڵکن، چەپەڵ.
**وَسَخَ** چڵك وچەپەڵی.
●**وَسَّدَ ١/ه الوسادة:** سەرینی بۆدانا. **٢/اليه الأمر:** پێی سپارد، کارەکەی خستە ئەستۆی ئەو.
**وَسَطَ** ناوەڕاستی گرت، لەناوەڕاستا دانیشت.
●**وَسَّطَ ١/ه:** کردیە میانگیری کەر، خستیە ناوەڕاستەوە.
**وَسُطَ** بەڕێزو شەریف بوو.
**وَسط** ناوەڕاست، ناوەند، نێوەڕاست.
**وُسْطى** پەنجەی ناوەڕاست لەدەستدا کەکورد پێی ئەڵێ زەڕنەقوتە، قامکی قونی، تلیا ناڤی.
●**وَسِعَ ١/** فراوانی کرد. **٢/الله عليهم رزقه:** خودا ڕۆزی خۆیی بۆ فراوان کردن.
**وَسُعَ** فراوان بوو، بەربڵاو بوو.
**وَسْع، وِسْع، وُسْع** توانا، وزە.
**وَسَّعَ** فراوان و گوشادی کرد.
**وُسْعَة** فراوانیی وگوشادیی.
**وَسْق** باری وشتر.
**وَسَلَ** کارێکی کرد بەهۆیەوە لەخوا نزیك کەوتەوە، کۆمەکی داواکرد.
●**وَسَمَ ١/ه:** داغی کرد، نیشانەیەکی بۆ دانا کەبەهۆیەوە بناسرێتەوە.
**وَسْم** داغ، داخ، جێگەو ئاسەواری سوتان، نیشانە.
**وَسِنَ** قورسی خەونیشتە سەری، خەو دایگرت، لەهۆش خۆی چوو بەهۆی بۆنی پیس و بۆگەنی ناوبیرەوە.
**وَسَن** پێداویستی، پێویستی، خەو.
**وَسِن** خەواڵو، کەسێك خەو دایگرتبێت.
**وَسْوَسَة** ئەندێشەی خراپ وراڕایی دڵ.

**وسيط** کەسێك میانگیری نێوان دولایەن وتەرەفی دژ بەیەك بکات بەمەبەستی لێکنزیك کردنەوەیان، دەلاڵ.

**وَسیع** پان وپۆڕ، فراوان وگوشاد.

**وَسیق** باران، واران.

**وَسیلَة** هۆکار، نزیکی، پلەو پایە، هەرشتێك نزیکت بکاتەوە لەیەکێکی تر.

**وشائِج** ڕەگی هەردوگوێ.

**وشائِز** سەرینی پڕلەلۆکە.

●**وِشاح** ١/ شمشێر، کەوان. ٢/**ذوالوشاح**: ناوی شمشێرەکەی عومەری کوڕی خەتتاب.

**وَشاحَة** شمشێر.

**وِشاك** خێرایی.

**وَشاء** زۆری وشتر، زۆری هەبونی وشتر.

**وَشْب** خورمای قەوی.

**وَشَزَ** پەلەو خێرای کرد.

**وَشْز، وَشَز** پەلەکردن، هەرجێگەیەکی بڵند، کولەمەرگی وتەنگانە لەژیان وگوزەراندا.

●**وَشَظَ** ١/ پارچەیەکی لەئێسقانەکە شکاند. ٢/**الفأس**: بەپارچەدار کونی دەمەتەورەکە: واتە ئەو کونەی کەکلکەدارەکەی تێ دەخرێت تەسك کردەوە.

●**وَشَعَ** ١/**الشيء**: تێکەلاوی کرد.

**وُشْع** لانەی جاڵجاڵۆکە، ماڵی جاڵجاڵۆکە.

**وَشَعَ** سەرکەوتە سەرشاخەکە.

**وَشْغ** کەم.

●**وَشَقَ** ١/**ه**: ڕنی، برینداری کرد.

**وَشَق** ئاژەڵێکی دڕندەیە، ئاژەڵێکە لەپێستەکەی فەروەی نایاب دروست دەکرێت.

**وَشَقَ** بڕیی وپەراگەندەی کرد.

**وَشَقَ** پەلەپەل وخێرای کرد.

**وَشَل** ترس وبیم، کەمێك ڕۆندك.

**وَشَلَ** دڵۆپاو ڕژا، لاوازو هەژارکەوت.

**وَشْم** خاڵ ونەخش ونیگارێ کەبەدەرزی ورەشی لەسەر پێست دروستبکرێت، خاڵ.

**وَشَمَ** خاڵی کوتا لەسەر پێستی دەست یان قاچ یان ڕوخسارو. . . هتد، بەدەرزی ورەشیی خاڵ ونەخش ونیگاری لەسەر پێست دروست کرد.

●**وَشَمَ** ١/**الغصن**: گەڵای دەرکرد.

**وَشمَة** دڵۆپی باران، تنۆکی واران.

**وَشَن** زەوی بڵند.

**وُشول** کەمی ماڵ وسامان.

**وَشْی** نەخش ونیگاری قوماش.

**وَشيج** درەختێکە ڕم ونێزەی لێ دروست دەکەن، ڕم.
**وشيع** سەقف وبانی خانوو، حەسیرو نیرگەی بانی خانوو.
**وَشيك** هەرشتێ کاتی ڕودانی نزیك بێت.
**وشيمَة** شەڕو دوژمنایەتی.
**وصّاف** پزیشك، نۆژدار، کەسێك وەسف ناس بێت.
**وَصاة** ئامۆژگاری ووەسیەت.
**وصاية** سەرپەرشتی شەرعی.
**وَصَبَ** سەقامگیرو بەرقەراربوو.
**وَصِبَ** نەخۆش کەفت.
**وَصِب** نەخۆش.
**وَصَب** نەخۆشی و ئازاری هەمیشەیی ولاوازی لەش، هیلاکیی.
●**وَصَدَ** ١/ سەقامگیر بوو. ٢/**الثوب**؛ چنی.
**وَصّدَ** چنی.
**وِصر** پەیمان، بەڵێن.
**وَصَفَ** وەسفی کرد، پزیشکەکە دەرمانی بۆ نەخۆشەکەی دانا.
**وَصْفَة** دەستوری پزیشك، دەرمان وشێوازی بەکارهێنانی کەنۆژدار بڕیاری لەسەر دابێت.
●**وَصّلَ** ١/**الشيء بالشيء**؛ پەیوەستی کردن پێکەوە، بەیەکی گەیاندن، پێکیەوە گرێدان، گەیاندنی.
**وصْل** گەیاندن، کۆتا شەوی مانگ قەمەری.
**وَصَلَة** دانەی زنجیر، یەك ئەڵقەی زنجیر، هاوڕێیەتی، زەوی دور، پەیوەستەگی.
●**وَصَمَ** ١/**الشيء**؛ بەخێرایی بەستی، عەیب داری کرد.
●**وَصّمَ** ١/**الرجل**؛ تەمبەڵ و تەوەزەل کرد، ئازاریدا وخاوی کردەوەو تەمبەڵی کرد.
**وَصْم** ناتەواوی ونەنگی، عەیبە وعار، گرێ لەداردا.
**وَصَم** نەخۆشیی.
**وَصْمَة** پەڵەی عەیبە وعار.
**وُصمة** لاوازی و سستی.
**وُصول** گەیشتن.
**وُصُوليّ** تەماعکارێ کەهەوڵ بدات بەهەرنرخێك بوە بگاتەمەبەستی خۆی.
●**وَصّى** ١/وەسێتی کرد. ٢/**فلانالبکذا**؛ وەسێتی بۆکرد. ٣/**اليه بالصلاة**؛ فەرمانی نوێژ کردنی پێدا.
**وَصِيّ** سەرپەرشتکاری شەرعی.
**وَصيل** هاوڕێی گیانی بەگیانی.

**وَصِيَّة** ئامۆژگاری، وەسێت.

**وَضّ** شلەژاو خەیاڵی تێك چوو.

**وَضَائَة** جوانی وپاکژێتی.

**وَضَّاح** سپی ڕەنگ، جوان ڕوخسار، پیاوی دەم بەخەندە، ڕۆژ.

**وَضَأ** ١/هـ: خاوێنی کردەوە.

**وُضَاء** خاوێن وجوان.

●**وَضَّحَ** ١/**الامر**: مەسەلەکەی ڕۆشن کردەوە.

**وَضَح** ڕۆشنایی، تیشك و ڕواکی دەمەوبەیان، گزوگیای وردی بچوك، شیرو ماست، خشڵێکە لەزیو.

●**وَضَحَ** ١/**الأمر**: ڕۆشن بویەوە، مەسەلەکە ڕوناك بویەوە. ٢/**الأمر**: ڕۆشنی کردەوە.

●**وَضَخَ** ١/**الدلو**: نیوەی دۆڵچەکەی پڕکرد لەئاو.

**وَضَر** پاشماوەی چێشت بەدەفرەوە.

●**وَضَعَ** ١/**الحديث**: هەڵی بەست. ٢/**الكتاب**: پەرتوکی نوسی.

**وَضَعَ، وُضِعَ** زیانی کرد لەبازرگانیدا.

**وَضْع، وِضعَة** چۆنێتی، حاڵەت.

**وضوح** ڕۆشنێتی.

**وَضوء** ئاوێ تانیوەی دۆڵچەبێت.

**وُضُوء** دەست نوێژگرتن.

**وَضُوء** ئەو ئاوەی کەدەست نوێژی پێ دەگیرێت.

**وضيع** ناچیزەو کەم، سپاردە.

**وضيعَة** سپاردە، ئەو خەراجەی پادشاوەری دەگرێت.

**وَطْئَة** کۆمەڵێك خەڵك بەڕێگادا بڕۆن.

●**وَطِىءَ** ١/**الشيء**: پێی پیانا، خستیە ژێرپێیەوە.

**وَطّاس** شوان، شڤان.

**وَطَاء** زەوی نزم.

**وطأة** جێ پێ.

**وَطْب** مەمکەی زل.

**وطبَاء** ژنێ مەمکەی زل بێت.

●**وَطَحَ** ١/هـ: بەدەست بەتوندی پاڵی پێوە نا.

●**وَطَدَ** ١/**الشيء**: سەقامگیرو توندوتۆڵی کرد.

**وَطَر** پێداویستی.

●**وَطَسَ** ١/هـ: بەنوکی پێ بەتوندی لێیدا. ٢/**الشيء**: شکاندی و وردی کرد.

●**وَطَشَ** ١/هـ: لێیدا. ٢/**الكلام**: ڕونی نەکردەوە.

**وَطِفَ** موی برۆکانی زیادی کرد.

●**وَطَمَ** ١/هـ: پێی پێدانا.

●**وَطَنَ ١/بالمكان**، تیایدا مایەوە، کردیە نیشتمانی خۆی.
**وَطَن** نیشتمان، زێد، جێگەی نیشتەجێ بوونی مرۆ.
**وَطَـني** نیـشتمانی هەرشـتێ پەیوەسـت بێت بەنیشتمانەوە، نیشتمان پەروەر.
**وَطنیّـة** نیـشتمان پـەروەرێتی، هەسـتی نیشتمان پەروەریی.
**وَطواط** شەمشەمە کوێرە.
**وطیئة** جۆە خواردنێکە لەشیرو خورما دروست دەکرێت.
**وَطید** چەسپاو، سەقامگیر.
**وَطیس** جەنگ، کوورە، تەنور.
**وَطيء** نەرم.
**وَظائفی** فیزیۆلۆژی.
●**وَظَـــفَ ١/ه**، وەزیفـــەو ئـــەرکی بـــۆ دۆزیەوە.
**وَظیف** باریکایی دەستی ئەسـپ و وشـتر، مەچەکی وشترو ئەسپ.
**وَظیفَة** ئەرك وخۆراکی ڕۆژانـە، پـەیمان، ڕۆژی دیاری کراوی ڕۆژانە.
**وِعاب** جێگەی پان وپۆڕ لەزەویدا.
**وَعّاظ** زۆر ئامۆژگاری کەر.

**وُعاق، وَعیق** دەنگی هەرشتێ، دەنگێکە لەسکی چوارپێوە دەبیسترێت کەدەڕوات بەڕێدا.
**وِعاء، وُعَـــاء** دەفـــر، هەرشـــتێ شـــتی تیاکۆبکرێتەوەو بپارێزرێت.
**وِعَائیَـات** ئـەو ڕوەکانـەی کـەتۆوەکانیان ڕوت نیەو لەناوبەرگ دایە وەك ( بادام).
**وَعب** ڕێگەی پان وفراوان.
**وَعث** ئێسقانی شکاو، پیریی، هەرشـتێکی ناڕەحەت.
**وَعثَ** ڕێگەکە ناڕەحەت ودژوار بوو.
**وَعثاء** ناڕەحەتی وهیلاکیی.
**وَعَدَ** پەیمانیدا، بەڵێنیدا.
**وَعْـد** پـەیمان، بـەڵێن وقـەول، مـژدەدان بەهەرشتێکی چاك یان خراپ.
**وَعر** هەرجێگەیەکی دژوار.
**وَعْر** هەرجێگەیەکی ترسناك.
**وَعَزَ** ئامـاژەیدا.
●**وَعَسَ ١/الشیء**، خستیە ژێرپێوە، پێی پیانا.
**وَعْـس** لمێـك ڕۆشـتن پیایـدا ناڕەحـەت وسەخت بێت.
**وِعَاط** گوڵی زەرد.
**وَعْظَـــة** پەنـــدو ئامۆژگـــاری، گوتـــەو گوفتاری واعیزو ئامۆژگاری کەر.

●وَعُفَ ۱/البصرُ: لاواز بوو.

●وَعِقَ ۱/عليه: پەلەی کرد.

●وَعَّقَ ۱/ه: خراپی کرد، گەندەڵی کرد.

وَعْقَة بەد خویی.

●وَعَكَ ۱/گەرماکە تاوی سەند.

۲/الرجلُ: لەبەر زۆر هیلاکی توشی ئازار بوو.

وَعْك سەختی گەرما.

وَعْكَة ئارام بونی (با) وسەخت بون وتاوسەندنی گەرما.

وَعِل، وُعِل بەرانی کێوی.

وَعْل پەناگا، شەریف وبەتوانا.

وَعْلَة جێگەی قایم وقوڵ وبڵند وسەخت لەچیادا.

وَعْن پەناگا.

وَعِيّ فەقیه، وشاگا.

وَعي هۆش، ئاگا، هەستی دەرەکی، وشیاری، زەرداوی برین، زریچکاوی زام، کیم، جەراعەت، زوخ.

●وعىَ ۱/الشيءَ: کۆی کردەوە.

وَعيد هەڕەشەکردن، ترساندن.

وَغْب وشتری قەڵەو وزل، کەل وپەلی خراپ وبێ نرخ، کەسێك لەشی لاواز بێت.

●وَغُبَ ۱/الجملُ: قەبەو زل بوو.

وَغْبَة گەمژەو نادان.

●وَغَدَ ۱/القومَ: خزمەتی کردن.

وَغُدَ ئەقڵی لاوازو ناچیزە بوو.

وَغْد ڕاو، شکار.

●وَغَرَ ۱/اليومُ: گەرمیەکەی زۆر بوو.

وَغَر کینەو ڕق، دوژمنایەتی.

وَغْرَة، وَغَرَة سەختی گەرما، کینەو تورەیی وقین.

●وَغَفَ ۱/البصرُ: لاواز بوو.

وَغْل لاوازو ناچیزە، کەسێك بەشداری خواردن وخواردنەوەی کۆمەڵێك بکات بێ ئەوەی بانگ بکرێت بۆ بەشداری کردن، مشەخۆر، درەختی چڕی پێکدا ئاڵاو، پەناگا.

وَغِل کەسێك بانگەشەی نەژادێکی درۆینەبکات، بەدخۆراك.

وَغْم گەمژە، نادان.

وَغَى، وَغْى جەنگ، شەڕ.

وِفَاض هەرجێگەیەك ئاو گڵ بداتەوە.

وِفَاع سەربەندی شوشە.

وِفَاق گونجاندن، تەواقق.

وَفَاة مەرگ، مردن.

وَفَاء ئەمەك، وەفا بەرانبەر بەڵێن وپەیمان.

وَفَدَ وەفدی نارد، شاندی نارد.

**وَفْد** شاند، وهفد.

●**وَفَرَ ١/له المال:** بۆی زۆر کرد، سامانی بۆ دابین کرد.

**وَفَّرَ** دابینی کرد.

**وَفْر** ماڵ وسامانی زۆرو فراوان.

**وَفْراء** پڕ، گوێچکەی زل.

**وَفْرة** زۆریی، قژێ بەسەر گوێچکەدا هاتبێتە خوارێ.

**وَفُرَ** زۆر بوو، زیادی کرد.

**وَفْز، وَفَز** پەلەکردن.

**وَفْض، وَفَض** توێشو وکۆڵەپشتی شوان کەنان وپێداویستی تێ دەکات، ئەو چاڵییەی بەرلوتی پیاو کەسمێڵ دەکات بەدوبەشەوە.

●**وَفِقَ ١/الامر:** گونجابوو لەتەك مەبەستدا، ڕاست ودروست و گونجاو بوو.

**وَفْل** هەرشتێکی کەم.

●**وَفَلَ ١/الشيء:** زۆرو دابینی کرد.

●**وَفَى ١/**بەنەمەك بوو. **٢/الشيء:** درێژ بوو.

**وَفِيّ** بەنەمەك، خاوەن قەول، بەوەفا، وەفادار.

**وِقائذ** بەردوچەوی ڕاخراو.

**وِقاحَة** ناشیرینێتی، بێ حەیایی.

**وَقّاد** ڕۆشن وشوعلەوەر.

**وِقاد** هەرشتێ ئاگری پێ دابگیرسێنرێت.

**وَقار** گەورەیی وەزنێتی، ئارامگریی وهەیبەت.

**وَقّاص** تۆڕی باڵندەگرتن، تۆڕی مەل ڕاوکردن.

**وَقّاع،وقّاعَة** کەسێك لەپاشملە باسی خەڵکی بکات، کەسێك غەیبەتی خەڵکی بکات، غەیبەت کەر.

**وَقّاف** کەسێك خۆی دورگرێت یان ڕابکات لەکارزارو جەنگ.

**وِقام** قامچی، شەلاق، شمشێر، تیغ، گۆچان، گاڵۆك، حەبل، گوریس.

**وَقايَة** پاراستن، پارێزگاری.

**وُقاة،وقاهِيَة** خومەتگوزاری کێشا.

**وَقاء،وِقاء** هەرشتێك شتی پێ بپارێزێت.

●**وَقَبَ ١/ت الشمس:** ئاوابوو. **٢/الظلام:** بڵاوبویەوە. **٣/الرجل:** هات.

**وَقْب** کەمژمونادان، ناچیزە، چاڵ لەناوگابەردا ئاوی تێدا کۆبێتەوە، هەرچاڵێك لەناولەشدا وەك چاڵی چاو.

**وَقبة** چاڵی چاو.

**وَقْت** کات، سات، وەخت.

●**وَقَتَ ١/الامر:** کاتی بۆ دانا تاکو تیایدا جێ بەجێ بکرێت.

●**وَقَّتَ** ١/**الأمرَ:** کاتی بۆ دانا.

**وَقِح** پیاوی کەم شەرم.

**وَقَحَ** کەم شەرم وحەیابوو.

**وَقِحَ** شەرمی کەم بویەوەو بوێری نواند بۆ کردنی کردەوەی ناشیرین.

**وُقح،وُقُح** سوعبەت، شۆخی.

●**وَقَدَ** ١/**ت النارُ:** هەڵگیرسا، درەخشایەوە.

**وَقْد** ئاگر، ئایر، ئاهر.

**وَقَد،وَقُود** سوتەمەنی.

**وَقْدة** سەختترین گەرمی.

●**وَقَذَ** ١/**ه:** دای بەزەویدا، زۆر بەتوندی لێیدا تاکو خەریك بوو بمرێت.

**وِقْر** باری قورس، هەورێ لەبەر زۆری ئاو قورس بێت.

**وَقُرَ** بەویقاربوو، رێزداربوو، بەرێزبوو.

**وَقُر** بەویقار، رێزدار، بەرێز.

●**وَقَرَ** ١/**ت الأذنُ:** گوێچکەی گران بوو یان لەبیستن کەوت.

**وَقْر** چاڵ.

**وَقْس** زینا، گانی حەرام یان هەرگوناهێك لەسنور دەرچوبێت.

**وَقْش** عەیب، ناتەواوی، جموجوڵ، دەنگ.

**وَقَش** وردەدار کەئاگری پێ خۆش دەکرێت، توێتەلاش.

**وَقْشة،وَقَشة** دەنگ، بزاڤ وجموجوڵ.

**وَقِصَ** ملی کورت بوو.

**وَقَص** عەیب، ناتەواوی.

●**وَقَّصَ** ١/**علی النارِ:** توێتەلاشی کرد بەسەر ئاگردا.

**وَقَصَ** ملی شکاند.

●**وَقَطَ** ١/**ه:** دای بەئەرزدا.

**وَقْط** چاڵێك ئاوی باران گل بداتەوە.

●**وَقَظَ** ١/**ه:** بەتوندی لێی دا تاکو نزیکی کردەوە لەمردن. ٢/**علی الأمرِ:** بەردەوام بوو لەسەری.

●**وَقَعَ** ١/**الشيءُ:** کەوت، کەوتە خوارێ. ٢/**الحقُ:** سەقامگیر بوو، سەلێنرا.

**وَقَّعَ** ئیمزای کرد، واژۆی کرد.

**وَقَع** چەوی وردو بچکەڵە.

**وَقْع** جێگەی بەرز لەشاخدا.

**وَقَعَ،وَقَّعَ** تیغی تیژ کرد.

**وَقِعَ** پێخاوس بوو، قاچی ئازاری پێ گەیی بەهۆی تیژی بەردەکانی سەرزەویەوە.

**وَقَفَ** وەستا بەپێوە، ڕاوەستا.

**وَقْف** وەقف کردنی پارەو ئەپارتمان و زەوی وئاو. . . هتد بۆ خێر کردن.

**وَقَل** بەرد.

**وَقَلَ** قاچێکی دانا لەسەرزەوی وقاچەکەی تری بەرز کردەوە، لەسەر قاچێك ڕاوەستا.

**وَقور** بەڕێز، ڕێزدار، ئارام، بەویقار.

**وقوع** کەوتن، کەفتن.

**وُقوف** وەستان، ڕاوەستان.

●**وَقَهَ ١/لفلان،** گوێڕایەڵی کرد.

●**وَقی ١/فلانا،** پاراستی، پارێزگاری لێکرد.

**وَقید** سوتەمەنی.

**وَقیذ** قورس، کەسێك زۆر نەخۆش بێت ولەسەرە مەرگدا بێت.

**وَقیر** سەرشۆڕو سوکایەتی پێکراو، مێ گەل.

**وَقیصَة** پشتی ئێسقانەکانی بێخی مل، نێچیر.

**وکاب** زۆر غەمگین.

**وِکاد** گوریسێکە لەکاتی دۆشیندا مانگای پێ دەبەستنەوە.

**وِکاف** کورتانی سەرپشتی ئاژەڵ.

**وَکالَة،وِکالَة** بریکارێتی، وەکالەت.

**وَکَبَ** هەستا، ڕاوەستا.

●**وَکَبَ ١/التمر،** لەکاتی پێگەشتنیدا ڕەنگی ڕەش بوو.

●**وَکِبَ ١/الثوب،** پیس و چلکن بوو.

**وَکَب** ڕەشێتی خورما لەکاتی پێگەشتنیدا.

●**وَکَتَ ١/الکتابة،** خاڵی بۆ دانا، خاڵبەندی کرد.

**وَکْت** هەرشتێکی کەم.

**وَکَتَ** هەنگاوی بچوك ولەیەکتر نزیکی ناڵەکاتی ڕۆشتندا.

●**وَکَتَ ١/القربة،** پڕی کرد.

●**وَکَحَ ١/ه،** توند پێی پێدانا.

●**وَکَدَ ١/بالمکان،** تیایدا مایەوەو سەقامگیر بوو.

**وَکْد** مەرام ومەبەست.

**وُکْد** هەوڵ وتێکۆشان.

**وَکْر** هێلانەی باڵندە،لانەی پەلەوەر.

**وَکْرَة** لانەی باڵندە.

●**وَکَرَ ١/الإناء،** پڕی کرد.

●**وَکَزَ ١/ه،** پاڵی پێوەنا. ٢/**القربة،** پڕی کرد.

**وَکْس** ئەو جێگەیەی مانگی تێدا دەگیرێت، کیم وزرینچکاو لەبریندا.

●**وَکَعَ ١/الشيء،** ڕەق وتوند بوو.

●**وَکَعَ ١/ه،** گەستی.

**وَکْف** عەیب، ناتەواوی، لاوازیی، گەندەڵیی.

●**وَكَـفَ ١/الحمار:** كورتـانى خـسته سەرپشتى كەرەكە.

●**وَكَفَ ١/الرجلُ:** گوناهبار بوو.

●**وَكَـفَ ١/البيت:** سـەربانى ماڵەكـە دڵۆپەى كرد، بانى ماڵەكە دڵۆپ دڵۆپ ئاوى پێدا هاتە خوارێ.

**وَكَـلْ** كەسێكى دەستەوسان كەهەميشە پشت بەخەڵكى تـر ببەسـێت وكارەكـانى بداتە دەست خەڵكانى تر.

**وَكِل** ترسنۆك، دەستەوسان.

●**وَكَّـلَ ١/فلانـاً:** كردیـە بریكـار، كردیـە وەكیل.

●**وَكَمَ ١/الأمرُ فلاناً:** خەمگین و دڵتەنگى كرد.

**وَكْن** هێلانەى باڵندە.

**وَكَنَ** بەتوندى ڕۆشت بەڕێدا.

**وَكَنَة،وُكْنَة** هێلانەى باڵندە.

**وَكِيد** سەقامگیر، توندوتۆڵ.

**وَكِيع** توندوتۆڵ، قایم وقۆڵ.

**وَكِيـل** بریكـار، كەسـێك پـشتى پـێ ببەسـترێت لەڕاپەڕانـدنى كاروبـاردا، ناوێكە لەناوە جوانەكانى خواى گەورە.

**وَلاج** دەرگا.

**وِلادَة** منداڵ بوون، زایین.

**وَلاّس** گورگ.

**وِلايَـة** دەسـتەڵات وسـوڵتان، ویلایـەت، جێگەیـەك والى دەسـتەڵاتدارى بێـت، نزیكى وخزمایەتى، پادشاهى.

**وَلايَة** نزیكى وخزمایەتى.

**وَلاء** دۆستى، دۆستایەتى، خۆشەویستى وهاوڕێیەتى، پشتگیرى.

**وَلْـث** شـوێنەوارى چاویەشـە، بـارانێكى كەم.

**وَلَجَ** چوەناوەوە.

**وَلَج** ڕێگەلەناو زیخدا، ڕێگەى زیخەلان.

**وَلَجَة** ئەشكەوتێك لەبەر باران و شتى تـر ڕێبـواران بـچنە ناویـەوە و خۆیـانى تێدا حەشار بدەن.

●**وَلَّحَ ١/الدابة:** زیاتر لەتواناى ئاژەڵەكە بارى لێ باركرد.

●**وَلَّغَ ١/ه:** چەپازلەى لێدا، زللەى لێدا.

**وَلَغْ** گژوگیاى درێژى پێكدا ئالاو.

**وَلَدَ** منداڵى بوو، زا.

**وُلِدَ** لەدایك بوو، هاتە دنیاوە.

**وَلَد،وُلْد، وَلْد،وِلْد** ڕۆڵە، فرزەند، كوڕ وازەكـە(مـذكرمفرد)ە بـەڵام دەبڕێـت بەسەر (مذكر، مثنى، جمع) یشدا.

**وَلَـذَ** لەڕۆشـتندا خێـراى كـرد، بەپەلـە جموجوڵى كرد.

**وَلَسَ** فێڵى كرد.

**وَلَس** فێڵ، فریو.

●**وَلِعَ ١/بـه،** خۆشی ویست، حەزی لێکردو ئاشقی بوو.

**وَلَعَ** درۆی کرد، قسەی ناڕاستی کرد.

**وَلَّعَ** ئاگری هەڵگیرساند.

**وَلْع** درۆ، پەیڤی ناڕاست ونادروست.

**وَلِعْ** زۆر تامەزرۆ، کەسێك زۆرتامەزرۆی شتێك بێت.

●**وَلَغَ ١/الكلب،** سەگەکە هەرچی لەناو دەفرەکەدا بوو خواردیەوە یان لێسایەوە بەزمانی، سەگەکە دەمی خستە ناو دەفرەوە.

**ولف** هاوڕێ، خاوەن.

**وَلَقَ** پەلەی کردلەڕێ ڕۆشتندا.

**وَلْم**،**وَلَم** زنجیر.

**وَلُوس** وشتری مێینەی تیژڕەو.

**وَلـــوع** زۆر تامـــەزرۆ، کەســـێك زۆر تامەزرۆی شتێك بێت.

**وَلَهَ، وَلِهَ** زۆرخەفەتی خواردو دڵتەنگ بوو تاکو خەریك بوو ئاوەزی لەدەست بدات.

**ولَی** نزیك کەوتەوە.

**وَلِـــيّ** دۆســـت، یـــاوەر، پـــشتیوان، خۆشەویـــست، هـــاوڕێ، دراوســـێ، هاوپـــەیمان، شـــوێنکەوتە، بارانێـــك کەلـــەدوای بـــارانێکی تـــر دەبارێـــت، پلەیەکەلەخودا پەرستیدا.

**وَلِيخ** پارچە قوماشی کەتان.

**وَلِيد** کۆیلە، خزمەتکار، منداڵ.

**وَلِيمَــة** شـــایی، چێـــشتی شـــایی، هـــەر چێشتێك بۆ دەعوەت ساز بکرێت.

**وَمَأَ** ئیـشارەتی کـرد، ئاماژەیـدا، ئامـاژەی کرد.

**وَمَدَة** سەختی گەرمای شەو.

●**وَمَــدَ ١/ت اللیلـة،** گەرماکـەی سـەخت بوو.

**وَمِدَ** تورە بوو، ڕقی هەستا.

**وَمَضَ** درەخشایەوە.

**وَمَغَة** تاڵە مویەکی درێژ.

●**وَمِهَ ١/النهار،** گەرمیەکەی سەخت بوو.

**وَنَّ** لاوازی و سستی.

**ونـــاة** مـرواری، ژنـێ جموجوڵی هێواش بێت.

**وَنِيَّة** مرواری یان ڕشتەی مرواری.

**وَهّـــاب** زۆر بەخـــشندە، ناوێکەلـــەناوە جوانەکانی خوای دلۆڤان.

**وَهّاج** داگیرساو ودرەخشان.

**وَهّاس** شێری بێشە وجەنگەڵ.

●**وَهَبَ ١/** بەخـشی. **٢/المـال،** مـاڵی بـەبێ بەرانبەر بەخشی.

●**وَهَثَ ١/الشيءَ:** توند پێی پیانا.
**وَهَج** تین و گەرمی ئاگر وخۆر لەدورەوە.
**وَهِج** ڕۆژی گەرم.
**وَهَجَ** هەڵگیرسا، تاوی سەند.
**وَهَّدَ** نوێنی ئامادەكرد.
●**وَهَرَ، وَهَّرَ ١/هُ:** خستیە ناوشتێكەوە كەڕێگەی دەرباز بوونی نیە.
**وَهْز** پیاوی كورتە باڵا.
●**وَهَزَ ١/هُ:** پێی پیانا، خستیە ژێر پێوە.
●**وَهَسَ ١/الشيءَ:** شكاندی.
**وَهْسَة** ڕێگەی پامال كریاو، ڕێگەیەك كوترابێتەوە.
**وَهْس** خراپە.
**وَهَصَ** شتی نەرمی شكاندتوندخستیە ژێر پێوە.
●**وَهَطَ ١/هُ:** شكاندی.
**وَهْط** لاوازیی، كۆمەڵ.
●**وَهَفَ ١/الى كذا:** نزیك كەوتەوە.
●**وَهَلَ ١/**لاواز بوو، ترسا. **٢/ في الأمر:** هەڵەی تێداكردو لەبیری چوو.
**وَهَل** ترس، ترسان.
**وَهِمَ** هەڵەی كرد لەحساب وژمارەدا.
**وَهْم** ڕێگەی فراوان، پیاوی زل وزەبەلاح، وەهم، ئەو خەیالاتەی دێتە دڵەوەو بەیەكێك لەهەستە ناوەكیەكانی مرۆڤ دەژمێردرێت.
●**وَهَّمَ ١/هُ:** خستیە ناو وەهمەوە.
**وَهْمِيّ** خەیاڵیی، ئەندێشەیی، وەهمی.
**وَهْمَة** وشتری مێینەی زل.
●**وَهَنَ ١/هُ:** لاوازی كرد، سستی كرد.
**وَهُنَ، وَهِنَ** لاواز بوو، سست بوو.
●**وَهَيَ ١/الثوبُ:** دڕا. **٢/الشيءُ:** لاواز بوو.
**وَهِيج** تاوسەندنی گەرما، بەتین بوون وهەڵایسانی ئاگر، بڵاوبونەوەی بۆن وبەرامی گوڵاو ومیسك.
**وَيس** هەژاری، نەداری، ئەوەی مرۆڤ پێویستی پێیەتی.
**وَيْ** وشەی سەر سوڕمانە دەگوترێت: ( **وي لزيد** ئەی لە زەید!! ).
**وَيْح** وشەی بەزەیی هاتنەوەیە وهەندێ جاریش بۆ ستایش بەكاردێت.
**وَيْك** وشەی سەرسوڕمانە و پێكهاتوە لە **(وي)** و كافی **(خطاب)**.
**وَيْل** تیاچوون، لەناوچوون.
**وَيْلَة** بەڵا و ئابڕوچوون.
**وَيْن** ترێی ڕەش، عەیبە وناتەواوی.
**وَيْنَة** مێوژی ڕەش.

**هائِج** خرۆشاو.

**هائِد** کەسێك گەڕابێتەوە بۆلای خوا، کەسێك پاشگەز بوبێتەوە بۆلای خوا.

**هائِع** شەوی تاریك ونوتەك.

**هائِعة** دەنگی ترسێنەر.

**هائِف** زۆر تینگ،کەسێك زۆری تینووبێت.

**هائِل** ترسناك، ترسێنەر، هەرمەسەلەیەکی گەورەو زەبەلاح، زۆرو زەوەندە.

**هائِم** سەرگەردان، سەرسام، سەرسوڕماو.

**هاب** مار.

**هابِذة** وشتری تیژ ڕەو.

**هابِشة** کۆمەڵ، دەستە، گرۆ، پێڕ.

**هابِط** لاواز، هەرشتێك لەبەرزیەوە بۆ نزمی هاتبێت.

**هابِل** کاسب، فریودەر، هەرشتێك گۆشت و بەزی زۆر بێت.

**هابِي** خۆڵی قەور، گڵی قەبر.

**هات** بدە، پێم بدە، بم دەرێ، بێنە، بمەرێ.

**هاتِر** بەکەسێك دەگوترێت کەبەجنێوی ناشیرین ناوبانگ وناموسی خەڵکی ناشیرین ولەکەدار بکات.

●**هاتف** ١/بەکەسێك دەگوترێت گوێت لەدەنگی بێت بەڵام خۆی دیار نەبێت، تەلەفون. ٢/**المحمول،** مۆبایل.

**هاتِن** هەورێك بارانی بەرەهێڵ وزۆری پێوە بێت.

**هاتُوا** بهێنن، بێنن، خودا دەفەرمێت: **(قل هاتوا برهانکم ان کنتم صادقین-** بڵێ بەڵگەتان بهێنن گەر ڕاستگۆن).

●**هاتَى** ١/**ه،** پێی دا، پێی یا.

●**هاثَ** ١/**الشيء،** جوولا، بزوا، جموجوڵی کرد، بزوت.

●**هاجَ** ١/**النبت،** وشك بوو. ٢/**الشيء،** ئاڵۆزاو خرۆشا وجولا. ٣/**تر الإبل،** تینوی بوو. ٤/**البحر،** پێکداهات وخرۆشا.

**هاجِد** نووستوو، خەوتوو، کەسێك خەوتبێت، کەسێك شەونوێژبکات.

**هاجَرَ** کۆچی کرد، باری کرد، کۆچ و ڕەوی کرد.

**هاجِرة** نیوەڕۆ تاکو عەسر، قرچەی گەرما.

**هاجِرِيّ** شارنشین، نیوەڕۆ.

**هاجِس** هەرچی ئەندێشەو خەیاڵات وترس وبیمێك کەبەمێشك و دڵدا بێت.

●**هاجَسَ** ١/**ه،** نهێنی یەکی پێ گوت، قسەیەکی بەگوێدا چپاند.

**هاجِشَة** کۆمەڵێك خەڵك.

**هـاجِع** ئـارام، بـێ جموجـوڵ، خـەوتگ، نوستوو.

**هاجِعـة** ئافرەتێـك بەشـەو خـەوتبێت، ئافرەتی نوستوو.

**هاجِـــل** خـــەوتوو، نوســـتگ، زۆر سەفەرکەر.

●**هاجَمَ** ۸/هـ یەکێکیان هێرشی بردەسەر ئەوی تریان، هێرشی برد، شاڵاوی برد.

**هـاجِن** کیژۆڵەیـەك بەرلـە بـاڵق بـوونی شـوبکات، دارخورمایـــەك بەکۆرپـــەیی بەربگرێت.

**هاجِنـــة** دارخورمایـــەك بەکۆرپـــەیی بەربگرێت.

**هاجَـة** قربـۆقی مێینـە، بـۆقی مـێ، مێینەی قربۆك.

**هـاجي** هەجووکـەر، دەرخـەری عەیبـەو عاری کەسێك.

**هادّ** دەنگ وئاوازی دەریا، وشەپەو لـورەی دەریا، شڵپ وهوڕی دەریا.

**هادِ** ڕابەر، ڕێنمونی کەر.

**هـادَ** تۆبـەی کـرد، پەشـیمان بویـەوە، هیدایەتی وەرگرت، بویە یـەهودی، بویـە جولەکە.

●**هـــادَ** ۸/هـ جولانـــدی وبزاونـــدی، ڕوخانـدی، قەڵـسی کـرد، تۆرانـدی، چاك وڕێك وپێکی کرد.

**هـادِر** پیاوی بـێ ئـەرزش، شیرو ماسـتی ترشەڵۆك.

**هادِرَة** زەوی پڕلەگژوگیا.

**هادِف** پیاوی نامۆو غـەریب، هەرشتێکی ئامانجـدارو بـۆ مەبەسـت ئاراسـتە کـراو، بەمەبەست وئامانج دار.

**هادِفَة** گرۆ، کۆمەڵ، دەستە، پێڕ.

**هادِل** وشتری لچ شۆڕ.

**هادِم** ڕوخێنەر، مردن، مەرگ.

●**هـــادَنَ** ۸/هـ ســولحی لەگەڵــدا کــرد، هودنەی لەگەڵدا بەست.

**هادّة** ڕەعد، هەورە چەخماخە.

**هـادِي** ڕێنمـا، ڕێ پیـشاندەر، ڕێنمـونی کـەر، ڕابـەر، ناوێکـە لـەناوە جوانـەکانی خوای گەورە، گۆچان، مل، گەردن، شێری بێشەو جەنگەڵ.

**هـــادِي** نازنـــاوی پێـــشەوای دەیـــەمی شیعەکان.

**هادِیَـــة** گۆچـان، گـاڵۆك، مـل، گـەردن، بـــەردێك لـــەناوئاودا قـــوت بوبێتـــەوە، بەردەبازە.

**هاذَبَ** پەلەی کرد، پەلەپەلی کرد.

**هاذِر** ڕۆژی زۆر گەرم، ڕۆژی بەقرچە.

**هاذِل** نیوەشەو، ناوەڕاستی شەو.

**هارِ** سەگێك کەڵبەکانی دەرکەوتبێت.

**هارِب** ڕاکردوو، هەڵاتوو، جۆگەلەی ئاو.

●**هارَ ١/هـ:** بەڕوویدا هێزاندی، هێزاندی بەڕوویدا، دەنگی هەڵبڕی لەڕوویدا، ئەوی تۆمەتبار کرد، گومانی پێبرد.

**هازِئَة** بیابانێ گوزەر کردن پیایدا ناڕەحەت و سەخت بێت، سەرلە بەیانیەکی ساردو سۆڵ.

**هازِجَة** باڵندەیەکە لە بولبول دەچێت.

**هازَلَ** سوعبەتی کرد، گاڵتەی کرد، شۆخیی کرد.

**هازِمَة** بەڵاو سەختی.

**هازِيء** گاڵتەکەر، سوعبەتچی.

●**هاسَ ١/الشيء:** لێیداو شکاندی. **٢/حولَ الشيء:** بەدەوریدا سوڕایەوە. **٣/الطعام:** بەتوندی خواردی.

●**هاشَ ١/القوم:** ئاڵۆزان و شڵەژان وئاشوب وفیتنە کەوتە ناویانەوە. **٢/الشيء:** خراپی کرد، گەندەڵی کرد. **٣/المالَ:** ماڵ وسامانی کۆکردەوەو پەزمەندی کرد.

**هاشِمَة** شکاوی لەئێسکی سەر یان لە هەرئێسقانێکی تردا.

**هاصَّة** چاوی فیل.

**هاصِر** شێری بێشەو جەنگەڵ.

●**هاضَ ١/الطائرُ:** ڕیقنەی کرد. **٢/الحزنُ قلبَهُ:** جار لەدوای جار غەم دوچاری دڵی بوو.

**هاضِب** بارانێ دڵۆپەی گەورەی هەبێ، بارانی تنۆك قەوی.

**هاضِم** هەرشتێك نەرمی تێدابێت.

**هاضِمَة** هێزی هەرس کەری گەدە، یەکێك لە(١٩) هێزەکەی ناو لەشە.

**هاضُوم** هەردەرمانێکە کەیاریدەی هەرس کردن بدات، کەسێك سامان و ماڵی خۆی سەرف بکات، شێری بێشەو جەنگەڵ.

●**هاضَ ١/هـ:** وردوخاشی کرد، پەراش پەراشی کرد، پەژار پەژاری کرد.

**هاطِل** بارانی تنۆك گەورەی بەرەهێڵ، کشتی پێکدا ئاڵراوی پێکدا هەڵچوگ.

●**هاعَ ١/الشيءُ:** ڕاخرا بەسەر زەویدا. **٢/الرصاصُ:** توایەوە. **٣/هيوعاً وهيعاناً:** ترساو سڵەمایەوە. **٤/الرجلُ:** برسیی بوو.

●**هافَ ١/** زۆر تینوی بوو، شکستی خواردو سەرکەوتوە نەبوو. **٢/العبدُ:** هەڵات، ڕایکرد.

**هافِت** لاواز.

**هافي** برسی.

**هافِل** مشکی نێره، نێرینەی مشك.

**هاك** نادان، گەمژە، گێل، گەلحۆ.

●**هالَ ١/الأمرُ فلاناً**: ترساندی وقورس کەوت لەسەری.

**هال** تراویلکە، سەراب، چینی هەرمنزمی کەش لەبیاباندا خۆر لێی دەدات ودەبریکێتەوە مرۆڤ کە لە دوورەوە لێی دەڕوا نێت وادەزانێت ئاوە بەلاّم کەلێی نزیك دەبێتەوە هیچ نیە.

**هالّ** کرێکاری بەکرێ گرت لەم سەری مانگەوە بۆ ئەوسەری مانگ.

**هالِج** کەسێك خەون زۆر ببینێت وخەونەکانی نەهێنێتە دی.

**هالِس** هەرکەسێك جەستەی لاوازبێت.

**هالِك** مردوو، بێ ئومێد، نائومێد، هیوا بڕاو.

**هالكيّ** ئاسنگەر.

**هالَـة** تەوقی نورینی دەوری مانگ، خەرمانە.

**هامّ** گرنگ، هەرشتێك سەرنج ڕاکێش و جێگەی گرنگی پێدان بێت، پڕبایەخ، بایەخدار.

●**هامَ ١/**تینوی بوو. **٢/على وجهه**: ڕۆشت و نەی دەزانی ڕوو لەکوێ دەنێت، خۆبەسەر ڕۆشت.

**هامِجْ** واز لێهێنراو، هەرشتێك وازی لێهێنرابێت و شپرز بوبێت وەك پەزی بێ شڤان و سەروازی بێ فەرماندە.

**هامِد** گیاو ڕوەکی وشك، هەرجێگەیەکی بێ گیا، مردوو، بێجموجوڵ، خامۆش.

**هامِدَة** وشك وبێ سەوزە، پەژموردە.

**هامِر** خۆڵ وزیخێکی زۆر.

**هامِز، هَمّاز** غەیبەت کەر، قسە هەڵبەست.

●**هامَسَ ١/ه**: نهێنی پێ گوت، قسەی بەگوێدا چپاند.

**هامِش** پەراوێزی پەڕاو، دامێنی پەرتوك.

**هامِشي** پەراوێزی، هەرشتێك لەپەراوێزدا بێت و زۆر گرنگ نەبێت.

**هامِع** فرمێسکی تکاو.

**هامَّـة** گیانەوەری خشۆك وژەهرداری وەك مار.

**هامَة** سەری هەرشتێك، سەرۆك، ڕیش سپی وسەرداری هۆز.

●**هانَ ١/الأمرُ على فلانٍ**: مەسەلەکە لەسەر فلاّن کەس نەرم وئاسان بوو.

●**هانَفَ ١/ت المرأة:** پێکەنی وەك پێکەنینی گاڵتەکەرێ.
**هانم** بانو، خاتوون، خان، خاتوو.
**هَانَة** بەزێکە لەناوچاودا، پیوی وشتر.
**هانِيء** نۆکەر،خزمەتکار، خزمەتگوزار.
**هاوِ** عاشق، شتێك کەوتبێت یان کەوتبێتە خوارەوە.
●**هاوَدَ ١/هـ** گوێ ڕایەڵی کرد، سازش وناشتی لەگەڵدا کرد.
**هاوِي** کوللە، کولە، کلۆ، کوللۆ.
**هاوِيَة** دۆزەخ، جەهەنم، جەحانم.
**هايِشَة** ئەو ماسیەی یونس پێغەمبەری قوتدا.
**هاءَ** خۆشحاڵ وشادومان بوو، بەرزو بڵندبو، ڕوخسارو شێوەی جوان بوو.
●**هاءِ ١/یارَجُل:** بێنە، بیهێنە، بەواتای (هات) دێت.
**هَبْ** حسێب بکە، بژمێرە: (**هب لي من لدنك رحمة**).
●**هَبَّ ١/ت الريح:** باهەڵی کرد. ٢/**الرجل:** لەخەو هەستاو وئاگا هاتەوە.
**هَبَاب** بایەك زۆر هەڵبکات وتەپ وتۆز بوروژێنێت.
**هَباب** تۆزو غوبار.

**هَبّار** جۆرە مەیمونێکی توکنە، مەیمونێکە توکی زۆرە.
**هُبّاران** هەردومانگی کانونی یەکەم وکانونی دووەم، سەرماوەرز و بەفرانبار.
**هُبّارِيَة** بایەك تەپوتۆزو غوباری هەبێت، پەڕێك هەڵوەری بێت، پەڕی هەڵوەریوی باڵندە.
**هَبّاش** کەسێك زۆر کەسب بکات وکۆبکاتەوە، کەسێك زۆر سامان پەزمەندە بکات.
**هُبَاشَة** بەکۆمەڵێك خەڵك دەگوترێت کەلەیەك هۆز نەبن.
**هَبّال** نێچیرڤانێك بەفێڵ وتەڵەکە نێچیرەکەی ڕاوبکات.
**هُبالَة** دەست کەوت، دەسکەوت، غەنیمەت.
**هَبَاء** تۆز، تەپوتۆز، خەڵکانی کەم ئەقڵ وفام.
●**هَبَتَ ١/هـ** لێیدا، لەنرخ وڕێزی هێنایە خوارێ.
●**هَبَجَ ١/هـ** یەك لەدوای یەك بەگۆچان لێیدا.
**هَبَج** وەرەمی گوانی وشتر.
**هَبِجَ** دەم وچاوی ئاوسا، ڕوخساری هەڵئاوسا.

**هَبْد، هَبيد** گوژالك، كالّەكە مارانە.
**هَبَدَ** پەلەی كرد لەرێ ڕۆشتندا یان لەفڕیندا، بەپەلە ڕۆشت، بەپەلەفڕی.
●**هَبَرَ ١/اللحمَ:** كردیە پارچەی گەورە، پارچەپارچەی كرد بەپارچەی گەورە.
**هَبر** وشتری گۆشتن وقەڵەو.
**هِبْرِيَة** كرێشی سەر، پەڕی هەڵوەریوو.
**هَبَزَ** مرد، لەناكاودا مرد.
●**هَبَشَ ١/الشيءَ:** كۆی كردەوە. **٢/فلاناً:** لێدانێكی بەئازاری لێدا. **٣/لعیالە:** كەسابەتی كرد.
●**هَبَّشَ ١/المالَ:** كۆی كردەوە، پەزمەندەی كرد.
●**هَبَصَ ١/**چالاك وبزێو بوو، شادومان بوو. **٢/علی الشيء:** پێداگربوو لەسەری.
**هَبِص** شادومان، پێداگر لەسەر هەرشتێك.
**هَبصَة** ماڵ وسامانی زۆر.
**هَبَصی** ڕۆشتنێكی بەپەلە.
**هَبط** كەمی وناتەواوی، كەوتنە ناوشەڕو خراپەوە، سەرشۆڕی وزەلیلی.
**هَبَطَ** لەبەرزیەوە دابەزی بۆ نزمایی، دابەزی، هاتەخوارێ.
**هَبَعَ** وشترەكە لەكاتی ڕۆشتندا ملی بەرز كردەوە.
**هُبَع** كەر، گوێ درێژ.
●**هَبَغَ ١/ الرجلُ:** خەوت، نوست.
**هَبْغَة** خوتن، نوستن.
**هُبَكَة** نادان، گەمژە وگێل، گەلحۆ و كاڵ فام.
**هِبِلّ** پیاوی زل، پیاوی بەرز و بلندقامەت، كەڵەگەت.
**هُبَل** بتێك بوو لەكەعبەدا دانرابوو.
**هَبِل** گورگ، شینو.
**هَبَّلَ** كەسابەتی كرد بۆ ماڵ و منداڵی.
**هَبَلَة** بوخارو هەڵم.
**هِبِلّی** كەش وفش ولوت بەرزی لەڕۆشتن ورێ كرندا.
**هَبوب** بایەك تەپ وتۆز بوروژێنێت، بای تەپوتۆزامێز.
**هَبُور** جاڵجاڵۆكە.
**هُبُوط** كەوتنە خوارەوە، هاتنە خوارەوە، دابەزین بۆ نزمی.
**هَبَّة** ماوەیەك لەڕۆژگار.
**هِبَّة** حاڵ، بارودۆخ، جۆر، پارچەیەك لەقوماش وپۆشاك، پۆشاكی كۆن، بریسكەی شمشێر لەكاتی ڕاوەشاندنیدا.
**هِبَة** دیاری، هەدیە.
**هُبَيْرَة** قەمتار، كەمتیار.

**هَبيط** لاواز،چەق ولەڕ، بێ گۆشت، کەم گۆشت.

●**هَتّ ١/الكلام:** بەرێك وپێكی گێڕایەوە. ٢/**الماء:** ڕژاندی. ٣/**الثوب:** دڕاندی.

**هَتّات** سوك، پیاوێك زۆر قسەبكات، فرەبڵێ.

**هُتاف** نەعرەتە، نەعرە، دروشم گوتن بەدەنگی بەرز، هوتاف.

**هَتامِل** قسەی نهێنی وژێربەژێر (وشەكەجەمعە).

**هُتامَة** شكاو، شكیاگ، ئەو پارچەیەی لەشتێك دەبێتەوە.

●**هَتَأَ ١/ه:** لێیدا بەگۆچان پیایداكێشا. ٢/**الطعام:** خواردی.

**هَتا** درز، كەلێن.

●**هَتَرَ ١/** دڕاندی. ٢/**الكِبَرُ فلاناً:** بەساڵاچون وپیرێتی ئەقڵی فلان كەسی برد، پیرێتی فامی فلان كەسی نەهێشت.

**هِتْر** درۆ، هەڵە لەقسەدا، قسەی ناڕاست، سەختی وبەلا، كاری سەرسوڕهێنەر، نیوەی یەكەمی شەو.

**هُتْر** لەدەستدانی فام و ئاوەز بەهۆی پیری یان نەخۆشین وخەفەتبارییەوە.

**هَتْرَة** نەحمەقی، نادانی، گەمژەیتی.

**هَتْرَك** شێری بێشەو جەنگەڵ، زەمان و ڕۆژگارێكی زۆر سەخت وناڕەحەت.

●**هَتَفَ ١/** هاواری كردو دروشمی گوت. ٢/**بِ الحَمامَةُ:** كۆترەكە گماندی.

**هَتف** دەنگی بەرز، نەعرەتە لێدان ودروشم گوتن.

●**هَتَكَ ١/الثوب:** لەباری درێژی دڕاندی. ٢/**ه:** ڕیسواو بەدناوی كرد.

**هُتك** نیوەی شەو.

**هَتك** پۆشاكی دڕیاگ.

**هُتكَة** پەردەدڕین، ڕیسوایی، كاژێرێك لەشەو.

●**هَتَلَ ١/ت السماءُ:** بارانی تاو لەدوای تاو دایكرد.

**هَتلان** بارانی لاواز ونمەی بەردەوام.

**هَتَمَ** ددانی لەبێخەوە شكا.

●**هَتمَلَ ١/الرجلُ:** قسەیەكی نهێنی وشاردراوەی كرد.

**هَتْن** بارانی پەیاپەی، بارانێك تاو لەدوای تاو دابكات.

**هَتون** هەورێك بارانی تاو لەدوای تاوی پێ بێت.

●**هَتّ ١/ه:** سەرزەنشتی كرد، سەركۆنەو لۆمەی كرد.

**هَتء، هتء** كات، وەخت، هەنگام.

**هَتِيكَة** ئابڕوچون، ڕیسوایی، بەدناویی.
**هَتَّ** درۆی کرد.
**هَتَّات** درۆزن.
● **هَـتَمَ ١/هـ** لێیـدا تـاکو وردوخـاش و هەپرون هەپرونی کرد.
● **هَتَّهَتَ ١/الوالي** ستەمی کرد. **٢/الشيء** توند پێی پیانا. **٣/الشيء** تێکەڵ وپێکەڵ بوو.
● **هَجَّ ١/البيت** ڕماندی، ڕوخانـدی. **٢/ت النار** هەڵگیرساو کڵپەی لێوەهات.
● **هَجا ١/هـ** ناتـەواوی وعەیبـەکانی یـەك یەك ژماردو جنێوی پێدا، هەجوی کرد.
**هَجَاج** ڕۆشتنی بەپەلە.
**هَجاجَة** گەمژەو نادانێـك کـە ڕێ نەباتـە سەرمەسەلەکان وەك ئەوەی کوێر بوبێت لەعاست مەسەلەکاندا.
**هَجّاس** لاف وگەزاف لێدەر، شێری بێشە وجەنگەڵ.
**هَجّام** ئـازاو دلێـر، کەسـێك زۆر هێـرش وشـالاو بکاتـە سـەردوژمن، بەپـەلامار، شێری بێشە وجەنگەڵ.
**هِجـان** پاڵفتـە وپوختـەی هەرشـتێك، کاکڵـەی هەرشـتێك، وشـتری مـوو سـپی هەڵبژاردە.
**هَجَاة** بۆق، قربۆق، قرپۆك.

**هَجّـاء** کەسـێك زۆر جنێـو بـدات، دەم پیس.
**هِجـاء** لێـك بڕینـی واژەکـان و دەسـت نیشان کردنی پیت وحەرەکاتەکانی.
**هَجأ** برسیی بوو.
**هُجَأة** ژن وپیاوی گەمژەو نادان.
● **هَجَـأَ ١/الطـعام** خـواردنی. **٢/بطنـه** پڕی کرد، سکی خۆی پڕکرد.
● **هَجَّـدَ ١/الرجـل** بێـدار بویـەوە، شەونوێژی کرد.
**هَجْر** جودایی، وازهێنان، پشت تێکـردن، قرچەی گەرما، نیوەڕۆ.
**هُجْر** قسەی قۆڕ، قسەی بێ هودە.
● **هَجَّـرَ ١/النهار** گـەرمی یەکـەی تـاوی سەند.
**هِجران** جودایی، دابڕان.
**هِجرة** کۆچ، بار، ڕەو.
**هَجْرَة** ژنی قەڵەو و گۆشتن.
**هَجْـــس** ئەندێـــشە، خـــەیاڵاتی دڵ، هـەردەنگێك گوێـت لێ بێـت و لێـی تـێ نەگەیین.
● **هَجَشَ ١/**خرۆشا. **٢/بين القوم** ئاشوب وفیتنەی نایەوە.
**هَجَعَ** خەوت، نوست، بەشەودا خەوت.
● **هَجَّعَ ١/القوم** نوستن،خەوتن.

**هِجع، هُجَع، هَجِـــع** نـــادان، گەمـــژە، مەدهۆش، بێ ئاگا.

**هَجْعَـــة** ســوكەخەوی ســەرەتای شــەو، سەرخەو شكاندن لەسەرەتای شەودا.

**هُجَعَة** نادان، گەمژەو بێ ئاگا.

**هَجَفَ** برسیی بوو.

**هِجَـفّ** درێـژی قەبـە، هەركەسـێكی زل ودرێژ.

**هِجفَة** تەڕو نمناك.

● **هَجَـمَ** ١/هێرشـی بـرد، شـالاوی بـرد، پـەلاماری دا. ٢/**البیـت**: ڕوخـا، ڕمیـا. ٣/**البیـت**: ڕوخانـدی، ڕمانـدی. ٤/**فلانـاً**: دەری كرد.

**هَجمَـــــة** هێـــرش بـــردن، ســـەختی سەرماوگەرما، گەلە وشترێك لەنێوان چل یان حەفتا تاسەد سەربێن.

**هَجمَـة، هُجُوم** هێـرش، شـالاو، پـەلامار، هەڵمەت.

**هُجنَـــة** زیـــان وزەرەر، قـــسەی قـــۆڕو نابەجێ.

**هِجنَة** هەرشتێكی سەیرو نامۆ.

**هُجُـــوع** خـــەوتن، نوســـتن، ئـــارامی ونۆقرەگرتن.

**هُجُوم** هێرش، پەلامار.

**هَجوم** بای سەخت كەتەپ وتـۆز دێنێتـە سەرئەو شوێنەی هەڵدەكاتە سەری.

**هَجیع** بەشێك لەشەو.

**هَجـــیِن** نارەســـەن، بەدنـــەژاد، كەســـێك لەباوكێكی عـەرەبی ودایكێكـی كەنیزەك بوبێت.

**هِدّ** پیاوی لاوازو سست.

**هَـدّ** پیـاوی جوانمـەرد، دەنگـی قەڵـەو و ڕەق، دەنگی وشتر.

**هُدّاب** پـەلكی دارخورمـا، تاڵـە دەزولـەی دامێنی پۆشاك.

**هَدّاج** كەسێك وەكو پیر بڕوات بەڕێدا.

**هَدَاد** خەڵكی ترسنۆك.

**هَـــدّاف** تیرەنـــدازی لێـــزان وزیـــرەك كەنیشانە بپێكێت، یـاری كـەرێكی گـۆڵێن كەزۆر گۆڵ بكات.

**هَدّال** پەلی شۆڕۆبوگی درەخت.

**هَدَالَة** كۆمەڵ، دەستە، پێڕ، تۆق (لەگەڵ تۆقێك خەڵكدا چوم).

**هُدَام** سەرگێژ خواردن بەهۆی سواربونی كەشتیەوە لەدەریادا.

**هُدانَة** ئاشتەوایی دوای جەنگ.

**هَدَأَة** جۆرە ڕۆشتنێكە.

**هُداة** قوت وبژێوی.

**هِدایَة** ڕێنمونی، هیدایەت، ڕێنمایی.

**هَدَأَ** هێور بویەوە، هێمن بویەوە، ئارامی گرت.

●**هَدَبَ ١/الشيءَ:** بڕی. **٢/الناقة:** دۆشی. **٣/الثمرة:** چنی، ڕنی.

**هَدِب** شێری بێشە وجەنگەڵ، درەختی بێ گەڵا، کانی وچاوگی بێ ئاو.

**هُدْب، هُدُب** برژانگ، مووی پێڵووی چاوەکان.

●**هَدَّدَ ١/** هەڕەشەی کرد،چاوی سور کردەوە. **٢/ه:** هەڕەشەی لێکرد، ترساندی، چاوی لێ سورکردەوە.

**هِدر** پیاوی قنگ قورسی بێ خێر.

**هَدَر** پوچ، بێ هودە، بێ سود، هەدەر.

●**هَدَرَ ١/الشيء:** زۆر درێژ بوو.

●**هَدَسَ ١/هيه:** بیری لێکردەوە، سەرنجی لێدا.

**هِدف** کەسێك لەشی گەورە وقەڵەو بێت.

**هَدَف** پیاوی گەورە، هەر بەرزو بڵندێك چ ئاپارتمان بێت یان گردۆڵکە یاخود شاخ، ئامانج و مەبەست.

**هَدَفَ** لاوازو تەمبەڵ بوو.

●**هَدَكَ ١/البناءَ:** ڕوخاندنی، ڕماندی.

●**هَدَلَ ١/الشيءَ:** شۆڕی کردەوە بۆ خوارەوە.

**هُدِم** خوێنی بەفیڕۆ ڕژیاگ.

**هِدْم** پیاوی پیر، پیاوی بەساڵاچوو.

**هَدْمَة** بارانی سوك، نمەباران.

**هِدمَة** ڕوپۆش، عەبا.

**هُدْنَــة** ئاشـتەوایی، ڕاوەسـتاندنی شەڕتاماوەیەك بەمەبەستی دانانی مەرج وڕێ وشوێنی ئاشت بونەوە.

**هَدْنَة** بارانی کەم، نمەبارانی کەم.

**هَدُوج** قازانێك خێرا بێتە کوڵ.

**هُدُون** ئارامی، ئاشتەوایی.

**هُدُوء** ئارامی، هێمنی.

**هُدهُد** پەپوسلێمانە، پەپوسلێمانکە، شانەبەسەر، پەپوسلێمانی، پەپوسێمانە، باڵندەیەکە.

●**هَدَى ١/ه:** ڕێنمونی کرد، ڕێی نیشاندا.

**هُدَى** ڕێی ڕاست، ڕۆژ، ڕێنمایی، ڕاستی، پێچەوانەی سەرلێ شێواوی وگومڕایی.

**هَدِيّ** دیل، بەند، بوك، وەوی.

**هِدَى** ڕەوش وخوو.

**هَدِير** گمەی کۆترو دەنگی وشتر.

**هَدِيَّة** دیاریی، هەدیە، بوك، وەوی.

**هَدْء** سێ یەکی سەرەتایی شەو.

**هَذّ** زۆر بڕندە.

**هَذا** ئەو، ئەوە، ئامرازی ئیشارەت دانە بەنێرینەیەکی نزیك.

**هَذّاد** زۆر بڕندە.

**هُذارِم** كەسێك بەپەلە بێت لەڕۆشتندا.
**هُذام** ئازا، دلێرو چاو نەترس، شمشێری بڕندە، شمشێری بوڕان.
**هَذاة** بێلْ وقولنگی ئاسن.
**هُذّاء** شمشێری بڕندە، تیغی بوڕان.
● **هَذَأ ١/هُ**: بەخێرایی بڕیی.
● **هَذَبَ ١/** بڕی وپاك وخاوێن وڕێك وپێکی کردەوە. ٢/**الشيءَ**: ڕژا، داچۆڕیا.
**هَذَبَ** پەلەی کرد.
**هَذَب** پاکی وپاکژی، پالْفتەیی، پاکیزەیی.
**هَذِب** ئەسپی تیژڕەو.
● **هَذَرَ ١/الرجلُ**: قسەی هیچ و پوچ وناپێویستی کرد.
**هَذَر** قسەی بێ هودە، قسەی پوچ، قسەیەك پێویست نەبێت، ناچیزە.
**هَذرَمَة** پەلەکردن وخێرایی لەڕۆشتندا.
● **هَذّ ١/هُ**: بڕیی، بەخێرایی بڕیی.
**هَذَیان** بێ هودە قسەکردن.
**هِرّ** دەنگێ بۆ لێخوڕینی وشتر یان بانگ کردنی بۆ ئاوخواردنەوە، پشیلە، گوربە، کتك، پشیك، پشتی، جانەوەرێکە لەتیرەی پڵنگ بەلاّم بچوك، دڕندەشیی هەیەو کەویشیی هەیە.
**هُرّ** ئاو یان شیرێکی زۆرشیری بێشە وجەنگەڵ.
**هَرّات** شێری بێشەو جەنگەڵ.
**هُراثِم** شێری بێشە وجەنگەڵ.
**هُرار** دەدرێکە وەك وەرەم لەنێوان پێستی وشترو گۆشتەکەیدا.
**هَرّار** سەگێ زۆر مرە مرکات، سەگێك کەلْبەکانی دیارنەبێت.
**هُراس** شێری زۆر خۆر.
**هَرّاس** شێری زۆر خۆرکەسێك چێشتی (هریسە) دروست بکات وبیفرۆشێت.
**هِراش** دوژمنایەتی وشەڕ، جەنگ وناکۆکی.
**هُراع** ڕێ ڕۆشتن لەشلەژان وپەلەکردندا.
**هَراقَة** ڕشتنی ئاو وخوێن.
● **هَراقَ ١/الماءَ**: ڕشتی، ڕۆی کرد.
**هَراكِلَة** سەگی ئاوی.
**هَرامِسَة** زانایانی ئەستێرە ناسی وشەکە یۆنانییەو بەعەرەبی کراوە.
**هُراهِر** شێری بێشە وجەنگەڵ، ئاو یان شیرێکی زۆر.
**هُراء** قسەی پڕهەڵەو پەلەو بێ هودە، قسەی قۆڕ.
**هِراء** نەمامی هەلّەمکراوی درەختی خورما، خەلْفە درەختی خورما.

●**هَـرَأَ ١/البرد فلانـاً:** سەرما توندوتیـژ بوو لەسەری خەریك بوو رەقی بکاتـەوە وبیکوژێت یان کوشتی.
**هُرَاء** پیاویٚ زۆر بەبێ هودە بدوێت.
●**هَـرَبَ ١/** رایکرد،هـەڵات. **٢/في مـشیه:** پەلەپەلی کرد، خێرای کرد.
**هَـرّبَ** کـەل وپـەلی قاچاغی لـەم وڵاتـەوە گواستـەوە بـۆ وڵاتێکـی تـر، قاچاغـچێتی کرد.
**هَرِبَ** پیر بوو، بەساڵدا چوو.
**هَرِتَ** فراوان بوو، پان بوو.
**هَرّتَ** فراوانی کرد، پانی کردەوە.
**هَرِت** شێری بێشە وجەنگەڵ.
●**هَرَتَ ١/**بەنێزە لێیداو بریـنداری کـرد. **٢/الثوب:** دڕاندی.
**هَرْثَم** شێری بێشە وجەنگەڵ.
**هرثَمَة** ڕەشایی نێوان هەردوو کونەلوتی سەگ، شێری بێشە وجەنگەڵ.
**هَرَج** ئاژاوە، ئاشوب وفیتنە.
**هِــرَج** نــادان وگەمــژە، ســست ولاواز لەهەرشتێك.
●**هَـرَجَ ١/** دەرگاکـەی بـەکراوەیی بـەجێ هێــشت. **٢/النــاس:** کەوتنــە ئاشــوب وفیتنەوە.
**هِرْجَة** کەوانی نەرم.

●**هَرَدَ ١/ه:** دڕیی وشندڕو وندڕی کرد.
**هَرد** ئاشوب وفیتنە، ئاژاوە.
**هِرد** وشترمر، پیاوی بێ ئەرزش.
**هُرْد** زەعفەران، گڵەسورە.
●**هَرَزَ ١/ه:** بەتەختە لێیدا، بەتەختەدار لێیدا.
**هَرِزَ** مرد، کۆچی دوایی کرد، لەناو چوو.
**هِرْس** پشیلە، گوربە.
**هَـرِس** پـشیلە، شێری زۆرخـۆر، پۆشـاکی کۆنە.
●**هَــرَسَ ١/** وردو خاشــی کــرد، پــەژار پــەژاری کــرد. **٢/الطعــام:** بەتونــدی خواردی.
●**هَــرَشَ ١/الــدهر:** ڕۆژگــار ســەخت وناڕەحمت بوو.
**هَـرِشَ** ئاکـاری بـەدو ناشـیرین بـوو، خـو وڕەوشتی تێك چوو.
**هَرّشَ** سەگەکانی بەشەڕدا، ئاژاوەی لەناو خەڵکدا دروستکرد.
**هِرش** نادان وگەمژە، بەدخوو.
**هَرِضَ** توشی گەڕی بوو.
**هَرَض** کرم، جانەوەرێکی خزۆکی بـچوکە لەناو میوەو وگڵ و گۆشتی گەنی پەیـدا دەبێت، نەخۆشینی گەڕی.
**هَرَضَ** جلکەکەی دڕاند.

**هَـرَطَ** نـاموس وشـەرەفی ئـەوی لەکـەدار کرد.

**هَرِطَ** گۆشتی لەشی داچۆڕاو شل وپـەت بوو بەهۆی نەخۆشین یان ترسێکەوە.

**هِرْط** گۆشتێکی شل وپـەت کـەوەك چڵم وایەو هیچ سودی لێ وەرناگیرێت، تەڕافە.

**هِرطَة** نادان و گەمژەو ترسنۆك.

**هَرَعَ** بەپەلە وخێرایی ڕۆشت.

**هَـرِع** پیـاوی گرینـۆك، پیاوێـك بەپەلـە بڕوات.

**هَرِعَة** ژنی گرینۆك.

**هَـرَفَ** بـەبێ شـارەزایی مـەدحی کـرد، لەبـەری ئـەوەی سـەری لێ سـوڕما بـوو زۆری مەدح کرد.

●**هَرَقَ** ١/الماءَ: ڕژاندی.

**هِرَق** پۆشاك وجلکی کۆنـە.

**هَرَل** کوڕی ژن لەمێردی یەکەمی.

**هَـرِمَ** پیربـوو، بەسـاڵدا چـوو، چـویە تەمەنەوە.

**هَـرَم** پـیری ولاوازیـەکانی، قوچـکەی سێ گۆشە، هەرەم.

**هَـرِم** کەسـێکی زۆر پـیر، زۆر بەتەمـەن، نـەفس ودەرون، ئاوەزو ژیری.

**هِرْمَل** ژن و وشتری بەساڵا چووگ.

**هَرْمِـــي** داری وشـــك، داری وشـــکی بۆسوتاندن لەبار.

**هَرْوَلَ** بەپەلە پەل وجرتە جـرت ڕۆشـت بەرێدا.

**هَروم** ژنی بەد ڕەوشت.

●**هَرْهَرَ** ١/ بەبێ هودە پێکەنی، لـەخۆوە پێکەنی. ٢/الشيءَ: جولاندی، بزواندی.

**هَرهَر** خورەوی ئاو، دەنگی ڕۆشتنی ئاو.

**هِرهِر** پەزی پیر، مەڕی بەساڵاچوگ.

**هِرّة** پشیلەی مێچکە.

●**هَـرَّى** ١/الثـوبَ: زەردی کـرد، ڕەنگـی زەردی تێوەدا، ڕەنگەکەیی زەرد کرد.

**هُـرْي** عـەماری گـەنم، ئـەنباری گـەنم، عەمباری گەنم.

**هَرِيــت** فــراوان، پــان، پیاوێـك نهێنــی نـەپارێزێت و قـسەی قـۆڕ بکـات، شـێری بێشە وجەنگەڵ.

**هَرِيد** هەرشتێك لەبـەر خراپـی دڕابێـت ولاوەنـرابێت، پوارتکاو.

**هَـرِيس** هـاڕدراو، هاڕیـاو، شـتێك زۆر بەتوندی ورد کرابێت.

**هَرِيــسَة** چێـشتێکە لەگۆشـت وگـەنمی هاڕاباو سازدەکرێت.

**هَرير** مرەی سەگ.

**هُرَيَة** کۆنە، وردە.

**هَزَّ** ڕای وەشاند، بزواندی.
**هَزائِر** ناڕەحەتی وتەنگانە.
**هُزابِر** شێری بێشە وجەنگەڵ.
**هِزار** گاڵتە، سوعبەت وشۆخی.
**هَزار** هەزار دەستان، باڵندەیەکی پچکەلانکەیە لەفەوارەی بولبولدایە.
**هَزّاز** جوڵێنەر، بزوێنەر، ڕاوەشێنەر، بزواو.
**هَزّاع** شێرێك زۆر نێچیر تێك وپێك بشكێنێت.
**هُزال** لاوازی وكەم گۆشتی، لەڕی و لاتی، پێچەوانەی قەڵەوێتی.
**هَزّال** كەسێك زۆر گاڵتەو گەپ كەربێت، سۆعبەتچی.
**هُزالَة** گاڵتەو گەپ.
**هَزاهِزنەو** ئاشوب وئاژاوانەی كەخەڵكی ڕادەتەكێنن وڕایان دەچڵەكێنن ودەیان هەژێنن.
**هُزاهِز** ئاوێكی زۆری لەبەر ڕۆیشتگ.
●**هَزَأَ** ١/هـ: شكاندی. ٢/ إبله: لەسەرماندا ڕەقی كردەوە. ٣/زیدا: مرد. ٤/منه: گاڵتەی پێكرد.
**هِزَبْر** زۆر قەبەو قەڵەو، زۆر ڕەق.
**هِزَبْر** شێری بێشە وجەنگەڵ.
●**هَزَبَرَ** ١/ هُ: بڕی، لەتی كرد.
●**هَزبَلَ** ١/الرجلُ: زۆر هەژار كەوت.
**هَزِج** گۆرانی بێژ، ستران بێژ.
**هَزَج** دەنگی هەورەگرمە، جۆرە سرودێكە.
●**هَزَرَ** ١/هُ: بەگۆچان زۆری لێدا. ٢/فلانا: دەری كردو دوری خستەوە. ٣/الرجلُ: پێكەنی.
**هِزر** توندوتیژ.
**هَزرَة** تەمبەڵی تەواو، تەوەزەلی تەواوەتی.
●**هَزَعَ** ١/ پەلەی كرد. ٢/الشيءَ: شكاندی.
●**هَزَّعَ** ١/هُ: شكاندی.
**هَزَع** شڵەژان، جوڵاندن.
**هُزَع** شێرێكە زۆر نێچیر بشكێنێت.
**هَزِقَ** شادومان بوو، خۆشحاڵ بوو.
**هَزَق** شادومانی، چالاكی وچاپوكی، توندی گرمەی هەورەگرمە.
**هَزِقَة** ژنێكە قنگی لەشوێنێكدا توێتكە نەخوات، ژنێكە جێ بەخۆی نەگرێت، ژنی گەڕاڵ.
●**هَزَلَ** ١/ لاوازو لات ولەڕ لەڕ بوو. ٢/في كلامه: سوعبەتی كرد، گاڵتەی كرد.
●**هَزَّلَ** ١/هُ: لاوازو لەڕی كرد.
**هَزْل** سوعبەت، گاڵتە، قسەی ناجددی.
**هَزَلِيّ** سوعبەتچی، هەزەل، نوكتەباز.

● هَـزَمَ ١/العدو: دوژمنـانی شـکاندو شکستی پیّ هیّنان.

هَـزْم هـەوری تـەنکی بـیّ بـاران، زەوی نشیّو.

هَـزَم زرەی کـەوان، دەنگـی کـەمانی تیرهاویّژانی مەیدان.

هَزِم ئەسپی گوێڕایەڵ، ئەسپی ڕامکـراو، ئەسپی دەستەمۆکراو.

هِـزَّة شـادومانی، خۆشـحاڵی، دەنگـی هەورەچـەخماخە، گیـزەی قابلەمـەی کوڵاو.

هَـزَّة تـەکان، لـەرزین، ڕاتەکانـدن، بومەلـەرزە، زەوی لـەرزە، موبەلـەرزە، ئـەرد هـەژێن، ڕاتـەکین ولـەرزینی زەوی بەهۆی دیاردە جیۆلوژیەکانەوە.

هَزِيءَ مرد، کۆچی دوایی کرد.

هَزِيز گفە گفی بـا، گیفـە گیف و وشپە وشپی با، گرمەی هەورە چەخماخە.

هَزِيع بەشـێك لەشـەو، سیّ یـەك یـان چـوارێەکی شـەو، پیـاوی گەمـژەو گێـل ونادان.

هَزِيل لەڕ، لات، لاواز، کەم گۆشت.

هَزِيم سوپاو لەشکری تێکشکاو، دەنگە دەنگـی هەورەچـەخماخە، هـەورە چەخماخە.

هَزِيمَة شکـست وتێـك شـکان لەشـەڕو شۆڕدا.

● هَـسَّ ١/شـتێك لەدڵیـدا دروست بـوو.
٢/الكـلام: شـاردیەوە، گومـشاری کـرد.
٣/الشيء: پێیدا کێشاو شکاندی.

هَشّ نەرم و سست بوو.

هَش هەرشتێکی نەرم ونۆڵ، نـانی نـەرم، پیاوی ڕۆح سوکی شادومان.

● هَـشَرَ ١/الناقـة: چـی لەهـەموو گوانەکانیـدا بوودۆشـی، شیری هـەموو گوانەکانی دۆشی.

هَشَرَة درەختێك گەڵاکانی زوو بومرێت.

هَشَم زەوی وشکی بیّ گیا.

هَشَم جوان مەرد، پیاوی سەخی ودەست گوشاد.

● هَشَمَ ١/الشيء: وردوخاشی کرد.

هَشَمَة بزنەکێوی، بزنە کێفی.

هَصّ ڕەق و توندوتۆڵ لەهەرشتێك.

● هَـصَّ ١/الـشيء: پێـی پێـدانا، خـستیە ژێرپێوە.

هَصَبَ ڕای کرد، هەڕای کرد، هەڵات.

● هَـصَرَ ١/الـشيء: ڕای کێـشا ولاری کردەوە.

هَصر، هَصُور، هُصَر، هَـصُوَر، هُـصَرَة، هَـصْوَرَة، هَيْـصَر، هَـصّار، هَيْـصار،

**هَيصُور** شێری بێشەو جەنگەڵ، ئەو وشانە سەرجەمیان ناون بۆ شێر بۆیە واناو نراوە چونکە نێچیرەکەی تێك وپێك دەشکێنێت.

● **هَصَمَ ١/ه:** شکاندی.

**هُصَم، هَصَام** شێری بێشە وجەنگەڵ.

● **هَضَّ ١/الشيء:** شکاندی. ٢/ت الأبل: پەلە پەلی کرد، خێرای کرد.

**هَضَّاض** نێرەیەك ملی نێرەی تربشکێنێت.

**هَضَّام** هەرس کەر، هەردەرمانێك پاریدەی هەرس کردنی خۆراك بدات لەگەدەدا.

**هَضَّاء** کۆمەڵێك خەڵك یان تۆقێك ئەسپ.

**هَضبَة** گردۆلکە، تەپۆلکە، شاخی درێژ، بەرزایی لەزەویدا، بارانی دنکۆڵە گەورە.

**هَضْل** زۆر، زەوەند، فرە.

**هَضلاء** ژنێ مەمکەکانی درێژبن، ژنی مەمك جەوەنە.

● **هَضَمَ ١/ت المعدة الطعام:** گەدە خۆراکەکەی هەرس کرد. ٢/الشيء: شکاندی. ٣/فلاناً: ستەمی لێکرد. ٤/ على القوم: هێرشی کردە سەریان.

**هَضم:** هەرس، کردەوەی گۆڕینی خۆراك لەگەدەدا بۆ شێوەیەك کە بتوانرێت بەئاسانی لە ڕیخۆڵەکاندا بمژرێت.

● **هَطَرَ ١/الكلب:** لەسەگەکەی دا.

**هَطَع** چاوی بڕیە شتێك و چاوی لێ بەرز نەکردەوە.

**هَطف** بارانی لێزمە، وارانی ڕەهێڵ.

**هَطْل** نمە بارانی سستی بەردەوام.

**هِطْل** گورگ، شێنو، دز، پیاوی گەمژەو نادان.

**هُطَی** لێدانی توندوتیژ.

**هَطیع** ڕێگەی فراوان و پان و پۆڕ.

● **هَفَّ ١/الرَّجل:** لەڕێکردندا پەلەی کرد. ٢/ ت الريح: با هەڵی کرد و دەنگی گفەگفی بیسترا.

**هِفَّ** کشتوکاڵێك لەکاتی درەوێنەدا درەو نەکرێت و شپرزە بێت، ماسی بچکۆلە، هەوری تەنکی بێ باران.

**هَفَا** پەلەپەل و خێرای کرد، برسی بوو، سەرشۆڕ بوو.

**هَفَّاف** باڵی سوك و سۆڵی باڵندە بۆ فڕین.

**هَفَات** نادان و گەمژە، گەلحۆ.

● **هَفَتَ ١/الرَّجل:** بەبێ بیرکردنەوە قسەی زۆری کرد.

**هَفْت** زەوی نشێو، کەوتنە خوارەوەی شت پارچە لەدوای پارچە وەك کەوتنە خوارەوەی بەفر کلۆ لەدوای کلۆ، بارانی فرە، پەیڤی زۆری بێ بیرکردنەوە.

**هَفْوَة** سەرشۆڕیی.

**هَقّ** ڕای کرد، هەڵات، فیراری کرد.

**هُقاع** بێ ئاگاییەك دوچاری مرۆڤ ببێت بەهۆی خەفەت یان نەخۆشینەوە.

**هَقِع** ئارەزوومەند، پێداگر لەسەر هەرشتێ.

**هَقِل** برسیی، پێچەوانەی تێر.

**هِقْل** وشترمری لاو، وشتر مرێك نەپیر بێت و نەبار بێت، جوانەی وشتر مر.

**هَقِمَ** زۆری برسی بوو.

**هِقَمّ** دەریا، پیاوی زۆر خۆر.

● **هَكَّ** ١/تسی کەند. ٢/**الثماء** ڕیقنەی کرد. ٣/**الشيءَ** ورد وخاشی کرد.

**هَكّ** بارانی زۆر و توند، پیاوێ ئەقڵی ناتەواوبێت، زۆر گان کردن.

**هُكاع** خەوتن لەپاش هیلاکی، نوستن لەدوای شەکەت بوون، کۆکە، قۆزە.

**هَكَبَ** گاڵتەی پێکرد، پێی ڕابوارد.

**هكذا** ئاوا، ئابەوشێوە، ئاواهی، وەها، وەکو ئەوە، ئاوەها.

● **هَكَعَ** ١/تر **الهاجرة** چێڵەکە لەبەر گەرما چووە بن سێبەری دارەکە. ٢/ **هكوعاً** ئارامی گرت.

**هُكَعَة** نادان، گەمژە، گەلحۆ.

● **هَكَّمَ** ١/**فلاناً** گۆرانی بۆ گوت، سترانی بۆ بێژا.

**هَكِم** کەسێك خۆی هەڵبقورتێنێت لە شتێك کە پەیوەندی پێیەوە نەبێت.

**هُكُوع** کۆمەڵێك مانگا لەژێر درەختدا سێبەریان گرتبێت.

**هَكُوع** لاواز، بێ توانا.

**هَكَوْك** قەڵەو، گۆشتن، پڕگۆشت، جێگەی نەرم، جێگەی ڕەقەڵان.

**هَلْ** ئایا، ئامرازی پرسیارکردنە.

**هَلاّب** بای ساردی بەباران، چەند ڕۆژێکی زۆر سارده لەمانگی بەفرانباردا، ساڵی تەڕ و پڕباران.

**هَلاّبَة** بای سارد لەگەڵ باراندا.

**هُلاس** نەخۆشی سیل، نەخۆشیەکە دوچاری سیەکان دەبێت.

**هُلاع** ترس، ترسنۆکی.

**هَلاك** تیاچوون، فەوتان، سەرنگوم بوون، مردنی بەدبەختانە.

**هَلال** سەرەتای باران.

**هِـــلال** مـــانگی ئاسمـــان بەکەوانـــەیی، مانگەشـــەو لەیەکـــەم و دووەم شـــەوی هەڵهاتنیدا.

●**هَلَّ ١/الرَّجلُ:** شادومان بـوو، دڵخۆش بووـهـاواری کـرد. **٢/المطـرُ:** بـەخوڕ دایکرد. **٣/الشهرُ:** مـانگی کەوانـەیی تێـدا دەرکەوت.

**هَلّ** مووی تەنك، پۆشاك، جلك.

**هَلَبَ** جنێویدا، جوێنیدا.

**هُلـب** مـوو بەگـشتی، موویـەك لەسـەر پێڵوی چاوەکان دەرهاتبێت، مـووی کلکی گیانلەبەران.

**هُلبَـــة** کۆتـــایی مـــانگ، لەســـەروی بەرمتووکەوە تاکو دەگاتە ناوك.

**هَلبـــاء** ژنـــێ مـــووی زۆر بێـــت، بـــەڵاو نارەحەتی سەخت.

**هَلِبَ** مووی زۆر بوو.

●**هَلَـتَ ١/الشيءَ:** تـوێی کـردەوە، تـوێکی کردەوە.

**هُلثَة** کۆمـەڵێك دەنگـەدەنگیان لـێ بـەرز بوبێتەوە.

**هَلَجَ** هەواڵی ناواقیعی گەیاند.

**هَلج** هەواڵی ناواقیعی.

**هَلَج** درەختێکی دڕکدارە.

●**هَلَسَ ١/ه المرضُ:** نەخۆشـین لاواز و سستی کرد.

●**هَلَسَ ١/الرَّجلُ:** لەڕو لاواز بوو.

**هَلس** نەخۆشینی سیل، خێروبێـری زۆر، فەڕی فرە.

**هَلَع** ترس، بـێ قـەراری، دڵەڕاوکێ وجـێ بەخۆ نەگرتن لە ترسدا.

**هَلِـــع** دڵتـەنگ، خەفـەتبار، خـەمگین، غەمگین، بێ تاقەت.

**هَلَقَ** پەلەی کرد، خێرای کرد.

**هلقام** شێری بێشەوجەنگەڵ.

**هَلَـكَ** لەسـەر بەدبـەختی مـرد، تیاچـوو، لەناوچوو.

**هَلَك** هەرگیانلەبـەرێك مـردار بوبێتـەوە، نێوانی دووشت، نێوانی لوتکە ودامێنـی کەژ.

**هَلَكة** وشکەساڵ، ساڵی وشکی بـێ بـاران و بێ ئاو.

**هُلُم** مامزی کێفی، کەژاڵی چیا.

**هَلوَسَ** بێ هودە بیری کردەوە.

**هَلُـــوع** کەسـێك لەخراپـە نەترسـێت، کەسـێك لەسـەر بـەڵا ونارەحـەتی ئـارام نەگرێت.

**هِلّـــوف** ڕیـــش زل، پیـــاوێ ڕدێنـــی گەورەبێت، حوشتری پیری توکن، ڕۆژێـك

تەم و غوبارەکەی خۆر دابپۆشێت، بەراز، درۆزن، زۆر درۆزن، پیاوی پیری زۆر بەسالاْچووگ.

**هَمّ** خەم، خەفەت، غەم، دڵتەنگی.

**هَمّاز** غەیبەت کەر، تانەلێدەری بەدگۆ.

**هَمّاس** شێری بێشە وجەنگەڵ، شێرێك نێچیرەکەی زۆر تێك بشکێنێت.

**هَمّاط** ستەمکار، زاڵم.

**هُمّال** زەوی وێرانە، زەویەك کەس ئاوەدانی نەکاتەوە، نەرم لەهەر شتێك.

**هَمّام** قسە دروستکەر، کەسێك قسە بهێنێت و ببات، قسە هەڵبەس.

**هُمّام** بەفر یاخود پیوی تواوە، گەورەیەکی ئازا وسەخی، شێری بێشە وجەنگەڵ.

●**هَمَجَ ١/** برسی بوو. **٢/تـ الإبلُ من الماء:** یەکجار بینی نا بەئاوەکەوە تاکو گەروی تێراو بوو.

**هَمَج** برسێتی.

**هَمَجَة** پەزی لاتەڵە، مەڕی لەڕ، جۆرێ پێشکەیە، مێشی بچکەڵە کەلەچاوی کوێدرێژ گرد دەبنەوە.

●**هَمَدَ ١/تـ النارُ:** کڵپەکەی دامردەوە، کوژایەوە، خامۆش بوو. **٢/القومُ:** مردن.

**هَمْدَة** خامۆشیی، ئارامی، بێدەنگی.

●**هَمَرَ ١/الماءَ:** رژاندی، ڕشتی. **٢/الماءُ:** رژا، رژیا. **٣/البناءَ:** روخاندی.

**هَمِر** پیاوی قەڵەوی زلە، پیاگی کەتە وزەبەلاح.

●**هَمَزَ ١/هُ:** لێیدا، گەستی، گازی لێگرت، لەپاشملە باسی کرد، غەیبەتی کرد.

**هَمْز** شێتی، شێتێتی.

**هَمَزَات** ئەو خەیالاتەی شەیتان دەیخاتە دڵی مرۆوە، وەسوەسەی شەیتان (وشەکەجەمعە).

**هَمْزَة** پیتی یەکەم لەپیتەکانی (مبانی).

●**هَمَسَ ١/الصوتَ:** شاردیەوە. **٢/العنبَ:** گوشی، گوشاردی. **٣/الشيءَ:** شکاندی.

**هَمسَ** چپەی کرد، سرتەی کرد.

**هَمْس** چپە، سرتە، دەنگی کپ ونزم، چرپەی پێ.

**همساً** لەژێرلێوەوە قسەکردن، بەچپە قسەکردن.

●**هَمَشَ ١/الشيءَ:** کۆی کردەوە، گردی کردەوە. **٢/فلاناً:** پشت گوێی خست، گەستی، گازی لێگرت.

**هَمَش** پەلەکردن لەخواردندا، هەڵپە هەڵپ لەخواردندا.

**هَمِش** کەسێك بەپەلە کار بەپەنجەکانی بکات.

●**هَمَطَ** ١/ گوێی نەدا بەوەی دەیڵێت یان دەیخوات. ٢/**الشيءَ**: بەبێ مەزنەنە بردی، بەگۆترە بردی. ٢/**المالَ**: داگیری کرد، بەتۆبزی بردی.

●**هَمَعَ** ١/**ت العينُ**: فرمێسکی ڕێزا، ڕۆنکی ڕشت. ٢/**رأسَهُ**: شکاندی.

**هَمَغ** سەری شکاند.

**هَمِلّ** بەتەمەن، بەساڵاچووگ.

**هَمَلّ** ماڵی بچکۆلە.

**هَمَل** ئاوێك لەبەری بڕوات وبەربەستی نەبێت، وشترێك بەردرابێت وشەو و ڕۆژ بلەوەڕێت بەبێ شوان.

**هِمْل** پۆشاك، خێمەی کۆنەی پەشمین.

**هَمُوس** شەو ڕەومەند، ڕەومەندی شەو، گەڕۆکی شەو، شێری بێشە وجەنگەڵ، شێرێك زۆر نێچیرەکەی تێك بشکێنێت.

**هموع** ڕەوان، جاری، لەبەر ڕۆیشتوو.

**هَمُوم** بیرێك ئاوی زۆر بێت.

**هِمّ** پیر، بەساڵاچوگ.

**هِمَّة** هیمەت، ویست.

**هَمَّة، هِمَّة** هیمەت، ویست وخواست، غیرەت.

**هَمِير، هميرة** ژنی پیری بەساڵاچوو.

**هَمِيس** چرپەی سمی وشتر.

**هَمِيغ** مردن، مردنی بەپەلە.

**هَنّ** گریا.

**هَنّ** فەرجی ژن، قوز، زێ، خەمشە.

**هُنّ** ئەوان، بۆ ئاماژەدانە بەکۆمەڵێك مێینەی نادیار.

**هُنا** ئێرە، ئەیرە، ئەگرە، ئەگرا.

**هنادك** پیاوانی هند، هندۆسەکان.

**هِناف** زەردەخەنەی گاڵتە ئامێز.

**هُناك** ئەوێ، ئەویا، ئەوێندەر.

**هِناء** قەتران.

●**هَنَأَ** ١/**هُ**: خواردنی پێدا. ٢/**فلاناً**: پێی بەخشی. ٣/**الرجلُ**: پشتی گرت وسەری خست.

●**هَنَّأَ** ١/**هُ**: پیرۆزبایی لێکرد.

**هِنْأ** بەشێك لەشەو، بەخشش ودیاری، قەتران.

**هَنَأ** خۆشحاڵی، دڵ خۆشی وشادومانی.

**هِنبر** جاشۆلکە، بێچوی کەر، بێچوی گوێدرێژ، قەمتار، کەمتیار، بێچوی کەمتیار.

**هِنْبِز** قەمتار، گا، ئەسپ.

●**هَنْبَغَ** ١/**الرجلُ**: برسی بوو.

**هُنْبُغ** خۆڵێك بەبچوکترین شت بەبادا بچێت، شێری بێشە وجەنگەڵ، ژنی داوێن پیس، قەحبە.

**هِنـدْ** نـاوی ولآت وگەلێکـە لەرۆژهـەڵاتی کیــشوەری ئاسـیا، هنـد، گەلەوشــترێك ژمارەیان لەصەد سەر بەرەو ژورتربێت، ناوێکی ژنانەی عەرەبیە.

**هَنْدَسَ** ئەنـدازیاریی کـرد، ئـیش وکـاری ئەندازەیی کرد.

**هَنْدَسَــةْ** ئەنــدازە، زانــستی ئەنــدازە، ئەندازە ناسی.

●**هَنَــعَ ۸/الفلان،** مـل کـەچ بـوو بـۆی، سەرشۆڕ بوو بۆی.

●**هَنَـفَ ۸/الرجل،** پەلـەی کـرد، خێـرای کرد.

**هُنُــوف** پێکـەنین زیـاتر لەزەردەخەنــە بێــــت، پێکــــەنینێ زیــــاتر بێــــت لەزەردەخەنەی سادە.

**هَنَم** خورما، جۆرێکە لەخورما.

**هَنِيئاًلك** نۆشی گیانت بێت.

**هَنِيء** هەرشتێك بەسانایی وبێ دەردی سەر دەست مرۆڤ بکەوێت.

**هُوَ** ئەو، هێماو ڕاناو بۆکەسی نێرینـەی نادیاری تاك.

**هَوَ** لاپاڵ، تەنیشت.

**هَـوَائيّ** هـەوایی، هەرشـتێکی پەیوەسـت بەهەواوە، ئارێل، ئاڵیار.

**هَــوادة** نــەرمی ومیهرەبــانی، بــەزەیی، خۆشەویـستی، هەرشـتێك هیـوای ئـەوەی لێبکرێـت ببێتـە هـۆی چاکـسازی لـەناو خەڵکدا.

**هَـوّاس، هَوّاسَـة** شـێر چونکە بەشـەودا دەگـەڕێت وبـوێرە لەداواکردنـدا، ئـازاو چاونەترسی کارامە.

**هواصِــر، هواصِــير** شـێرانی بێـشە وجەنگەڵ (وشەکەجەمعە).

**هُـوَاع** ڕشـانەوە، خـواردن هەڵهێنانــەوە لەدەمەوە.

**هَوّاك** سەرسام، سەرسوڕماو.

**هُـوام** تینـوێتی سـەخت وزۆر نارەحـەت، شێت بوون لەتاو عەشق ودڵداری.

**هَـوّام** شـێری بێـشە وجەنگـەڵ، پادشـای دارستان وئاژەڵان.

**هِوايَة** ئارەزوو، هیوایەت، حەز.

**هَــوَاء** کــەش، هــەوا، ئــەو هەوایــەی لەرێگــەی لوتــەوە هــەڵی دەمــژین، ترسنۆك.

**هَـوْب** دووریـی، نـادان وگەمـژە، ڕونـاکی ئاگر، بڵێسەی ئاپر.

**هَوْبَر** مەیمونی توکن، پڵنگ.

**هَوْتَـة** ڕێگـەی لێـژ بـەرەو ئـاو، هەڵەتـە ڕێی بەرەو سەرچاوەی ئاو، زەوی نشێو.

**هَوْجاء** مێینەی وشتری تیژڕەو.

**هَوْجَـل** شـەوی درێـژ، شـەوگاری درێـژ، قەحبە، ژنی داوێن پیس.

●**هَوَّدَ ١/فلاناً:** کردیە جولەکە. **٢/الشرابُ فلاناً:** سەرخۆشی کرد، مەستی کرد.

**هُـوْد** جـوو، جولەکـە، پـەیڕەوانی ئـاینی موسـا پێغەمبـەر (علیـه السلام)، نـاوی پێغەمبەری هۆزی(عاد)ە، هود پێغەمبەر علیه السلام.

**هَـــــوْدَج** کــــەژاوە، ســــــندوقی زل کەلەسەرپـــــشتی بارەبــــەر دادەنــــراو بنیادەمی تیاسوار دەبوو.

**هَوْدَة** چەماوەی پـشتی وشـتر، گردۆلکـەی سەر پشتی حوشتر.

**هَوْدَك** قەڵەو، گۆشتن.

**هَوْدَع** وشترمر، نەعامە.

●**هَوَّرَ ١/هُ:** دای بەزەویدا، دای بەنـەرزدا، خستیە ناو گێژاوی تیاچوونەوە.

**هَـوْر** دەریاچـەیەکە کـەم کـەم ئـاوی بـۆ دەچێت، مێگەل، ڕانێك پەز.

**هَوْرَة** مەترسی، جێگەی تیاچوون.

**هَوْزَ** مرد.

**هُـــــوْز** وەدی هێنــــراو، دروســــتکراو (دەگوترێـت: **مـا فِي الهَـوز مثلـك**= لـەناو وەدی هێنراواندا نمونەی تۆی تیادانیە).



**هَوْزَب** داڵ، باڵندەیەکی گۆشت خۆرە.

**هَوْزَن** تەپ وتۆزو غوبار.

●**هَوَّس ١/هُ:** پیایدا کێشا.

●**هَـوِسَ ١/القـومُ:** کەوتـە ناوسەرسـامی وگەندەڵی وپشێویەوە.

**هَوَس** لاوازی ئاوەز، کـەم فـامی، جۆرێکە لەشێتی.

●**هَـــوَّش ١/الـــشيءَ:** تێکـــەڵاوی کـــرد، ئاوێتەی کرد، تێکەڵ وپێکەڵی کرد.

**هَـوْش** ژمارەیـەکی زۆر، برسـێتی، خـاڵی بونی ورگ.

**هَوْشَة** ئاژاوەو ئاشوب، کۆمـەڵێکی تێکـەڵ وپێکەڵ.

**هَوِشَ** زگی لەبەر لاوازی بچوك بویەوە.

●**هَـوَّعَ ١/الرجلَ:** پیاوەکـەی ڕشـاندەوە، ئەوەی خواردبوی پێی هەڵهێنایەوە.

**هَـوْع** ڕشـانەوە، خـراپترین وتونـدترین شێوەی پێداگری وسوربوون.

**هُوْع، هَوْع** دوژمنایەتی، ڕقابەری.

**هَوْف** بای گەرم.

**هُـوْف** پیـاوێ هـیچ خێـری تیانـەبێت، پیاوی گەمژەو نادان.

**هَوِكَ** نادان وگەمژە بوو.

**هَوْك، هَوِك، هِوَكّ** گەمژەیەك کـەمێك ئاوەزی لەسەردا مابێت.

